ایلخانزاده، سواره، ۱۳۱۶ ـ ۱۳۵۴.
تاپو و بوومه لیل / سواره ئیلخانی زاده ــ تهران: نشر پانیذ، ۱۳۷۹.
[۹]، ۲۹۲ ص.
ISBN 964-90549-0-1
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
۱. شعر کردی -- ایران -- نقد و تفسیر. الف. عنوان.
۹الف۲۲۵ک/PIR۳۲۵۶ ۸فا۹/۲۱
۱۳۷۹
کتابخانه ملی ایران ۷۸ـ۲۵۹۲۹م

✓ تاپو و بوومەلێڵ
✓ سوارە ئێلخانی‌زادە
✓ پەخشان
✓ چاپی یەکەم سالّی ۱۳۷۹
✓ ئەژمار : ۳۰۰۰
✓ پیتچن: عەتا بەرفی
✓ پێداچوونەوە: سەلاحەددینی عەرەبی
✓ ڕووبەرگ : گیرا گرافیک
✓ لیتۆگرافی: ئابرەنگ
✓ چاپ: سالّحان
✓ سەحافی: جەعفەری
✓ بلاوکردنەوە : پانیز
دووڕینگاری ناوەندی بلاوکردنەوە: ۹۲۷۹۰۲٤٤٠

# ژیانی نووسەر

سوارە ی ئیلخانی‌زادە کوڕی ئەحمەد ئاغای ئیلخانی‌زادە لە هۆز و هێلی دێبۆکرییە لە ساڵی ١٣١٦ـ ی هەتاوی لە ئاوایی «تورجان» لەدایك بوو، هێشتا شیرەخۆرە بوو کە بابی «تورجانی بە قەرەگوێز» سەودا پێ‌کرد. سوارە خوێندنی سەرەتایی لە لای مامۆستای تایبەت لە ـ قەرەگوێزـ تەواو کرد، بۆ خوێندنی ناوەندی هاتە بۆکان. لە جەنگەی خوێندنیدا تووشی نەخۆشی قاچ‌ئێشە هات و سێ ساڵی ڕەبەق لە سەر گازەرای پشتی دە جێیەدا کەوت و هەموو لەشی بە دەستووری حەکیم لە گێچەوە پێچرا؛ دوای هەستانەوە لەو نەخۆشییە سەخت و بڕست‌بڕە لەژنۆی لاقێکی نەدەنوشتاوە و گۆچانی بە دەستەوە گرت؛ بەو حاڵە خوێندنی ناوەندی لە بۆکان دەس پێ‌کردەوە و لە تەورێز تەواوی کرد و لە زانکۆی تاران لیسانسی حقووقی قەزایی وەرگرت.

سوارە لە تاران لەگەڵ گۆڤاری «سُخَن» و چەند گۆڤارێکی ئەدەبی دەسی کرد بە هاوکاری و نووسین و شێعر کوتن. چەند ساڵ دواتر لە بەشی کوردی ڕادیۆ تاران بە ئەندام وەرگیرا و پەرەی بە نووسین و کاری ئەدەبی دا. بەرنامەکانی لە ڕادیۆ بڵاو دەبوونەوە بەڵام شێعرەکانی کە بۆتێکی تریان لێ دەهات ئاشکرا نەدەکران.

سوارە ئاڵ و گۆڕێکی گەورەی بە سەر شێعردا هێنا و پایە و بناغەی شێوازێکی تایبەت و نوێی لە کوردستانی ئێران دارشت کە لە شێعرەکانیا هیچ چەشنە لاساکردنەوەیەك بەرچاو نەدەهات بە قەولی مامۆستا «شێرکۆ بێکەس» «بە ئاوازێکی هەسری‌ترەوە لە شاعیرانی پێش خۆی چریکاندی». کۆمەڵە شێعرەکانی بە ناوی «خەوە بەردینە» بە هیممەتی کاك «ئەحمەدی قازی» و خوالێخۆشبوو کاك «عارفی ئاغایی» لە لایەن «ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی ـ ئینتشاراتی سەلاحەددینی ئەیووبی» لە ورمێ تا ئێستا دوو جار چاپەکەی تازە کراوەتەوە. سوارە بە دیوانێکی شێعری چکۆلەوە هاتە مەیدانی کەڵەپیاوانی ئەدەب و زانستی کورد. بە شارەزاییەکی زیاتر بە سەر زمانی فارسیا. هاتە ڕیزی ئەم زانا گەورانەی گەلی کورد کە ناوی فەرزانەیان لێ‌نان و لەساڵی ١٣٧٥ لە شاری سنە کۆنگرەیان بۆ گیرا. بە داخەوە مەرگ مۆڵەتی نەدا کە شوێن و کۆتاخی ئەدەبی کوردی بەرزتر لە ئێستا بکا و بگەیەنێتە لووتکەی بەرامبەر بە هەموو پلەکانی ئەدەبی دنیا و لە ساڵی ١٣٥٤ هـ ـ لە شاری تاران کاتێك لە «جامی جەم» دەهاتە دەرەوە بەرەو ماڵ بێتەوە یەکێك لە هاوکارانی بە شوخی یا بە... ماشێنی لێ‌دا و دوای چەند ڕۆژ لە نەخۆشخانە کەوتن کۆچی دوایی کرد

سوارە نووسەرێکی بەدەسەڵات بە زمانی کوردی و فارسی بوو، بە هەر دوو زمانەکە نووسراوەی هەیە. هیواداریین بەرەودوا نووسراوەکانی بڵاو بکرێنەوە و ببنە هۆی دەوڵەمەندتر کردنی ئەسری کوردی.

عومەر ئیلخانی

# نێوەرۆك

بەناوی خودای گەورە

# پێشەکی

پاییزی ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی، لە شاری بۆکان خودالێخۆشبوو مارفی ئاغایی و چەند کەسێکی تر لە بەرپرسانی (ئینتشاراتی سەلاحەددینی ئەییووبی) و بەڕێز کاک فەتاحی ئەمیری دیدەنێکیان لێ کردم و دوای باس و خواسێکی زۆر هاتنە سەر مەسەلەی چاپی ئەسەرەکانی سوارە و قەولیان دا هەر ئەسەرێکیان بدەمێ بەزوویی چاپ بکرێ و بڵاوی کەنەوە. کاک مارف هەر لەو مەجلیسەدا دەستی دا قەڵەم و کاغەز و چەند پرسیارێکی لە بابەت چلۆنایەتی ژیانی ئاسایی و تایبەتمەندییەکانی سوارە لێ کردم و جوابم داوە.

هەروەها لە مێژ بوو دۆست و ئاشناکانی خۆم و هۆگرانی سوارە هەڵیانپێچابووم بۆ کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی شێعر و پەخشانەکانی. منیش لێرەولەوێ وەحەول و دەول کەوتم و رامئەسپاردە لای هەر کەسێک کە پێم شک هاتبا رێی دەچێتێ ئەسەرێکی سوارەی لەلا بێت بەڵکو وەکۆیان کەم و لە چاپیان بدەم.

بۆ خۆم بەشێکی زۆرم لە کۆمەڵە شێعر و دەقی پەخشانەکانی لەلا بوو و لەو حەیس و بەیسەشدا برای خۆشەویست و وەرگێڕی ڕێزدار کاک (موحەممەدی بەهرەوەر) و نووسەر و لێکۆڵەری هێژا کاک (ئەحمەدی شەریفی) و هەستیاری ئازیز کاک (مەلا عومەری خوسرەوی) کە هەر سێکیان خۆیان زەمانێک هاوکار و ئاشنای سوارە

بوون لە رابیو، هەرکام بەشێك لە بەرنامەکانی «تاپۆو بوومەلێڵ»یان بەلای خۆیانەوە راگرتبوو و پاش ئاگاداری لە دەس‌بەکاربوونم بۆ چاپ، زۆر بە دڵاوایی و خۆشییەوە دەقەکانیان وێدام و جێی خۆیەتی سوپاسیان بکەم. هەروەها بە پێویستی دەزانم سپاسی شاعیر و نووسەری خۆشەویست و هێژا کاك سەلاحەدینی عەرەبی بکەم کە لە کۆکردنەوە و دۆزینەوەی دەقەکانا یارمەتی دام و ئەرکی پێداچوونەوە و راستەوپاستەکردنی کتێبەکەی زۆر بە گەرمی وەئەستۆگرت.

چەند مانگێك دوای ئەو دیدارە کە باسم کرد، کۆمەڵە شێعرەکان و ئەوەندەی لە «تاپۆو بوومەلێڵ»ەکان لەلام بوون، ناردم بۆ ورمێ بۆ چاپکردنیان، بەو هومێدە کە بەڵکوو لەو رێگایەوە خزمەتێکم بە «نیشتمان و فەرهەنگی» سوارە و «سوارە» و فەرهەنگ و نیشتمانی کردبێت و مەڵحەمێکم خستبێتە سەر زامی دەروونی دەربناژن و وردەفرمێسکی گەرمم بە دەم هەناسەی ساردەوە هەڵوەراندبێ و سکاڵایەکم بۆ روحی کلۆڵی خۆم پاش مەرگی سوارە کردبێت.

زۆری پێ نەچوو دیوانەکەی بە ناوی خەوەبەردینە هاتە دەرێ و دوا مانگێك تاقە نوسخەیەکی نەماوە، بەڵام پەخشانەکە لەو ناوەندە قەتیس ما.

لە سەر خواستی دۆست و ئاشنایان لەبەر ئەوە کە من شارەزاتر بووم بە ژیانی سوارە، ژیاننامەیەکی سوارەم نووسی بۆ دیوانەکەی.

مارفی خوالێخۆشبوو قەولی دا لە چاپی پەخشانەکاندا خۆی سەرپەرشتی بکا کە جوان و رازاوە بێتەدەرێ و هەر خۆشی پێشەکی بۆ بنووسێ و داواشی لە من کرد کە دەگەڵ نووسراوەکەی خۆی ئەو

وتوویژەی ـ کە لە هەوەڵەوە باسم کرد لەگەڵ من کرابوو ـ بڵاو ببێتەوە، کە من ئەودەم رازی نەبووم، چونکە پێم وابوو هەر ئەو پێشەکییە کە لە «خەوەبەردینە»دا چاپ بووە، بەڵام ئێستا کە مارف ماڵاوایی یەکجاری لێ کردووین و دیداری قیامەتیش گەلێك دوورە، دڵم هەڵێنەگرت یادێك لە شۆڕەسواری مەیدانی ئەدەب، شاعیر و نووسەری گەنج، نەونەمامی باخی کوردستان، مارفی ئاغایی لە ناو کتێبی شەنگەسواری ئەدەب و زانای فەرزانە سوارەی ئێلخانیزادە نەکەم.

ئەوە دووهەمین نووسینمە لە سەر کتێب کە هەردووکیانم بە دڵی پڕ لە دەرد و کوڵ نووسیوە. مارف یەکێك لە هۆگرانی راستەقینەی سوارە بوو، شاعیر بوو، نووسەر بوو، لە موساحەبە لەگەڵ پیاوە گەورە ئەدیب و زاناکانی کورد لێزان بوو، تا بڵێی رەزاسووك و خوێنشیرین و جوانچاك بوو، «ئەك گڵە کوێر بێ!» لە کوردستانی ئەمدیو و ئەودیو لە ناو شاعیران و نووسەرانی بەناوبانگی کورد ناسراو بوو.

مارف زۆری زەحمەت بە (ئەسەرەکانی سوارەوە کێشا و بە دەوروبەریاندا هات، بەڵام بەداخەوە ئاگر و گڕی مەسەلەی چاپ لە ساڵی هەفتارا هەر هات لە سارد بوونەوە و کوژانەوەدا بوو، هەرجارێك کە لە چاپی کتێبەکەم دەپرسی، «ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی» بە بیانووی بێ پووڵی بێدەنگیان دەکردم.

ساڵی ١٣٧٦ کە مارف بەتەما بوو بە دەزگای کامپیوتێر بیاننووسێتەوە و ئامادەی چاپیان بکا، داخی داخانم کۆچی بێ وادەی مۆڵەتی نەدا و کتێبیش هەر وەك دۆستانی تازیەبار و رەشپۆش بوون و دڵبەسۆ و شتەکەش هاتەوە سەر «حوللەمەرەسێ».

نازانم وایه یان نا، بەڵام پێموایه له کوردەواریدا نەبێ، لەهیچ کوێی تیکەی دنیایە وا نییه که شاعیر و نووسەر دەبێ بۆخۆی ئەرکی چاپی کتێبەکەی وەئەستۆ بگرێ و بە هەزار قەرز و قۆڵە شان بداتە بەر ئەو کارە قورس و گرانە و زیاتر واش هەڵدەکەوێ کە شاعیر یا نووسەر لە باری ماڵییەوە توانای چاپی ئەسەرەکەی خۆی نییە، بە ناشکوری نەبێ ئەوەش هەر بەشێکە لە فەرهەنگی ئێمەی کورد.

دیسانەوە چوومە ماڵی فکرەوە کە ڕێگایەکی بدۆزمەوە بۆ چاپی کتێبەکە، کە خوداوراستان مرۆڤێکی فەرهەنگی و ئەدیب و ئەدەب خۆشەویست، بەناوی بەڕێز کاك حاتەم عەلی‌مورادی پەیدا بوو، لەسەر داوای خۆی ئەرکی چاپی گرتە ئەستۆ و ئەو گەوهەرەی کردە دیاری بۆ خەزێنەی فەرهەنگ و زانستی گەلەکەی. لە خودای مەزن داوا دەکەین چۆن چاکە ئەوەی بێتە ڕێگا و لەو خزمەتە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییانەدا سەرکەوتوو بێت.

تاپۆ و بوومەلێڵ سەردێری زنجیرە بەرنامەیەکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بوون کە لەساڵانی پەنجادا سوارە دەستی کرد بە نووسین و بڵاوکردنەوەیان لە بەشی کوردی ڕادیۆی تاران و لە ماوەیەکی کورتدا توانی لایەنگرانی هەڵبژاردە و گوێگری تاسەبار پەیدا بکا و ببێتە نوقڵی کۆڕ و مەجلیسان. لەناو ئەو بەرنامانەدا کە زۆربەیان ئەرکی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبین، پەخشانی دڵگر و کورتەچیرۆکی سەرکەوتووشی تێدایە.

زمان و شێوەی دارشتنی نووسراوەکان کە خۆی قۆڵێکی سەربەخۆیە لە ئەدەبدا، من خۆی لە قەرە نادەم و بە وتەی مامۆستایەکی

فارسزمانی زانستگەی تاران کە دەڵێ (پێشەکی نووس نابێ حەول بدا هیچ چەشنە لێکدانەوە و ناساندنێك لە سەر کتێبەکە بنووسێ، بەڵکوو تەنیا ئەبێ نووسەری کتێب لە هەر بارێکەوە بناسێنێ و لە خوێنەر گەڕێ خۆی بیخوێنێتەوە و داوەری لەسەر بکا)، جا منیش بە گوێی مامۆستا لەوە زیاتر باسی کتێبەکە ناکەم، بەڵکو خودا یار بێ لە داهاتوودا کەسانێکی زانا و شارەزا لەسەری بنووسن و چلۆنایەتی شوێندانانی نووسەرانی پێشوو لەسەر سوارە و تەئسیری سوارە لەسەر شاعیران و نووسەرانی هاوزەمان و دوای خۆی تەواوتر هەڵاجی کەن و ئاسۆی ئەسری کوردی روونتر کەنەوە.

### با بێینە سەر باسی سوارە:

سوارەی ئیلخانیزادە کە هەموو شاعیر و نووسەرەکان بە کاك سوارە ناوی ئەبەن، هەروەك چۆن شاعیرێکی پایەبەرز و خاوەن شێوازێکی سەربەخۆ بوو و ئاڵوگۆڕێکی گرینگی بەسەر شێعری کوردیدا لە کوردستانی ئێران هێنا، ئاواش بە سەر شێعری فارسیدا زاڵ بوو، لە نووسینی پەخشانی فارسی و کوردیدا مامۆستا و بەدەسەڵات بوو. لە پێشەکی دیوانەکەیدا کە سوارە کێیە و کوڕی کێیە و چۆن و لەکوێ خوێندوویەتی و لەکوێ لەدایك بووە و چۆن ژیاوە و تایبەتمەندییەکانی کام بوون، تا ساڵ و رۆژی کۆچی دوایی بە وردی باس کراوە و ئیتر نیازێك نابینم باسی بکرێتەوە و بە هێنانی موساحەبەیەکی شاعیری بەناوبانگی کورد شێرکۆ بێکەس ـ کە ئەلحەق بێکەس نییە و شێعرە جوان و بەرزەکانی کەسوکاری ئەون و لە ژمارەی ٦٨ی گۆڤاری سروەدا بڵاو کراوەتەوە، کۆتایی بەم نووسینە دێنم.

لێی دەپرسن: «باری گشتی شیعری کوردی لە کوردستانی ئێراندا چۆن هەڵدەسەنگێنی؟» لە وەڵامدا دەڵێ: «من پێموایە لە وەفایی شاعیرەوە کە شاگردێکی قوتابخانە گەورەکەی نالی بووە، هەتا ئەگاتە سەر هەژار و هێمن، شیعری کوردی لە کوردستانی ئێراندا هەر دووبارەکردنەوە و لاسایی‌کردنەوەی بەردەوامی ئەو قوتابخانەیە بووە. هەژار و هێمن لە شاعیرانی پێش خۆیان بەهرەوەرتر بوون، ناوبەناویش وەك هونەری شیعر لە هەندێ کۆت و پێوەندی تەقلیدی یاخی بوون....

لە خەرێتەی شیعری تازەی کوردستانی ئێراندا سوارەی ئیلخانی‌زادە رێگەیەکی نوێتر و بەهرەی ئەزموونێکی تازەتر بوو، بە ئاوازێکی عەسریترەوە چریکاندی، سەرهەڵدانێکی سەرنجڕاکێش بوو، بەلای منەوە گرنگترین خاسیەتی شیعری سوارە لەوەدایە دەنگدانەوەی کەسی دی نەبوو، سێبەری ئەم و ئەو نەبوو، خۆی خۆی بوو.»

بەڵێ، بەڕاستی سوارە نزیك بە سی ساڵ لەمەوبەر کە نووسینی کوردی ـ بەتایبەت لە کوردستانی ئێراندا ـ زۆر کەمڕەنگ و بێبرەو و شاراوە بوو، قۆڵی هەڵماڵی و لە ماوەیەکی کورتدا توانی بەرزترین شوێنەواری ئەدەبی بخولقێنێ و دەتوانم بڵێم، ئەو نەسرانەش پتر دەنگی راستەوخۆی خۆی بوون و ئێوەش نازانم.

## خوێنەری خۆشەویست و بەڕێز!

ئەو مەبەستانەی کە ئێستا لە بەر دەست دایە، هێندێك جار بە شێوەی کورت براونەتەوە و بە بەرنامەیەك سەروبەریان پێکهاتووە،

وەختی واشە چەند بەرنامەیەکی رادیویی بۆ تەرخان کراوە و باسەکان بە دریژی مەودایان دراوەتێ. بە هەر حال ئەگەر هات و تووشی مەبەستی وا هاتی کە تەڵولۆیان تێکەوتووە و ئی واشیان هەبێ کە کەموکووڕی لاپەڕەیان هەبێ، ئەوە دەگەڕێتەوە سەر وەدەس نەکەوتنی تەواوی دەقەکان، یانی دەتوانین بەداخەوە بڵێین ئەوەی ئێستا چاپ کراوە لە سێ بەشان بەشێکە. هیواداریین بە بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبە، هەر کەس لە هەر کوێ دەقی تر، یا دەقی تەواوتر و نوسخەی سەحیحتری لایە، بۆمان بەرێ بکا کە هەم لە چاپی داهاتوودا بە شانازییەوە کەڵکی لێ وەرگرین و هەم زۆریش مەمنوون دەبین.

عومەری ئێلخانی
زستانی ساڵی ١٣٧٧

## پاش پێشەکی

من ئەڵێم
هەتا هەتایە دەوری جوانییە.
ئەمرۆ گەر هەتاو کەسیرەیە. نەماوە ئاگر و گڕی.
مێرگی ئاسمان بە سووتمانی هەوری لوکەیی نەزۆك.
پڕ لە خاڵ و قوپەنە!
جەنگەڵێ کە جێژوانی پۆلە پۆری باڕییە.
جێگە مۆڵی کەمتیار و گورگ و ڕێوییە!
شۆرەبی کە بۆتە داری چاکی بێ نەشە و شنە.
زەلکە گەر تەیاری تیر و قوشەنە.
خوشەویستەکەم!
لە پەنجەرەی نیوەتاکی بوومەلێڵەوە
چاوی من لە دیمەنی کچی بەیانییە!
لە حەنجەرەی زەمانەوە
گوێم لە زەمزەمەی زوڵاڵی خێزە وردەکانییە!

هیوایەك پەری‌ئاسا باڵ دەنگێوێ و لە مەڵبەندی وشك و قاقڕی ناهومێدیا دەنیشێ و بە خوناوکەی نارەناری بەهاری ئاوپرشکێنی گوڵی ڕاکاوی ژیان دەکا.

گوێ بە بیستنی ئەو زمزمە زوڵاڵ و نوێیە دەلاوێتەوە و روح بە لێکدانەوە و تەعبیری شەپۆلی ئەو مووسیقایە بەرەو سەما دەچێ و

درەوشانەوەی لە ئەستێران تێدەپەڕێ....

ئەوە تەوەری سەرەکی بیری باریکی شاعیر و نووسەری هەڵکەوتەی سەردەم، کاك سوارەیە.

وتەی کاکەسوار بۆ من هەمیشە چەشنی ڕەهۆڵێك وایە کە لە زیندانی بێ ڕۆچنی خەمی هەبوون و دەردی نەبووندا بەرەو سنووری نوور و بوون دەکشێ. هەر بەڕاستی ئەوەندەم شەو و ڕۆژ پێ‌ئێکخستوونەوە، لێم بوونە بیرەوەری نەمری ژیانم و سەربەندی گشتی وتەکانم.

دڵ کامە هەواری پێخۆشە کاك سوارە لەوێ ڕەشماڵی خۆی هەڵدەدا و بە زمانی شیرن و پاراو میوانداری دەکا و نەقڵ و نەزیلەی دنیای کۆنە و نوێ دەگێرێتەوە. لێرەدا بەرامەی سەرخۆبوونی مرۆڤ تۆمار بە تۆمار وڵات دەتەنێتەوە و ترووسکەی بیری ئازاد خۆ دەردەخا و بەرگێرەوەی بۆ نییە.

نەسری کوردی خەریکە کەسایەتی پەیدا دەکا و کەوتۆتە سەر راستەڕێیان. ئەم کتێبە درێژەی ئەو قۆناخە شکۆدارەیە و بە دەستی هەڵکەوتەیەك لە بەرەی مامۆستایان: هەژار، هێمن، قزڵجی، زەبیحی و شوکور مستەفا بەهێزتر دەکرێ. بە لای منەوە بڕینی ئەو ڕێگایە لە لایەن کاك سوارەوە کارێکی یەگجار گرینگ و بەرچاوە، بۆ؟ چونکە چاپ و بڵاوکرانەوەی چاپەمەنی بە زمانی کوردی لە ئێراندا بە دەگمەن بوو؛ ئەوەی بە وردی و بە پارێزەوە کاری لەسەر دەکرا و تین و گوڕێکی وەبەر هەناوی ئەدەب دەنا، زیاتر دەسنووس و تاق‌تاقە کتێبی دەستاودەست گەڕاوی سنوور پەڕاندووی گەرمێن بوون و هیچی دیکە. بەڵام تێکەڵاوی نزیکی کاك سوارە لەگەڵ کۆڕ و کۆمەڵی ڕۆشنبیری کورد و پلەی بنەماڵەیی لەو بارودۆخەدا توانیویانە باڵی بە سەر بکێشن و هەلی بۆ بڕەخسێنن. جا بۆ درێژەی مەنتیقی باسەکە پێویستە لێرەدا

ئیشارە بۆ ڕووداوێکی زۆر گرینگ لە مێژووی ئێرانا بکرێ کە بە «شۆڕشی سپی» ناودێر کراوە. ئەم پێشهاتە کە دەگەڕێتەوە سەر گەلاڵە و زەختی لاوەکی، ریفۆڕمێك بوو لە کۆمەڵی داخراو و نیمچە دەرەبەگی وڵاتا و بە بڕوای زۆربەی پسپۆڕان لە پێشکەوتی کۆمەڵا دەورێکی مەزنی بینیوە.

هەڵبەت بەر لەوەی ئەو ئاڵوگۆڕە بە شێوەی ئاشکرا بێتە ئاراوە، لە ژێرەوە جێگا و ڕێگای بۆ خۆش دەکرا. بۆ وێنە لە ساڵی «١٣٣٨»ی هەتاویدا مانگنامەی «کوردستان» بە زمانی کوردی لە تاران هاتە چاپکران و سوارەش یەکێك بوو لە هاوکارانی، کە بەداخەوە تەنیا چەند ساڵی تەمەن کرد.

هەر لەو سەروبەندەدا بەشی کوردی رادیۆ کرماشان کرایەوە و بوو بە درێژەی بە ڕەسمی نووسین و خوێندنەوەی کوردی؛ هەڵبەت تەنیا لەم چوارچێوەیەدا. زۆربەی نووسەران و هاوکارانی مانگنامەی «کوردستان» بوونە کارگێڕ و هاوکاری رادیۆ کرماشان.

بەکورتی مەودای ساڵانی چلی هەتاوی کە سوارە تووشی زیندان و بگرە بەرە هات و دوای ماوەیەك ئازاد کرا، هەر دەسبەرداری کاری ئەدەبی نەبوو؛ تا ئەو جێیەی کە توانی شوێنەواری بەنرخی «تاپۆ و بوومەلێڵ» بخوڵقێنێ و لە رادیۆوە بڵاو کاتەوە....

حەقیقەت ئەوەیە چونکە تاپۆ و بوومەلێڵ تەنیا باسێك و دوو باس نیە و پتر لە شێست بەرنامەی سەربەخۆیە و لە چەند ساڵاندا نووسراوە، رادەربڕین و لێکدانەوەی ورد گەلێك ئەستەم دەکا و لکی زۆر لێ دەبنەوە و پێتوو بکەوینە ئەو لێرەوارە چڕە، دەرکەوتنمان ئەوەندە ئەخایەنێ کە وەڕەزی لە دوو دەبێ و لە پێشا باسی ئەومەرەی سەرەکی هەڵوێستی نووسەر کرا و بە هەڵەی دەزانم شەقڵی بیرم بخەمە سەر دەقی بۆچوون و ڕوانگەی سوارە و

ئوگران.

ئادەمیزاد بوونەوەریکی رەمزاوییە، جاری وایە دڵی خوشە، خوشی بو دیت و روون دەبینی، لە بازنەی شادیدا هەڵدەسووری، هەستی دەبزوێ و بە ژیانەوە دەخافڵێ؛ هەلی وایە خەمناکە، هەموو شتیك لەبەرچاوی تەم گرتوویە و قاپوری ژیان بە زیندان دەشوبهینی؛ ئینجەل لە مابەینی هەرکیاندایە، لە تەنگەبیران لا دەدا و قوول دەبیتەوە، بویە لە چیروکی «شەرگە»دا بە لیکدانەوەیەکی عالمانە شەر وەلا دەنێ و دەسکە گوڵی ئاشتی و پیکهاتن دەکاتە دیاری؛ پیکهاتنیك لەسەر بناغەی مروڤایەتی و خوشەویستی ئادەمیزاد.

وەك روونە گیرانەوەی نیوەروکی زوربەی چیروکەکان لە زمان یەکەم کەسی تاکەوەیە و دەتوانم بڵیم خوینەر زور چاك بەدوای خویدا دەکیشی. فورمی چیروك، تەنز، پەخشان، لیکدانەوە و ناساندنی کەسایەتیکان بریێ لە قەلافەتی ئەدەبی فارسی نیزیکن، بەلام جیاوازیان زورە. بەرچاوترین جیاوازی سوارە لەگەل ئەدیبانی سەردەمی خوی ئەوەیە کە سەرەرای زاڵبوون بەسەر فەرهەنگی رەسەن و زمانی فولکلور و زگماکیدا، بە بوونی چیشکەیەکی (زەوقی) سەربەخو و هەڵکەوتە، نووسراوەکانیشی وەکوو شیعرەکانی پرن لە وینەی جوان و خەیاڵ ورووژین و وردەکاری زیرەکانە و کەمتر وایە ناوەروکی نووسراوەکانی گرێ نەدرابن بە مەبەستیکی گرینگی بەرزی گەلی بێدەرەتان. کاکەسوار ئەوینداریکی لەجوشە و هەموو شتیك لە جوانی و خوشەویستیدا دەبینی. یانی مەلی جوانی‌پەرەستی روحی لەوپەری نارەحەتی و کلوڵیشدا، سەرەرای بروا بە ئەوینی ئاسمانی، هیشتا نەیتوانیوە خوی لە داوی ئەوینی زەوینی تیژتیپەر رزگار کا و هەتا جیەك چوتە پیش کە لومەی کراوە!؟

بە رای من سەرجەمی بابەتەکانی ئەو کتیبە دەتوانی گەلیك قوزبنی

تاریك و ونی روحی ئەوسای کۆمەڵی کوردەواری، بەتایبەت توێژی ڕووناکبیر و خوێندەوار و چۆنیەتی هەڵوێست و ویستی بەرەنگاری و مل‌کەچی وەدەر بخا. واتە مەودایەك کە لە نێوان نووسەرانی ئاوارەی کوردستانی ڕۆژهەڵات و هەڵس‌وکەوت و هەڵوێستی خەڵکا بەدی دەکرا، بە بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبە چاکتر دەردەکەوێ و مەیدان بۆ لێدوان و شی‌کردنەوە فرەوانتر دەبێتەوە.

خوێنەواری دەلال!

بەرێز «حاجی عومەراغای ئیلخانی» بە درێژی باسی بەسەرهاتی کتێبەکەی کردووە و من خۆی لێ‌دەبوێرم، بەڵام پێم‌خۆشە لەم مەبەستانەی خوارەوە ئاگادار بن:

١ـ ئەگەر وشەیەك لە سەر باوی ڕێنووسی رابردوو بووە، بەپێی پێویست هاتۆتە سەر ڕێنووسی ئێستا و تاق و واز هەڵەی تێدا ڕاست کراوەتەوە.

٢ـ ئەو دەقانەی بە خەت و دەنگی کاك‌سوارە نەبوون، زۆر وردەکاریان لەسەر کراوە و بریتین لە:

ـ دوو هەوارگە

ـ «نووری» شاعیری خەم

ـ «سەجادی» . «گۆران» ناناسێ

ـ «مەحموودی» بە شوێن مامۆستا «گۆران»ەوە

ـ «گۆران» و جوانی

ـ کەی کێشەی نێوان کۆن و نوێ ئەبڕێتەوە؟

ـ بەهاری دڵداری

ـ دیمەنی بەفر و زستان

ـ خەڵکی شاری ئەوینم

ـ رووناك

ـ تراژیدی «سەیدەوان»

دیارە پێتوو لە داهاتوودا نوسخەی حاشا هەڵنەگرتر پەیدا بن، ئۆبالیان بۆ دەکێشم.

٣ـ تەواوی ئەو شێعرانەی نووسەر کەڵکی لێوەرگرتوون، لەگەڵ دەقە هەرە باشەکان لەبەر یەکم رۆناون و پێم وایە گرێیان لێبراوە.

٤ـ دەقەکان لە سەر بنەمای پێوەندی و مێژووی نووسران یان بڵاوبوونەوەیان یام بە دڵخواز ریز کراون.

٥ـ تەواوی ئەو ناوانەی بەسەر نووسراوەکانەوە هەن ـ بێجگە لەو ناوانەی خوارەوە ـ من بۆم هەڵبژاردوون.

ـ دوو هەوارگە

ـ کەویار

ـ بەهاری دڵداری

ـ دیمەنی بەفر و زستان

ـ خەڵکی شاری ئەوینم

ـ رووناك

ـ نومایشنامەی «سەیدەوان»

سەلاحەددینی عەرەبی

١٣٧٧/١٢/١٧

## دوو هەوارگە

لە هەوارگەی یەکەمی بەرنامەکەماندا دەچینە سەیری گوڵزارێکی بێ خەزان و باخێکی جوان و رازاوە بە گوڵاڵە و ڕێحان؛ تێراو و پاراو لە سەرچاوەی تەبعێکی ڕەوان و یان جیهانێکی ڕووناک و ڕەنگین کە پڕە لە سەفا و سەیری کاڵای پڕ لە نەخش و نیگاری عیشق و ئەوین؛ پارچە هۆنراوەیەکی تەنراو بە تانوپۆی خۆشەویستی دوو دڵداری نەخشین کراو بە تاری ڕەنگاوڕەنگی وەفاداری، دەسکردی زانا و هەستیاری شیرین وتاری کورد خودالێخۆشبوو مەلا مەحموودی مفتی (بێخود).

بێخود لەم پارچەیەدا بە دڵێکی پڕ لە ئاه و ناڵەوە مەحروومی و بێبەشی خۆی لە دیداری ئازیز و نازداری دەربڕێ و بە زبانێکی هەستیارانە و بەیانێکی ڕەوانی عاشقانە لە چاوگەی تەبع و ترخێکی بەهێز و نوکتەسەنجەوە دیمەنێ لە حاڵات و پەرێشانی و پەردەیێ لە سینەی پڕ لە ئاه و فوغانی خۆی لە هەر سات وکاتێکی تاریکی و ناکامی و ناهومێدی لە ژیانی دەرئەخا، کە چۆن پەژارەی دڵداری شەوی لێ کردووە بە ڕۆژی

بەدبەختی و ڕۆژی لێکردووە بە شەوی ڕەشی پڕ لە سەختی.

لە دولبەر گفتوگۆیێکم نەبیست، ئەی سینە ئەفغانێ
لە لێوی پێکەنینێکم نەدی، ئەی دیدە گریانێ
دەمم ناگاتە شووشەی گەردنی مینایی، ئەی ساقی
دەمم ناگاتە چاوی، ئەی عەرەق خۆرینە فینجانێ
پەرێشانم، لە رووی ئەو شۆخە لاچۆ ساتێ ئەی پەرچەم
دڵم بەینێکە زۆر تاریکە، ئەی شەو ماهی تابانێ
گەهێ زامداری تیغی ناز و خەمزەم، چارێ ئەی جەڕڕاح
گەهێ بیماری چاوم، ئەی ڕەئیسی سیحەحە دەرمانێ
بە شەو شێواوی زوڵفی عەنبەرم، ئیمدادێ ئەی سومبوڵ
بە ڕۆژ چەوتاوی باڵای دولبەرم، ئەی سەرو جەولانێ
لە شەوقی ماهی رووی ئەو شۆخە توخودا پەرتەوێ ئەی ڕۆژ
بە یادی چاکی سینەی، ئەی سەحەر سادەی گریانێ
بە تاو هات لەشکری غەم، سا لەخۆ ڕۆیشتنێ ئەی دڵ
مناڵی زۆرەشاری سینە، ئەی مەجنوون بیابانێ
زەلیلم، بگرە دەستم، کەوتووم، سا ڕەحمێ ئەی گەردوون
فەقیرم، نامرادم، بێنەوام ئەی مونعیم ئیحسانێ
وەکوو بێخود لەمەولا بگرە بۆ خۆت ڕێگەیێ ئەی پێ
لەمەولای خۆت بوێ تۆش چەشنی ئەو، ئەی دەست دامانێ

کاروانی ئێمە لە گوڵزاری بێ خەزانی مامۆستا بێخودەوە بەرەو لووتکەی بەرز و باسەفای هونەر و هونەروانی سەوزەزاری تەڕو زیندوو بە شێعرە جوانەکانی «نالی»ـ

مامۆستای راستەقینەی زانین و کەمال، سەرتۆپی ئاسک خەیاڵان و ویژەوانانی ئەدەب و هونەری کوردی ــ وەریَ‌دەکەویَ و هەوارگەی دووهەمی ئەم بەرنامەیە بە پارچە هەڵبەستێکی بەستراو بە رایەڵ و پۆی هاوریشمینی وڵات‌دۆستی و ئەویندارییەوە ئەرازێنێتەوە.

ئەمجار لە گوڵستانی بەعەتر و بۆنخۆشی ئەم هەوارگەیە داوێن پڕ ئەکەین لە گوڵاڵەسوورە و هەڵاڵە و سونبول و ئەگەرێینەوە بۆ ناو هەڤاڵ و دۆستەکانمان.

نالی لەم شێعرەدا سکاڵای دووری لە مەوتەن و خۆشەویستانی رائەگەیەنێ. بەدڵێکی پڕ لە سۆز و گودازەوە هەزاران ئاخ و پرسیار ئەکا؛ ئایا زرووف و مەجال هەیە بۆ هاتنەوە ناو باوەشی شارەکەی و عازیزەکانی؟ ناهومێد و دڵسارد ئەڵێ بڵێی لە سەر زمانان مابم و یا لە ناو دڵاندا یاد ئەکرێم؟ ئەتوانم بێمەوە، یا ئەبێ تا حەشرم ئەکەن، هەر لە دیاری غوربەتدا بژیم؟

شەرحی دووری و سۆزی بەدبەختی و دەربەدەری، دەردی ئاوارەیی و سەرلێشێواوی، بێبەشی لە بزەی لێوی خۆشەویست و ئاساواوان، دڵی پڕ هەست و ئاسکی ئەکاتە ئاو و بەچاویا تێەپەڕێ.

ئەوەند بێ‌هومێد و توورەیە، ئەوەندە ترساوە و رۆژانی رەشی دیوە؛ بە «باد» ئەڵێ بە چپە و نهێنی بە یارەکەم، بە یارە دڵڕەقەکەم بڵێ کە سوودی دووری من بۆ ئەوە و بەس.

نالی کە ئەم پارچە هەڵبەستە لە ناخی دڵیەوە هەڵقوڵیوە، بەراستی شاکاری ئەوین و خۆشەویستی خوڵقاندووە؛ تابلۆی جوان و ئەخشین؛ یانی ئەم هۆنراوە، پەڕاوی بەبایەخ و بەنرخ لە دەربڕینی هەستی دەروون، یانی ئەم پارچەیە کە هەر دڵێك ئەکا بە دڵۆپ‌دڵۆپی ئاو و بە چاوا ئەیهێتە خوارەوە.

ناڵەی گەرووسۆزی دڵ، ئەم شێعرە بەرز و بەرز ئەکاتەوە تا ئەیگەیەنێتە گومبەدی کەیوان و سەوز و ساف لە بانی عەرشی شێعری کوردی ئەدرەوشێتەوە و

تڕووسکە دەدا.

جا ئەمەش چەند شێعرێك لە قەسیدە بەناوبانگەکەی نالی:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری «شارەزوور»
ئەی لوتفەکەت خەفیی و هەواخواه و هەمدەمە!
وەی سروەکەت بەشارەتی سەرگوشەیی حوزوور!
گاهێ دەبی بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی دڵ
گاهێ دەبی بە دەم دەدەمێنی دەمی غورور
سووتا ڕەواقی خانەیی سەبرم، دڵ و دەروون
نەیماوە غەیری گۆشەیی زیکرێکی یا سەبوور
هەم هەم‌عەنانی ئاهم و هەم هەم‌ڕیکابی ئەشك
ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە، هەستە بێ قوسوور
ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی «سەرچنار»
ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور
چەشمێکە مێلی خۆر لە سەد جێ، بە ڕۆشنی
فەورانی نووری سافە لە سەر بەردی وەك بلوور
یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کە وا
ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەك شەهابی نوور
یا چەشمەساری خاتری پڕ فەیز و عاترە
یا ئاوی ڕۆحبەخشە کە وا دێ لە کێوی توور

داخڵ مەبە بە عەنبەری سارایی «خاک‌وخۆڵ»
تاکوو نەکەی بە خاکی «سولەیمانی»یا عوبوور
شارێکی عەدل و لە جێگێکی گوزەرو نەرم
بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزوور
خاکی میزاجی عەنبەرە، داری رەواجی عوود
بەردی خەراجی گەوهەرە، جۆباری عەینی نوور
شامی هەموو نەهار و فسوولی هەموو بەهار
تۆزی هەموو عەبیر و بوخاری هەموو بوخوور
ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن
هەم نازمی عوقوودن و هەم نازری ئوموور
سەیری بکە لە بەرد و لە داری مەحەللەکان
دوری بدە بە پرسش و تەفتیش و خوار و ژوور
ئاخۆ دەروونی شەق نەبووە «پردی سەرشەقام»؟!
پیر و فوتادە تەن نەبووە داری «پیرەمەسوور»؟!
«سەیوان» نەزیری گومبەزی کەیوانە سەوز و ساف
یا خۆ بووە بە دائیرەیی ئەنجومی قوبوور
ئێستەش مەکانی ئاسکە، ئەو «کانی ئاسکان»؟
یا خۆ بووە بە مەلعەبەیی گورگ و لوورەلوور؟
ئاخۆ دەروونی روونە گۆڕەی ماوە «تانجەرۆ»؟
یا خۆ ئەسیری خاکە بە لێڵی ئەکا عوبوور؟
زارم وەکوو خەلال و ئەحیفم وەکوو خەیال!
ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوتوور؟

لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە

دڵ وەختە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور!

ئایا مەجالی هاتنە لەم بەینە بێنەوە

یا مەسڵەحەت تەوەققوفە تا یەومی نەفخی سوور؟

حاڵی بکە بە خوفیە: کە ئەی یاری سەنگدڵ

«نالی» لە شەوقی تۆیە دەنێری سەلامی دوور

# ئەوین

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ؛ قسەی دڵداری و ئەوین هەرگیز نابڕێتەوە. وا دیارە کاتێ گڵی ئادەمیزادیان خۆش ئەکرد، ئاوی ئەوینیان لێ‌پژاند یا گڵی ئادەمیزادیان بە ئاگری ئەوین هەڵگرساند.

ئەوینی ئینسان، تەنیا برووسکەیەکی یەزدانییە کە مرۆ ئەباتە لای سەرتری بارگای فریشتەی خواوە. ئەوین هەوێنی هەست و هان و هەناسە و هەبوونی ئینسانە.

ئەوین پەرەدارترە لەوە کە تەنیا لە نیگای حەزلێ‌کاریا، یا لە شۆر و شۆقی بەیەکگەیشتنی پیاوێك و ئافرەتێکا بگونجێ.

ئەوین نەفسی ژیانە؛ جوانییە، پاکییە، خۆبەختکردنە، ڕەنجکێشان و لەگەڵ دەردا جووتبوونە. تەنیا لە هەرێمی ئەویندا ئەم ڕازە بەرزە یەزدانییە مانای هەیە؛ بژی بۆ ئەوین، بمرە بۆ ئەوین... و ئێستە گوێتان لە پارچە پەخشانێك ئەبێ سەبارەت بە ئەوین و ئەوکاتە کورتە بە بەهرە و پیتانەی ئەوین کە بە تەرازووی زەمان و بە پێی ڕوانینی

چاوی سەر، کەم خایەنن، بەڵام بە چاوی دڵ هەمیشەن و هەموو شتن، توشەی هەزار ساڵ ڕێگای بە هەوراز و لێژی ژیانن.

ئەمشەو زۆرتر لە شەوانی پێشوو تەنیام، بۆنی غەریبی پڕ بە هۆدەکەم شەپۆل ئەدا، بە شووشەی پەنجەرەی هۆدەکەما شۆڕاوەی باران نەرمنەرم دێتە خوارەوە. وەك پیرەپیاوێك کە لە گۆشەی خەڵوەت و بێدەنگییا، لە ئێوارەیەکی زەرد و خەماوییا بۆ ڕەنجی خەسار، بۆ ڕۆژانی ڕابردووی بەهار، بۆ بووژانەوەی بیرەوەری هەزاران یادگار، ئەسرینی خوێنبار بڕێژێ.

خوای گەورە ئادەمیزادت چۆن دارشتووە کە لە سینەیا بلوورێکی ناسك بە ناوی دڵ ئەبێ خۆبگرێ لە بەر دەریای دەرد و خەم؟! لە بەر سەودای زۆر کەم؟! لە بەر ئاگری زۆر و ستەم؟!

ئەگەر ئادەمیزاد بەم هەستە ناسکەوە کە لە هەر تەلێکی بە هاتوچۆی نەرم و نیانی هەناسەیەك، هەزار نەغمەی پەژارەرێژی داستانێژ هەڵدەستێ، بەڵێ، ئەگەر لە ئەم هەموو ناسکییەدا پشتیوانێکی وەك ئەوینی نەبوایە، چی ئەکرد؟! ئەگەر گیانی ئەمری ئافرۆدیت پاسەوانی نەبوایە، لەم شەوەزەنگی ژیانەدا بەرەوکوێ ئەچوو و لە کام هەڵدێری کلۆڵیا گۆڕ ئەکرا؟

چی هەیە چەشنی ئەوین، کە گرینەکەی لە پێکەنین گیان پتر بگەشێنێتەوە و ڕەنج و پەژارەکەی شیرینتر بێ لە پێگەیشتن و شادمانی؟!

باران هەر ئەبارێ، بەڵام ئاسۆی زەرد و ئاڵتوونی تاجێکی کردۆتە سەر لووتکەی چیای ئەلبورز. ڕنووی بەفری چەن ساڵە وەك گەوهەری شەوچراغ لە سەر تاجی ئاڵتوونی چیا ترووسکەی دێ. گریانی هەور پڕدوو چاوی شینی پەنجەرە و بزەی زەردەی ئێوارە پڕ بە زاری دۆڵ و شیوی چیا!

وا دیاره سروشتیش سەودای ئەوینی لەسەردایە کە بە چاو ئەگری و بە دەم پێئەکەنێ.

ئاخۆ من سروشتم، یان سروشت منە، کە هەردووك وەك یەك ئەگرین و پێئەکەنین!؟

ئەمڕۆ من چاوەڕێی گەڕانەوەی خۆشەویستێکم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ترس و خورپە، وەك تەزووی بەرەبەیانێکی پاییز بە دەماری لەشمدا دەگەڕێ. لە پەنجەرەکەمەوە کە وەك چاوی کاڵی پاش گریان، رەنگی ئاڵ و واڵای لێنیشتووە ئەڕوانمە سەرشەقام؛ دەنگی هەر سۆڵێك لە پێشا وەك دەنگی مووسیقا ئەهاتە بەرگوێم، بەڵام کاتێ تێئەپەڕی و دوور ئەکەوتەوە لە ڕۆژی نەناسراوێك ئەچوو بۆ نەناسراوێکی تر. ئەوەندە بەرەوپیری دەنگی ئەو سۆڵانە چووبووم و بەڕێم کردبوون، بێ ئەوە تەنیا جارێك نیگایەکی گەرم و ئاشنا لە رووم بڕژێ، سەرم هاتبۆوە ئێش و ئێستە دوو دەماری ماندوو، دوو ماری شین لە ملمەوە هەڵگەڕاون و لە هەر دوو لای تەوێڵمەوە خۆیان کێشاوەتەوە ناو مێشکمەوە.

نە، کاتێ پێیەزەیی تێئاپەڕێ، خۆرەتاو لە کۆچی ڕۆژانەی بەرەو سەرای شەو دوودڵە، وەستاوە تا بزانێ چاوەنواڕیی ئادەمیزادێك بە کوێ ئەگا؟! رەنگە خۆرەتاو خۆی زۆری دەردی چاوەنواڕی چێشتبێ!! رەنگە بە شوێن دڵبەرێکی گومبوودا وێڵ بووبێ کە بە هەموو هەرێمی ڕۆژا ئەگەڕا و پاشان تەواوی مەڵبەندی شەوی ئەپشکنی!؟ هەر شەو و ڕۆژەی جارێك و هەرگیزیش نە ماندوو ئەبێ و نە دەسهەڵئەگرێ و تەنانەت چاوی گەش و پڕشنگداری لێئەکەنێ بۆ حەسانەوەیەکی کورت و پشوویەکی کەمخایەن.

گەرووی تاریکایی دوا دڵۆپی رووناکایی هەڵمژی، وەك قولە رەشێکی سەرخۆش کە جامی ئاڵتوونی نیوە خاڵی بە سەرەوە نێ و یەکبین هەڵیدا.

من هۆدەکەم شەو بوو؛ چاوی شینی پەنجەرەکان بە حەریری رەشی شەو بەسترا بوو، بەڵام لە دڵما هێشتا نوورێك وەك پڕشنگی ئەستێرەیەکی دوورەدەست، یا ئاگری

دەشتەوان، لە شەوێکی تاریکا ئەدرەوشایەوە؛ وا دیارە خۆرەتاو لە دەروونا درەنگتر ئاوا ئەبێ! ئەبوو خۆم بە شتێکەوە خەریك کەم، چونکە لەم بێدەنگییەدا، دەنگی لێدانی دڵم لە هەورەگرمە بەرزتر دەنگی ئەدایەوە و هەموو دەماری لەشم وەك تەلی تار لە ژێر پەنجەی زاڵی مووسیقارێکی خەمبارا ئەلەرایەوە و پرووشەی خەم و ماتەمی ئەکرد. بۆ جاری دەهەم نامەکەیم بە دەستەوە گرت و خوێندمەوە، نووسیبووی:

«چیای من! پیاوی سەربەرزم! باڵداری بچووك تاسەی هێلانەکەی کردووە و خەریکە ئەگەڕێتەوە بۆ لات، باوەشی تۆ هێلانەی منە. چاوەڕوانم کە بە چەپکێ گوڵی شێعرەوە پێشوازم بکەی، لەو چەپکە شێعرانە کە هەموو رۆژێ بەیانی لە باخچەی زەوقت ئەتچنی و بە خەیاتەی خاوی ئەوین ئەتبەست و لە گوڵدانی خۆشەویستییا ئەتچەقاند و کاتێ من هەڵئەمستام، بۆنی چەپکە شێعرەکەی تۆ تێکەڵ ئەبوو لەگەڵ هەناسەی بۆنخۆشی چیای بەگوڵ‌خەمڵیو و شەپۆلی ئۆخەی بە لەشما ئەگەڕا...

لە بیرت ماوە تۆ ئەبووی بە «عیسا»ی من و من کە زوو ئەژاکام و لە هەوای دووکەڵاوی شارا لێڵ ئەبووم، وەك «ئەلعازر» خۆم بە دەستی زیندووکەرەوە و مەسیحایەت ئەسپارد و بە ئیعجازی دەستەکانت ژیانێکی نوێم دەس پێ‌ئەکردەوە، کە لە ژیانی رابردووم گەلێك جوانتر بوو....

ئێستە «ئەلعازر» کە مەرگی دووری پێ هەموار ناکرێ، ئەگەڕێتەوە بۆ لای مەسیحی خۆی. پەپوولە دیسان لە سەر گوڵ ئەنیشێتەوە و شۆڕەبی باخچەکەمان دیسان ئەبێتەوە جێژوانی چۆلەکەی وردیلە و عەجوول. ژیان دیسان واتەی تایبەتی خۆی ئەدۆزێتەوە و بەربەیانە ئەبێ بە هەمیشە، هەمیشەیەك بە درێژایی ژیانی من و تۆ؛ تا مەرگ بە رواڵەت لە یەکمان جیا کاتەوە!»

نامەکەی لێرەدا دوایی هاتبوو و من لە بەر خۆمەوە گوتم: «جوانترین چەپکە گوڵی شێعرم پایەندازی تۆ ئەکەم، تۆ کە جوانترین شێعری خودای.» سەرم هەڵبڕی و لە

ژێر پەردەی حەریری فرمێسکا هەیکەلێکم دی لە بەر دەرگا وەستا بوو، دوو دڵۆپ ئەسرینی گەرمی شادی لە بەر دەرگای چاوی هەردووکمانەوە ڕێگای سەرەولێژی گۆنای گرتە بەر و شەڵاڵ بوو. زمان لە کار کەوت و دوو بارەش کرانەوە و دوو ئادەمیزاد بوون بە یەك... باڵداری ئێسك سووکی من گەڕایەوە بۆ هێلانەی مات و چۆڵی خۆی.

# گەویار

بوومەلێڵی بەیانی بوو؛ تەزوویەکی سارد بە لەشی کێو و چیادا ئەگەڕا و گاهێ گیای شلك و گوڵی کێوی چاو بە خەوی ڕائەچڵەکاند.

مەحموود ماوەی سەعاتێك بوو چاوی ئەترووکاندبوو و هەروەها ڕوانیـووی بۆباوکی کە بە هەڵپەسەرنجی کەلەکەی پێشانی ئەدا.

مەحموود خۆیشی نەیئەزانی چۆن وا کوتوپڕ ئەو بیرەی کەوتبووە مێشکیەوە کە باوکی لە دڕندەیەك ئەچێ کە زگی برسی مەڵاسی زەوی کردبێ و چنگۆڵەی دادابێ، تاکەی نێچیر ئەگاتە بەر هەڵمەتی!

ڕەنگە ئەبزووتنەوەی باوکی، بە گەرمە ڕوانینی، بیوو بە هۆی ئەمە کە مەحموود وەها بێتە بەرچاوی؛ ئاخر سێ چوار سەعات بێ چاولەسەریەك دانان، بێ وچان، بێ ڕوانین بۆ ئەم لاوئەولا، تەنیا چاوبڕینی شوێنێك وەها کە پیاو لای وابێ ئەم جووتە چاوە یا هەر ناگەڕێن یا بە هەودایەکی نادیاری بە شوێنێکەوە بەستراون؛ ناچارییە کە هەزار

یر نەخاتە مێشکی ئادەمیزادەوە.

مەحموود بیری کردەوە کە ئەم روانینە بە هەڵپەی هەرگیز بە باوکیەوە نەدیووە. نە کاتێ کە دایکی نەخۆش بوو چاوی نابووە سەریەك و باوکی چاوەڕوان بوو ئەو چاو هەڵبڕێ و دەربخا کە هێشتا گیانی تێدا ماوە، نە ئەو جارە کە کۆرپەی برا گەورەکەی، کە ئەبوو بە نەوەی باوکی، خرا باوەشی. کۆرپەیەکی ئێسك سووکی خوێن‌شیرین کە بۆنی شیر و گۆشتی زیندوو، لیباسی تازەی بەئەسپۆن‌شۆراوی لێ ئەهات و چاوی شینی پڕشنگێکی خستبووە سەر بەروانکەکەی. بە کورتی مەحموود هەرگیز ئەم هەموو تاسە و هەڵپەی لە روانینی باوکیا بەدی نەکردبوو.

مەحموود پڕبە دڵ پێی خۆش بوو پاکانەی باوکی بکا:

«...دەی جا چی بوو، باوکم خێزانێکی زۆری بە ریشەوە بووە، منالی ورد و درشت و سەر و پێچکەی هەیە، دایکم کەوتوو و ڕەوتوو و ناسازە، ئەویش بۆ تێرکردنی ئەم هەموو زارە ئاواڵە و زگە برسییە، ئەبێ هەوڵ بدا، هەوڵ بدا و بە هەموو لایەکا پەل بکوتێ، قەیدی چیە؟ کار، کارە! چ کشت وکاڵ، چ سەودا و سەرمنوێ، چ سەپانی و درویێنەوانی و چ راوکەری. باوکم بەم راوکردنە هەم بژیوی خۆمان پەیدا ئەکا و هەم بە فرۆشتنی نێچیرەکان بە کەلەبەرەکانی تری ژیانمان رائەگا.»

مەحموود لە دڵی خۆیا ئەیویست ئەو مەبەستانە قبوڵ کا، بەڵام ئەم روانینە بە هەڵپە بۆ کوشتنی کەوی بەستەزمان، «ریسەکەی لێ ئەکردەوە بەخوری». هەموو شتێکی لێ هەڵئەوەشاندەوە!

دیانەوە روانیەوە بۆ باوکی، ریشی ماش و برینجی بە دەم شنەی ساردی بەر بەیانەوە ئاڵۆز ئەبوو، دەم و چاوی گنجاوی و لە بەرتاو سووتاوی باوکی کەوتبووە سەر بەردێکی قەوزەگرتوو و بە هیچ بارێك لەگەڵ بەردەکە جیاوازی نەبوو. باهۆی هەڵکراو و رووتی لەگەڵ داری تفەنگەکەی ئەتکوت دوو بەوشی یەك باسکن. ئەمانە هەموو

چاریان نەکرا، بەڵام ئەم روانینە کە بۆنی خوێن و رەنگی دڵرەقی پێوە بوو، شتێك نەبوو کە مەحموود لێی خۆش بێ.

مەحموود لەبەر خۆیەوە کوتی: بابە، و گوێی گرت بۆ وەرامی باوکی.

دیسان بای ساردی بەیان بوو کە تۆزی خەوی لە چاوی وڵاتی خەواڵوو ئەسری، بەڵام باوکی مەحموود هیچ دەنگی لێوە نەهات. سینگی کە گیا نەرمەکانی شێلا بوو ئەهاژا؛ هاژانی مارێك لە بەر گەرمای هاوین. هاژانی سینگی درندەیەکی برسی کە بە شوێن نێچیرا رایکردبێ.

مەحموود بەرزتر هەرای کرد: «بابە!»

دیسانەوە باوکی رووی وەرگێرا و وەرامی نەداوە. دەنگی مەحموود بە هەرای بابە بەرزتر بۆوە و کێوی ئەوبەر وەرامی داوە: بابە... بابە...!

تەقەی تفەنگ هەستا و باوکی مەحموود ئەراندی: «یەك، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش،...»

مەحموود هاواری کرد: «بەسە! بەسە!»

چەن کەو کە هەرکام ساچمەیەکان بەر کەوتبوو هەڵئەبەزین. کەوێکیش باڵی شکاوی بەسەر زەویا خشکەی ئەکرد و خۆی ئەکێشا بۆ ژێر بنجە تووترکێك. باوکی مەحموود وەك تاوێرێ کە خلاری کەیەوە بە چەن باز و چەن سەرەنگریێ خۆی گەیاندە کەوە کووژراوەکان. چەقۆیەکی تیژی دەرهێنا و کەوەکانی سەر بڕی و خوێنی چەقۆکەی بە لکی پشتێنەکەی پاك کردەوە و نایەوە ناو گیرفانی. کەوەکانی جەللە کرد و لاقی بە پەتێکەوە بەستن و هەناسەیەکی کە لە مێژ بوو لە سینگیا قەتیس مابوو، دا دەرەوە.

مەحموود وەك خەڵفێکی ساوا کە لە بەرامبەر دارێکی پیرا شین بێ لە بەر دەمی باوکی چەقی و بە ئەسپایی کوتی: «بابە!»

بابی وەرامی داوە: «ڕۆڵەم!»

مەحموود کوتی: «یەکێ بۆ خۆمان، دووی تریش بۆ فرۆشتن، ئەوانی ترت بۆ گۆشت؟!»

باوکی مەحموود لە پڕ هاتەوە بیری کە بە گوللەی دوایی دوو کەوی پێکاوە و ئەبووا حەوت کەوی سەربڕاوی پێ بێ، بە پەلە کوتی: هەر لێرە بە ڕۆڵەم! و لە بەر خۆیەوە کوتی: «کەوەباڵ شکاوەکەم لە دەس دەرچوو!»

دەستی قوژبن پشکنی باوکی مەحموود بە ناو توووترکەکانا گەڕا و بە کەلاکی کەوەکەوە هاتەدەر.

مەحموود کوتی: «مندار بۆتەوە! بڕوانە پەڕە جوانەکانی شەڵاڵی خوێنە.»

باوکی بە رقەوە کوتی: «حەیف بوو، چەن قەڵەوە!» پاشان بێ ئەوە قسەیەك لەگەڵ مەحموودا بکا، ملی ڕێیەی گرت و بەرەو ماڵ بۆوە.

بای دەمەوبەیان ئەیلووراند. چەن پەڕی نەرم تێکەڵ بە گەردەلوولێکی کەمخایێن بەرەو ئاسمان بەرز ئەبوونەوە و بە لەرینێکی بە ئەسپایی ئەکەوتنەوە سەر زەوی. مەحموود ماوەیەك وەستاو تماشای باوکی کرد. تفەنگەکەی وەها گرتبوو ئەتکوت دەستی خۆیەتی و درێژتر بۆتەوە.

هێشتا مەحموود لە گێژی ڕزگار نەبوو کە دەنگی گڕو پیرانەی باوکی بە گۆرانی «کەو یار» بەرز بۆوە.

# ژیان چییە؟

ژیان چییە؟ ئەو دەنگەیە کە لە دوورەوە دێ و نەرم نەرم پەردەی گوێت ئەلاوێنێتەوە و تاری دڵت ئەلەرێنێتەوە؟! یا ئەو بۆنە خۆشەیە کە لە پرێسکەی ئەسیمەوە ئەپێچرێ و لە بەر هەناسەت ئەکرێتەوە، بێ ئەوە بزانی رۆژێک هەڵدەستی و ئەڕوانی خۆرەتاو هەر وەک رۆژان لە خۆرهەڵاتەوە سەری هەڵداوە، وێنەی تازە بووکێکی شەرمن و رووسوور بە کراسی خارای زەردەوە لەنجەولار ئەکا. مەلی هەڵەشە و تیژباڵ بە بەر پەنجەرەی ھۆدەکەتا هەڵئەفڕن و چەشنی دوێزردیکی تیژ ئەتلەسی شینی هەوا ئەبڕن. ژیان تۆمار بە تۆمار بۆنی خۆشی هەوا و لاوی بە سەرتا ئەپژێنێ و تۆبە هەموو بڕوایەکەتەوە کە خستووتەتە ناو چوارچێوەی ئاڵتوونی زەردەخەنەیەکەوە، بە خۆت ئەڵێی «ژیان چەند جوانە! سروشت چەندە دڵاوا و بەدەمەندە!؟» تۆ وای لە پەنا پێرس و چیای شیرن و جەبەل حەمرین و قەندیلی ئاکۆ و هەڵگورد!

ژیان هەموو واتەی بەرین و یەزدانی خۆی ئەگرێتەوە. هەست ئەکەی هەزاران

ساڵە ئەژی. لەوکاتەوە کە تیری تۆنێژە بوو لە چاوی هەڤاڵانی گزنفۆن (gzenefon)، لەو کاتەوە کە تۆ کەوڵی ئاسنگەریەکەت کردە ئاڵای کەیانی و بە نیشانەی هێرشی گەرمت لە سەر هەموو چیایەکی بەرزی وڵاتەکەت بڵێسەی ئاگری پاك بەرز بۆوە و کۆشکی بێدادی «زوحاك»ی مێشك خۆری کرد بە خۆڵەمێش؛ لەو کاتەوە کە «فەرهاد» کەوتە ناو گێژاوی خەیاڵاوی ئەوینی شیرینی «شیرین»ەوە.

تۆ جارێك «مەم»ی «ئالان»ی، جارێك «سیامەند»ی، کاتێ شادمانی، کاتێ دڵمەندی؛ بەڵام هەمیشە هەر بووی و ئێستە نە تۆ بێ ئەم خاکە تەواوی، نە ئەو خاکە بێ تۆ نەتوانێ بژی بە پاراوی.

رۆژێك هەڵدەستی، تەمێك تەواوی مێشکت پڕ نەکا. لە ئاسمانا بە شوێن خۆرا نەگەرێی، لە هەوادا چاوت پەل نەکوتێ بۆ مەلێکی تیژباڵ، بە هەموو هێزێکی هەستەوە خۆت ملاس نەکەی تا چپەیەك، جریوەیەك، کورکەی پێکەنینێك، یا تەنانەت نووکەی گریانێك پێت بڵێ: تۆ ماوی! تۆ هەی!

بەڵام داخێك و هەزار ئەفسوس، ژیان ئیتر دڵی لێ نادا، چاوی ناڕوانێ، لێوی زەردەی تێنازێ!

تۆ هەمیشە لە بەستێنی دەریایەکی پڕ شەپۆلدا ژیاوی، شەو بە لایەلایەی قورینگی دەریایی و لاوکی شەپۆل سەرت ناوەتە سەر سەرین، ئێستە ناچاری لە کەناری گۆلێکی لێل و لیخن دانیشی و چاو ببڕیە چاوی گۆلی مردوو کە بێ هیچ جووڵانەوەیەك تەسلیمی چارەنووسی تاڵ بووە و دوورە لە باوەشی دایکی دەریا، تەریك لە خانەدانی ئاو، دوا هەناسەی داوە و گۆڕی تەنگی خاك گرتوویەتە بەر گۆرەوشار.

لەپڕ هەست نەکەی هەور نەگرمێ، برووسکە نەدا و قەمچی ئاگرینی تەوێڵی پاکی وڵاتەکەت هەڵنەدڕێ، خەلە و خرمانت کە هیوای سەوزی هەزاران کشتیاری

رەنجبەرە، ئەكا بە پووشی سووتاو. هەر ماڵە قرمەی دێ، هەر ناڵە بە دەم زامی تەڵەزمی بۆمباوە ئەناڵێنێ و تۆ کە هەزاران ساڵ ژیاوی، هەست ئەکەی لەشت شەقار شەقار ئەبێ و زووخاو لە بەر برینت ئەڕوا. تۆڵە وەك کارگی ژاراوی بە گرمەی هەوری فڕۆکەی دوژمن لە ناو دەمار و هەناوتا سەر هەڵئەدا و دەمت بە پانایی «گەڵی عەلی بەگ» ئەکرێتەوە و هەرات بەرزتر لە دەنگی هەورەگرمە و نرکەی فڕۆکە بە ڕەگی ئەندامی نیشتمانەکەتا ئەگەڕێ. تۆڵە، تۆڵە... ئەزمەڕ و پیرس و قەندیل وەڵامت ئەدەنەوە: تۆڵە، تۆڵە... ئەو چەپکە گوڵە سوورەی کە لە داوێنی چیا چنیوتە، تا بیدەیە دەست دڵدارەکەت، ئەیخەیە سەر گۆڕی شەهیدێك کە ماوەیەك بەر لە بۆمباران زیندوو بوو و بە پەلە ئەچووە بۆ لای ماڵ و منداڵی چاوەڕوانی و لەبەر خۆتەوە ئەڵێی: «تفەنگەکەم!» ئەمەیە ڕەمزی مانەوەت؛ تۆ کلیلی تەلیسمەکەت دۆزیوەتەوە!

پاش ماوەیەك لە پشت ئاوایی خاپوورتەوە بەرەو باوەشی پەنادەری چیا هەڵئەبی و لەگەڵ پۆلێك ئەکەوی کە هەموو یەك زمان و یەك زانیاری و یەك ئاو و خاك و یەك خوێن و یەك ڕابردوون.

پێشان سڵاوێك و زەردە گرتنێك، پاشان سروودێکی تێکڕایی:

ئەی چیا، باوەشت هومێدی گەرمی گەل!
ئەی چیا، ڕەمزی هات و هەل!
بەرزی تۆ، گۆڕی دوژمنی!
سەوزی تۆ، ئاسمانە شینەکەی منی!
نانەوێ سەرت بە بۆمبی ئاگرین.
هەر بژی چیای سەفین و ئاگرین!

خوێنی گەرم و گەشی ئازادی بە جۆگەی دەمارتا ئەگەڕێ و چەشنی بنجە گیایەکی دوورە ئاو ئەگەشێیەوە، دیسانەوە هەستی هەربوون و هەرمان لەشت پڕ ئەکا. تۆ یەکێکی و لە جیاتی گەلێك پەژارەدار بووی و ئێستەش تۆ هەر ئەو یەکەی و لە باتی گەلێك ئەتەوێ تا سەرلووتکەی دوورەدەستی ئازادی ڕێگا بیری، بەم چەشنەیە کە

تۆ بە درێژایی مێژوو ژیاوی و لە بەر تۆفان و باو و بۆران و بەفر و سەخڵەت و سەرما وەستاوی. پیرەدارێك لە بەرامبەرتەوە کە هەزاران شەوی بە تۆف وساردی رۆژ کردۆتەوە. چیایەکە رووبەرووتە کە هەزاران سێڵاو بە سەر سینگی سەخت و بەردینیا هاتۆتە خوارەوە، بەڵام هێشتا هەر ماون، چونکە سەریان بۆ مردن شۆڕ نەکردووە. لە بەر خۆتەوە ئەڵێی: «من رۆڵەی چیا، چۆن لە چیا کەمتر بم؟! چۆن لەبەر تۆفانی گوللە و بۆمبا و لەبەر هەورەگرمەی فڕۆکە بیەزم؟!»

تۆ ئەزانی تەنیا یەك جار بەزین، تەنیا یەك جار ترسان، کۆتێك ئەخاتە گەردنت کە هەرگیز لە دەستی رزگار نابی. بیر ئەکەیەوە سێ رێگا هەیە:

یەکەم سەرکەوتن و پڕ بە هەموو دەشت و دۆڵی چیا سەربەرزەکانت ئەڕاندن: «ئەی خۆبەختکارانی پێشوو، من سەرکەوتووم، من رۆڵەی حەڵاڵی ئێوە بووم. داری خێر و خۆشی و ئازادی بەری هێنا، دادگەری سەرکەوت.»

دووهەم، کۆڵەدان و مردن، کە خۆی چەشنێکی ترە لە سەرکەوتن.

سێهەم، بەزین و سەرشۆڕی.

بیری تەسلیم هەناوت پڕ ئەکا لە بێزاری، چاوی گەشی کورەکەت کە بە جانتای پڕ کتێب لە قوتابخانە ئەگەڕایەوە و بە گوللەی دوژمن بۆ هەمیشە لە روانین کەوت، نیگای میهرەبان و ئەویندارانەی خێزانت کە لە ژێر خانووی رووخاودا بۆ هەمیشە خامۆش بوو، ئەمانە و زۆر بیرەوەری تریش تەنووری دەمار و بێزاریت تاو ئەدەن و پێ ئەوە بزانی کەست بە دەور و پشتەوە هەیە، یان نا ئەگوڕرێنی: «نە، هەرگیز، هەرگیز...» و ئاسنی ساردی تفەنگەت دەستی گەرمت ئەلاوێنێتەوە.

## «سەبا» لە گێژی پەرچەمی خاوا

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەنارمەی تاپۆ.

کاك حەسەنی سوهرابی کە ناوی هونەری خۆی ناوە «سەبا» نامەیەکی بۆ نووسیوین و قوتابی دەبیرستانێکی بۆکانە و پارچەشێعرێکی بۆ ناردووین کە نووسەری بەرنامەکە ئەیخوێنێتەوە:

شەهیدی تیر و پەیکانی، عەزیز و چاو کەژاڵێکم

بە ساتێ دای بە دەم بادا، بەموەللا رەنجی ساڵێکم

هەموو ئەقوام و ئەغیارم، ئەکەن مەنعم بە سەودایێت
بەڵام بێ حاسڵە پەندم، عەجەب وێرانە ماڵێکم
لە تاوی دەبدەبەی عیشقی، بە دایم مەست و سەرخۆشم
خەریکی رەسم و نەققاشی، برۆ چەنگ و هیلالێکم
لە تیپی پەرچەم و زولفی، شکاوە عەسکەری ئەقڵم
ئەگەر سوڵتانی رۆمیش بم، ئەسیری رشتە تالێکم
چ لاوێ نوکتەزانم من، ئەڵێی پیرێکی سەدساڵەم
لە رەمزی مەدرەسەی عیشقا بە عەینەن وەك منالێکم
وەکوو مەجنوونەکەی شەیدا رەئیسی عاشقان وێڵم
...نەپرسن گەر هەواڵێکم
لە دەرسی مەدرەسەی مەجنون، چ شاگردێکی مومتازم
خەریکی جەمع و تەفریقی جەبین و وردەخاڵێکم
عەبەس بوو بۆ رەقیبانم، هەموو تەهدید و تەحبیم
لە مەیدانی وەفا، نارۆم بە چەپڵە و قرمە قاڵێکم
ئەوا خەڵکان هەموو مەستی شەرابی گیانی گیانانەن
بڵێم چی کاری لەش وایە، فیدایی قەدد و شاڵێکم
سەباش وا کەوتە بەر تەعنەی رەقیبان و حەسوودانی
درێغ ئەی هاتفی بەختم، خودا نەیدا مەجاڵێکم

بە خوێندنەوەی شیعرەکانت، لاوێکم هاتە بەرچاو کە هەستێکی شاعیرانەی هەیە بەڵام هێشتا نازانێ سەردەمی «ناڵەناڵی نالی لەژێر سۆلی دڵدارا» نەماوە؛ نازانێ کە شیعری ئەمڕۆ هونەرێکی گرینۆك نیە و شاعیری ئەمڕۆ ئیتر ناتوانێ بە پەنجەی خەناوی کچێك شەهید بێ و شەهادەت بۆ شاعیری ئەمڕۆ تەنیا لە مەیدانی پان و بەرینی پاراستنی

سوودی گشتیا نەگونجێ. شاعیرێکمان هەیە ئەفەرموێ:

بــاســـی زولــفـــی درێــژ و چــاوی بــە خــەو

نـــەبـــراوە بـــووە کـــارەکـــەی خـــوســـرەو

برای باشم ئەتوانی بە من بفەرمووی ئەم دەردی دڵەی دڵبەر بۆ کۆمەڵ سوودی چییە؟ برا و خوشکەکانت لەم سکاڵا بێبایەخە بۆ دەرمانی دەردەکانیان چییان دەس ئەکەوێ یا هەر ویستووتە بزانی شێوەی کۆنی شێعری کوردی ئێستەش داشداری و پارێزگاری لێوە ئەکرێ یام نە. خوا لە گەورەیانی رابردوومان خۆش بێ، گۆڕی نالی و وەفایی و مستەفا بەگی کوردی و میسباح و تاهیربەگ پڕ کا لە نوور، ئەگەر بیانزانیایە وای لێ دێ و هونەری شێعر و شاعیری بەم رۆژە ئەگا، خوا عالم کە شێعریان نەدەکوت. هەموو هونەرێك لەگەڵ کات و سات ئەبێ نوێ بێتەوە. ئەم زرمەزرمەی پەنا گوێچکەمان تەقەی سۆلی نازدارێکی بەناز نیە کە لە سێیاری شەودا بەرەو ژوان ئەچێ. ئەمە دەنگی شەوەیە و کوریەی هیوا ئەبا. تو خوا خەسار نییە؟ تۆ کە ئەزانی شێعر بڵێی لە باتی سڵەماندنەوەی نالی زاڵی شەو، لە جیاتی شەق کردنی جەرگی شەو، بە شمشیری دوو دەمی شێعر، دەس بکەی بە راژاندنی بێشکەی بەتاڵی هەستی خۆت؟

کاتی مەجنوون بەسەرچوو، برای چا بە، شاخە بژوێنەکانی موکوریان مەکە بە دیجلەی قاقری مەجنوون. تکایە سەرێك لەو شاخە بدە کە ئەتدیون و هەر لە جیهانی بیرکردنەوەدا فەرمووتە وێڵی ئەو چیایانەی. بڕوانە دەستی بەهێزی فەلا چۆن تەوێڵی هەڵدڕیون و کردوونی بە گەنم و جۆو بێستان. گوێت لە هۆهۆی جووتیار و بلوێری گیانبزوێنی شوان بێ و بزانە کە جوانی رووت لە تێکۆشانی ئادەمیزاددایە بۆ ژیان، بۆ ژیانی روو لە باشی و تەسەلی و تەیاری. برای من ئەوین جوانە، بەرز و خودایە؛ بەڵام تۆی کورد بۆ بە عەرەبی عاشق بووی. گوێ بگرە بۆ ئەم شێعرەت:

هەموو ئەقوام و ئەخیارم، ئەکەن مەنعم بە سەودایییت

بەڵام بێ حاسڵە پەندم، عەجەب وێرانە ماڵێکم

ئەش وشەی عەرەبی لە تاقە شێعرێکا. من تەنانەت لە سەر ئەم بڕوایەم کە ئەو کچە بەستەزمانە ساکارە هەر تێناگا تۆ چی هەڵەلێی یا تەوس و پلاری پێدا ئەدەی؟

کچی کوردی هۆگری مەزرا و دەشت، هاودەمی شنەی نیانی بەیانی ئاوایی کە بە وشەی ساکار و لەدڵەوەهاتووی کوردانە ڕاهاتووە، وەك ئاسکی ڕەوەك لەم عەرەبییە تەق و ڕەقەی تۆ سڵ ئەکا. وا ئەزانی بە چاویا ئەدەیەوە کە تۆ خوێندەواری؛ تەنانەت ئەگەر کیژێکی خوێندەواریش بێ تا لە ناو قامووس و ئەلمونجیدا بۆ مانای وشە عەرەبییەکانت ئەگەڕێ، کوڵ‌وکۆ و تاسە و تامەزرۆیی ئەوین لە دەروونیا دامرکاوە. پێش بە هەستی شاعیرانەت مەگرە. بەری بەردە با بازوێ. جوان دوان و دژوار دوان دوو مەبەستی لە یەك جیان. شاعیر بەو کەسە ئەڵێن کە جوان ئەدوێ و ئەو کەسە کە دژوار ئەدوێ مەتەڵۆکەبازە، قوتابی بەشی عەرەبییە نەك شاعیر و هەستیار.

جگە لەمانە هەڵەی دەستووری و فەنیش لە شێعرەکانتا هەیە کە من چاویان لێ‌ئەپۆشم چونکە بووکی دزێو نابێ قسە لە بەرگەکەی بکەی. هیوادارم لە ئامۆژگارییەکانم کە بۆ ڕێنوێنییتە ئاڵۆز نەبی. ئەزانی کە دۆستی باش ئەو کەسەیە هەڵەت بخاتە بەرچاو نەك بە لێخۆشبوون و چاوپۆشین هانت بدا بۆ هەڵەی یەك لە دوای یەك. تا بەرنامەیەکی تر هەمووتان بە خوای گەورە ئەسپێرین.

١٣٥٠/٢/٢٠

# ئاسۆری دەروون

سڵاوی گەرم و بەگوڵ، سەرچاوەی لە کانگای دڵ، پێشکەش بە گوێگری هۆگری هێژا. لە بەرنامەی ئەمڕۆدا پارچە پەخشانێکتان پێشکەش ئەکەین. هیوادارین بەدڵتان بێ و پەسەندی کەن.

گەڵاوێژ کەوتبوو. هەوا خەریک بوو بەرەو ساردبوون ئەچوو، بەتایبەت بە شەودا تەواو سارد بوو. لە جێگاکەما هەر ئەم بار و ئەو بارم کرد؛ بەڵام خەوم لێ نەکەوت. بایەکی سارد لە درزی پەنجەرەکانەوە ئەهاتە ناو هۆدەکەمەوە. یەکێ لە

شووشەی پەنجەرەکان شکابوو. کوتە رۆژنامەیەکیان بە هەویر پێوە نووساندبوو کە بەری سەرما بگرێ، بەڵام کوتە رۆژنامەکە درابوو. بایەکە کاتێ لێی ئەدا ئەتکوت دەنگی دووزملەیەکی شکاوە بە لای لێوی منالێکی ناشارەزاوە ویزەویزی دێ. من لەو کاتەدا زیاتر لە دوازدە سالْ تەمەنم نەبوو و لەو دیوەخانە زلەدا کە تەنیا بە چرایەکی حەوت نمرەی پایەدار کە لە ناو تاقەی شانشینەکەدا ئەگرا رووناك ئەبۆوە، هەستم نەکرد زۆر بە تەنهام. لەو تەمەنەدا دەروونی منالْ پڕەوەرییەکی وای تێدا کۆنەبۆتەوە کە لە تەنهاییا پێیەوە خەریك بێ. منالْ ئەیەوێ فێر بێ. ئەیەوێ لە ناو جەشیمەتا بژی. من ئەو شەوە بە تەنیا بووم و خەویش بە هاژەی با و ویژەی رۆژنامەکەوە لە چاوم تارابوو.

لە بەر هەیوانی دیوەخان چەن کێشکچی وریا بوون. گڕی ئاورێ وا کردبوویانەوە و حەوت جۆش و کتری چایان بە لاوە نابوو، منی بانگ نەکرد. هەستام خۆم پۆشتە کردەوە. هەر لە تاریکیا دەستم کوتا و کەوڵەکەم دۆزییەوە و بە سەر شانمدا دا و لە هۆدەکە دەرکەوتم. گەیشتمە لای پیاوەکان و پێش هەموو شت دەستم بە ئاگرەکە راداشت.

دوو لاو بوون و پیرێك. پیرەکە ناوی ئەحمەدە جەنگە بوو. تفەنگێکی سێ تیری لە لای دەستیەوە دانابوو. بە چاوپێکەوتنی من هەستا و بێ ئەوە هیچ بڵێ دەستی گرتم و لای ئاگرەکە لە سەر بەڕەیەکی کۆن دایناو و پاشان چاوی بڕیەوە گڕی ئاگرەکە. چرچ و لۆچی دەم و چاوی پیاوانەی لە بەر پڕشنگی ئاگرەکە قووڵتر و بەسامتر ئەهاتە بەرچاو. بەرزایی لێو و گۆنا و لووتی روون و سوور بوو، بەڵام ئەو جێگایانەی وا کەوتبوە ژێر سێبەری گنجی دەم و چاویەوە، تاریکی ئەنواند. نازانم چۆن بوو کوت و پڕ، بە دڵما هات ئەم دەم و چاوە کە نە بزەیەك ئەیگرێ و نە بە پەژارەیەك تێك ئەچێ ئەڵێی ملەکێوێکی بە باسك و بانووە کە تازە خۆری بەربەیانی لێدابێ. سەرباسکەکانی رووناکە و ناو دۆڵ و شیوەکانی، ئێستا هەر بوومەلێڵ و تەپومژە. نەبوو، قسەیەك بکەم، چونکە

من له تەنیایی رامکردبوو. کوتم: «چایەکەتان ئامادەیە؟» دەستێك بە گورجی حەوت جۆشە قورسەکەی هەلگرت و قوروشکەیەکی تەنەکەی پر کرد لە چایەکی رەش و دوو کولۆ قەندی لە ژێر پیالەکە خست. یەکێ لە کێشکچییە گەنجەکان هەستا خۆی تەکاند و بە بای دەستی چایەکەی من پربوو لە خۆڵەمێش، کوتی: «مام ئەحمەد پێت چۆنە دەورێکی دی بدەم.» مام ئەحمەد نەتکوت قروقپی کردووە، بێ ئەوە هیچ بڵێ تفەنگەکەی بۆ درێژ کرد. لاوەکە وەریگرت و بە شانیا کرد و لە لێژی بەرەو هەیوانەکە چووە خوارەوە.

پرسیم: «مام ئەحمەد تەمەنت چەند ساڵ ئەبێ؟» بە دەنگێکی نەرم و پیاوانەوە کوتی: نزیکی شێست.» قەڵاشکاری سەر ئاگرەکە نیوەی سووتا بوو. قرچەیەکی کرد و بوو بە دوو کوتەوە. مام ئەحمەد سەرەبزووتەکانی لە سەر یەك هەڵچنی و بە لکی مێزەرەکەی گەشاندیەوە و گڕی تێبەردان. ئاگری دامرکاو دیسانەوە بڵێسەی هات. مام ئەحمەد لەپی دەستی بە یەکاسوو و دەنگی بە یەکاخشانی دەستی نەتکوت دەنگی دوو بەردە زوورەیە کە لە یەك ئەدرێن. جگە لە دەور و بەری ئێمە هەموو جێگایەك تاریك بوو. کۆڵانی دێ، دەشتی پشت ئاوایی و چیایەکی بەرز لەو پەڕی دەشتەکەوە لووتکەی لە تاریکایی ئاسمانا گوم ببوو. مام ئەحمەد بە سۆزە دەستی پێکرد بە بەیتی سوارۆ:

هۆ هۆ سوارۆ

سوارەکەی لە من بەتەنێ

..............

بە کوێ گوێم لەو دەنگە گرتبوو کە لە گەروویەکی پیر ئەهاتە دەر. وردە وردە هەستم کرد دەنگی مام ئەحمەد جادووم ئەکا. دەنگێك کە خەمی شێست ساڵ چەوسانەوەی تێدا بوو و پەژارەی تەمەنی پڕ مەینەت وەك پرێسکەی رەبەنی ئەو شار و ئەم دێ گەراو، چەشنی ئاندێنی شوانی برسی ئەکرایەوە. من ئەو کاتە نەمدەزانی ئەگەر

کورد گۆرانی لێ بەستێیەوە، ئەگەر ماوەی ئەدەی ویزەی باووبالۆزەو بەیتی بێ، ژیانی چەندە حەستەمە. ئەو کاتە ئەمدەزانی ئەمانە کە بە سەر زمانی کوردا دێ و پێی ئەڵێن بەیت، ئەو فووە سێحراوییەیە کە لە گەرووی شمشاڵی شوان و دەشتەوانی کوردەوە دێتە دەر، برینێکە کە ئەدرێ و ئارامی لەشی سڕاکێشیەتی.

ئەو شەوە مام ئەحمەد بە سۆزە دەستی پێکرد، بەڵام بەیتی سوارۆلە نیوەیا بوو بە هاواری دڵی خۆی. بەرز بۆوە، بەرزتر بۆوە. لەشی ساردی ئاوایی ئاخنی. گوێی کپی دەشتی پڕ کرد و بە لووتکەی چیادا هەڵگەڕا بەرەو ئاسمان، بەرەو ئەو جێگایە کە چارەنووسی لێ دیاری ئەکرێ و بەشی بەختەوەری و کوڵۆڵی لێ دابەش ئەکرێ. دڵۆپێ گریانم لە سەر چاوەی چاوی مام ئەحمەد بەدی کرد کە لوورەوی بەست بەرەو چرچی سەر گۆناو و گەیشتە سەر یەخەی مرادخانی تا دیسانەوە لە دەریای پڕ شەپۆلی سەر دڵیا دامرکێتەوە. ئەمزانی هەڵۆی پیری ئاواییەکەمان بۆچ ئەگری. ئاخۆ هەژاری و لەش بەباری یا ژێر چەپۆکی و ڕەنج بەخەساری، هۆی ئەو گریانەیە؟ مام ئەحمەد هەستی کرد کە گریانی ئەو ڕەنگە هەزار جۆر پرسیار لە دڵما زیندوو کاتەوە، ڕەنگە ڕوانینی گێژانەی من لەو کاتەدا مام ئەحمەدی تێگەیاندبێ کە پێویستە قسە بکا و پێم بڵێ بۆچ ئەگری. بە دەسرەی بەر خەنجەرەکەی، چاوی بە ئەسرینی سڕی و لە کاتێکا هێشتا پەنگاوی گریان بەری گۆنجەی گەرووی گرتبوو، کوتی: «لە ئاواییا ئەڵێن ئەحمەد جەنگە هەرگیز پێناکەنێ، ئەمە ڕاستە، بەڵام تا ئێستە کەسیش نەیدیوە من بگریم، تەنانەت کاتێ کە تەرمی کوڕەکەشم بەرەو گۆڕ ئەبرا نەگریام.» هەستم کرد ئەبێ دڵخۆشی بدەمەوە، بەڵام ئەمزانی بۆ کام کۆستی کەوتوو؟ باشتر بوو بێدەنگ بم. سوارۆ ئەشتەرێك بوو کە کوانەکەی دڕیبوو و ئەسرین ئاوێك بوو کە ئاگری دەروونی ئەوی دامرکاندبوو. بەیان بوو، من خەوم ئەهات. هەستام کە بڕۆم. کوتی: «بڕوانە کوڕم ژیان بەم چەشنەیە؛ تازە لە تۆدا چرۆ ئەدا، لە عەزیزی کێشکچیدا خۆی دادەڕێژێ و

دێته بەر و له منیشا گەڵاڕێزان ئەکا و پاشان...»

سەری داخستەوە و چاوی بڕییە ئاگرەکە. مانگ دەرکەوتبوو. حەزیزی کێشکچی بە تفەنگەکەیەوە لە ناو ئاوایی ئەگەڕاوە و لەژێر لێوەوە ویرەی ئەهات.

**مانگە شەو خۆشە مانگ لە سەر ماڵان.**

.........................................................

١٣٥٠/١٠/٣٠

# مردن سەفەرێکی دوور و درێژە

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرەستی بەنامەی تاپۆ. تکایە گوێ بگرن بۆ پەخشانێك.

- «عەزیز! عەزیز، رۆڵە، درەنگە! هەستە کورم. مەلابانگانە!»

عەزیز هەستا. بە دەم خۆکێشانەوەوە باوێشکی هاتێ. شەو نەیتوانیبوو بخەوێ. بۆ مەگەر نەکرا؟! برا بچووکەکەی چەند رۆژ بوو لە ئاگری یاوێکی بەتینا وەك پشکۆو

پۆلووی سوور نەگرا. پیرەژنی ئاوایی‌یەکە نەیانکوت کەوتوویەتی. دوێشەویش عەزیز خەو نەچووبووە چاوی. چرایەکی فتیلە لە سەر کورسییە شرەکەی ماڵیان نەسووتا و دووکەڵی ئەکرد. سێبەری دایکی کە مەمکی بێ شیری نابووە سەر دەمی ئاورینی کۆرپەکەی و هەر لەو بارەش خەوی لێ‌کەوتبوو، لە سەر دیواری قورماوی هۆدەکەیان سەمای ئەکرد و نەتکوت ناڵەکە مژ لە مەمکی دایکی ئەدا. تەنیایی و بێکەسی پڕ بە ماڵەکە پەنگی خواردبۆوە. عەزیز تەماشای براکەی ئەکرد. بەحاڵ هەناسەی ئەهات. دەمی نیوەتاکی بە گۆی مەمکی دایکییەوە وشك بوو. عەزیز هاتەوە بیری کە کاتێ منداڵ بوو، باوکی بە زستانێکی سارد هەر لەم هۆدەیە مردبوو. عەزیز لەپڕ مووچرکێ بە لەشیا هات و چەق‌وچۆیەکی تێژتێپەڕبە ئەندامیا گەڕا. نەتکوت تێپەڕینی چەند ساڵ بە سەر ئەو زستانە ساردەدا خوێنی گەرمی لاوی کە ئێستە لە دەماریا ئەگەڕا ئەیتوانیوو رێگای بووژانەوەی سەرمای ئەو سەردەمە لە دەروونیا بیەستێ. هاتەوە بیری، وەك خەونێکی بێرەنگ، کە بە پێخواسی بە دوای تەرمی باوکیا چووبووە گۆڕستان، کەمێکیشی لە تەلقینی مەلا هەر لەبیر مابوو کە کوتبووی: «مام هۆمەری کوڕی خات ئەستی! تۆ مردووی، دوو مەلایکە دێنە سەرت و پرسیارت لێ‌دەکەن، خوات کێیە؟ پێغەمبەرت کێ؟ و کتێبت کامەیە؟» لەمە زیاتر بیری بری نەدەکرد. عەزیز دوێشەو زۆری بیرکردبۆوە و لە خۆی پرسیوو خوا کێیە؟ بەڵام زۆرتر سەری لێ‌شێوابوو، بەری بەیانی کە ئەبێ هەستێ و بچێ بەفری سەربانی تەویلەی ئاغا بماڵێ، بیری ئەمە کە بەیانی زموادیان لە ماڵێدا نییە بیخۆن، نەیهێشتبوو وەڵامێ بۆ پرسیارەکەی بدۆزێتەوە. عەزیز دوێشەو هەزار بیرەوەری هێرشیان کردبووە سەر مێشکی. بیری خودا و بیری نان و بیری دایکی کە لاپێژی ماڵی ئاغایە. بیری خۆی و برا بیمارەکەی و لە دوای هەموویانا بیری شاگوڵ.

هاتەوە بیری کە رۆژێکی بەهاری پاش هەستانەوەی جووت و کزربوونەوەی

زەوی، خەریکی جووت کردن بوو. پۆلەکچێك بۆ شنگ کردن هاتبوونە داوێنی ئەو کێوە وا جێ‌جووتەکەی ئاغا لە خوارییەوە بوو. کراسی سەوز و سووریان لەبەر نووری خۆرەتاوا برووسکەی ئەهات و بە بالۆرە بانگی تاقمێکی تریان ئەکرد کە لەوبەرەوە بوون؛ هاتەوە بیری کە لەو کاتەدا کوری ئاغا بە سواری ئەسپێکی کوێت بە رەخت و بەرەی زێوەوە لێی پەیدا بوو و بە هاژەی قەمچییەك ئەوی لە جیهانی ئەوین و خەیاڵ تاراندبوو و خۆی کەوتبووە شوێن کچەکان و نووزەی بە ئاستەمی برا بچووکەکەی و چاوی خەوتێشکاوی دایکی کە بە ناڵەی پڕ لە دەرد و ئێشی کوڕەکەی کرابۆوە هەودای خاوی بیرەوەری عەزیزی پساندبوو.

ـ «رۆڵە عەزیز بەخەبەری؟ بخەوە کوڕم، بەیانی کارت زۆرە. ئەرێ کوڕم پەنا بەرە بۆ خودا!»

دایکی عەزیز هەر ئەوەندەی کوتبوو و چاوی مانووی لە سەر یەك دانابۆوە. لە سیمایا چەوساوەیەتی هەزارەها ساڵ چینی هەژار دەهاتە بەر چاو. ئەو رواڵەتە پەرپووتە لەتکوت پەیکەرەی توانجە دژی سەرکەوتنی مرۆڤایەتی. عەزیز چاوێکی بە ژوورەکەدا خشاندبوو. هێلەگێکی هەڵواسراو و دوو سێ کاسە و کەوچکی چێوی، گۆزەیەکی سوور کە لە بەر تیشکی نیوەرەنگی چرای فتیلەدا قاوەیی ئەنواند، دەستێ نوێنی قەدکراو لە گۆشەی هۆدەکە، دوو وێنەی خەیاڵی لە دوو پیاوی گەورەی ئایینی کە لە ناو گۆوارێك دەرهێنرابووو لە بەر دووکەڵی ناوماڵ رەش هەڵگەرابوون و ئیتر هیچ. عەزیز لەوپەڕی گێژی و کاسیا بزەیەك گرتی. دایکم دەستە نوێنەکەی باوکمی پێچاوەتەوە لە گۆشەیەکا دایناوە. زۆرجار دیومە کە لە بەرامبەریا دانیشتووە و لەبەرخۆیەوە قسە ئەکا. لای وایە باوکم یەکجاری بەجێی نەهێشتووین. ئەڵێ ئەگەرێتەوە. دڵنیام ئەگەرێتەوە.

راستی مردن چییە؟ بەرەو کوێ ئەچین؟ رەنگە دایکم راست بکا؛ مردن

سەفەرێکی دوور و درێژە، بەڵام گەڕانەوەی هەیە. ئەگەر ئادەمیزاد بەم ساکارییە بمرێ و ئیتر نەگەڕێتەوە چۆن ئەبێ؟! بێگومان من باوکم ئەبینمەوە. ئەگەر ئەم مناڵە بچووکەش بمرێ!...

لێرەدا عەزیز ئەیویزرابوو بە شوێن بیرەکەیا بڕوا. تەنانەت بە خەیاڵیش دڵی نەهاتبوو مردنی ئەم ساوا خوێن شیرینە بهێنێتە بەرچاو.

ئەو شەوە تێپەڕبوو و عەزیز بەیانی چووبوو بە بێگار بەفری سەربانی تەویلەی ئاغای ماڵییوو. بەرچایی نەخواردبوو و ئارەقەیەك کە بە گەرمی لە لەشی ئەهاتە دەرەوە و خێرا بە هەناسەی ساردی بای زستان ئەیەست و لە سەر سمێڵی تازە رواوی ئەبوو بە سەهۆڵ، دیار نەبوو لە بەر بێ هێزی برسیەتییە یا شەکەتی کاری بێگاری و رەنجی خەساری یا لەبەر هەر دووکیان. بۆ مەگەر هەزار دەردی یەك و دووانە؟ خوا نەکا مەینەت و چارەنووسی رەش ڕێگای دڵێك و تەوێڵێك بدۆزێتەوە. وەك قیلی کەوای سپی پێیەوە ئەنووسێ و بە هیچ بارێ بەری نادا، ئەمە ڕێگا و شوێنی جیهانە و «بەرە هەر لە لای تەنکییەوە ئەدڕێ».

کاتێ ئێوارەیەکی درەنگ عەزیز بە زگی برسی و لەشی ماندووەوە گەڕابۆوە بۆ ماڵ، چاوی بە برای ساوای بیمار و لەش‌بەباری کەوتبوو کە پرشنگی ژیان لەسەر ئاسۆی لێوی کاڵەوەبووی خەریکی ئاوابوون بوو. دایکی عەزیز دەمی بە روومەتی کاڵ و کرچی کۆرپەیەوە نابوو، ئەیویست لە گیانی خۆی بەشی بدا.

کاتێ مناڵێك دێ هەتاوێك هەڵدێ؛ بەهارێك پێ‌ئەکەنێ و کاتێ مناڵێك ئەڕوا، رۆژێك ئاوا ئەبێ و گوڵزارێك شەختەی لێ‌ئەدا.

عەزیز لە بەر دەرگا هێزی ئەژنۆی شکابوو. وڵات لە بەر چاوی سووڕابوو. گێژ و خولی خواردبوو و هێندێك پاشان دایکێکی هەژار ئەیزانیوو بۆ کۆرپەی بگری یا بۆ لاوەکەی. کرێوەیەکی توند، دەرگای نیوە تاکی هۆدەکەیانی کردبۆوە و گەردالێکی بەفری

رژاندبووه سەر کەوشکەنی هۆدەکەیان. لە دەرەوە دەنگی گزیری ئاغا ئەهات کە هەرای ئەکرد: «بەیانی هەرچی پیادەی ئازا و کەڵەمێردە، ساز بێ؛ خان ئەچێ بۆ راو.»

چەپەی دوو کوڕو کچی ئەویندار کە لە بەر دەرگای عەزیز و دایکی بڕیاری ژوانی شەویان ئەدا ئەهاتە بەر گوێ. پاساریەك لە ژێر پاسارەی ماڵێك بە جریوەیەکی نەرم دەرئەپەڕی و باڵی لەگرت بۆ رەشانگی جێدانگەی رانەمەری ئاوایی.

ـ «عەزیز! عەزیز! کوڕم! هەستە! کوڕم مەلابانگانە!»

عەزیز هەستا بە دەم خۆکێشانەوە باوێشکێکی دا و لە بەر خۆیەوە کوتی:

ـ «نەهاتی خۆشە، قورتەکانی ناخۆشە.»[1]

٥١/٦/٦

---

١ - فەقیری خۆشە، قۆرتەکانی ناخۆشە.

# هەقیقەتی شاعیرانە و هەقیقەتی عیلمی

سەلام لە گوێگری بەڕێز و هونەرپارێزی بەرنامەی تاپۆ.

گوێگرانی بەڕێز زۆر جار نامەیان بۆ ئێمە نووسیوە و گلەییان کردووە کە نامەکانیان وەڵام نەدراوەتەوە و دیارییەکانیان لە شێعر و لە نەسر لەم بەرنامەیەدا بڵاو نەکراوەتەوە. ئێمە جێگا و نیشانێکی ڕاست و ڕەوانمان هەیە و زۆر بە لامانەوە سەیرە کە چۆن نامەکان بە دەستمان نەگەیشتوون. ناچارین بڵێین کەمتەرخەمی بۆتە هۆی ئەم کارە. جا چ هی پۆست بێ و چ هی هەواڵانمان لە کرماشان. ئێمە لەو هاوکارانە کە

راسپێری دابەشکردن و ناردنی نامەی گوێگرەکانیان بۆ لێپرسراوان و نووسەرانی بەرنامەکان لە ئەستۆیە داوا ئەکەین ئیتر کارێك نەکەن ئێمە شەرمەزاری گوێگرەکانمان بین. بەڵام باشتر ئەمەیە، ئێوە کە نامە بۆ بەرنامەی تاپۆ ئەنووسن بە ئادرەسی «تاران، مەیدانی ئەرك، رادیۆی ئێران، بەشی کوردی و بەناوی لێپرسراوی گشتی کاك مەزهەری خالقی یا بەناوی نووسەری بەرنامەکە» بنێرن و دڵنیا بن کە ئەگاتە دەستمان. هەڵبەت ئێمە لەم بڕوایەداین کە تەنانەت گلەکردنیشتان نیشانەی لوتفتانە بە بەرنامەکەمان، چونکە ئادەمیزاد هەر گلە لە دۆستی ئەکا. لە هەر حاڵێکا بەرنامەکەمان هەمیشە ئامادەیە بۆ هونەرنماییتان لە هەموو بارێکەوە. هیچ پێویست ناکا ئەوەی وا بۆ ئێمەی ئەنێرن، نووسراوێکی شێعری و یا ئەسری بێت. داب و دەستووری وڵات و دەربڕینی بڕواتان کە ئەم داب و دەستوورە پێوەندی بە چ بارێکی کۆمەڵایەتیەوە هەیە و تێکەڵاوی لەگەڵ هونەر و عاتیفەدا چییە، خۆی ئەتوانێ لە ئێوەوە بۆ ئێمە دیارییەکی باش و هێژا بێ.

نووسراوێکی هێژای ستانفۆردمان دەس کەوتووە کە مەنووچیهری ئاتەشی، شاعیری باشی ئێرانی وەریگێڕاوەتەوە بە فارسی و ئێمە کردوومانە بە کوردی و پێشکەشتانی ئەکەین. ناوی وتارەکە ئەمەیە: حەقیقەتی شاعیرانە و حەقیقەتی عیلمی. ئەم نووسراوە هەوڵی ئەمەیە کە روونی بکاتەوە راستەقینە و حەقیقەت لە روانگەی عاتیفەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ حەقیقەتێ کە زانست ئەیبینێ و ئەیناسێ.

هەڵبەت ئەم وتەیە بەم مانایە نییە کە حەقیقەت خاوەنی دوو رواڵەتی دژی یەکترە یا ئەوەی وا عاتیفە بە حەقیقەتی دائەنێ یا ئەو شتەوا زانست بە حەقیقەتی ئەداتە قەڵەم یەکیان حەقیقەتە و ئەوی تریان دژی حەقیقەتە. ستانفۆرد STANFORD - W.P ئەیەوێ بڵێ زانست و هونەر هەردووکیان حەقیقەت ئەبینن و ئەیناسن بەڵام لێکدانەوەیان و روانینیان جیاوازە. ئەمە ئێوە و نووسراوەکەی ستانفۆرد.

داستانێ سەبارەت بە ویلیام باتلیر ییتس، شاعیری گەورەی ئینگلیزی

ئەگێڕنەوە کە بە باشی جیاوازی نێوان حەقیقەتی شاعیرانە و حەقیقەتی زانستی لێ دەرئەکەوێ. باتلێر یێتس شەوێك لەگەڵ دۆستێکی زانایا دائەنیشێ و پاش شێوخواردن بە پێی باوی ئەو کاتەی دوبلین لێتەبڕێن چەند وردەیەك بە بانگکردنی گیان واتە ئیحزاری ئەرواحەوە خەریك بن. بۆ ئەم کارە شاعیر و زانا و دۆستەکانی تریان لە پشت پەنجەرەی هۆدەکەیەوە کە ئەڕوانێتە سەرشەقام روو ئەکەنە گۆیەکی بلووری و بە گۆیەکەدا ئەڕوانن. لەپڕ باتلێر یێتس بە دەنگێکی جادووگەرانەوە دێتە قسە و ئەڵێ من تاپۆیەکی جادوویی و پڕشنگدار ئەبینم کە لە سەر تەپۆڵکەیەکی خاکی سەما ئەکا. شکڵی تریش ئەبینم رەنگیان سوورە، سەوزە، ئەرغەوانییە کە بە دەوری تاپۆیەکەدا دێن و دەچن. زانا قسەکەی ئەبڕێتەوە و ئەڵێ ئەوەی وا دێتە بەر چاوی بەڕێز باتلێر یێتس پڕشنگی ئەو شتانەیە کە لە دووکانی دەوافرۆشی ئەوبەری شەقامەکەوە لەم گۆ بلوورییەی ئەدا. ئەگەر باش سەیری دووکانەکە بکەن ریزە بوتریەك لە دووکانەکەدا ئەبینن کە پڕن لە دەوای سوور و سەوز و ئەرغەوانی. خۆرەتاو لەوانی داوە و پڕشنگیان ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەم گۆبلوورییە کە لە بەردەمی ئێمە دانراوە. ئەمەیە تاپۆی پڕشنگداری باتلێر یێتسی بەڕێز.

ئەم جیاوازی بیر و بروایە شتێکی تازە نییە. لەمێژە زانایان توانجی وەها ئەگرنە شاعیران. لە سەدەی شەشەمی پێش میلاددا زانایانی وەك گزنۆفان و فیساغورەس شاعیرانی وەك هۆمێر و هێزیودیان بە درۆزنترین ئادەمیزاد ناو ئەبرد. هیراکلیت ئەیکوت شاعیران لەبەر ئەمە کە لە حەقیقەت لائەدەن شایستەی تازیانە لێدرانن. ئەفلاتوونیش لە پەڕاوەی کۆمارەکەیا ئیشارە ئەکا بە کێشەی لەمێژینەی شیعر و فەلسەفە و شاعیران رێ ناداتە ناو شاری پاکژ، واتە مەدینەی فازیلەی خۆیەوە، چونکە لای وایە درۆی زیان ئاوەر ئەکەن. هەڵبەت ئەفلاتوون قوبووڵی ئەو درۆیانەی بەلاوە گرنگ نەبوو کە سەرچاوەی ئیختیار و هێزێك بن بۆ وڵات. ئێستەش زانایان تێکڕا حیسابیان کەی و

کورتەیەك لە بڕوایان وەرگری ئەوەیە ئەمە کە شاعیران یا درۆزنن یا بەداخ و دەردەوە دوورن لە راستەقینەی ژیان. ئەمەیە لێکدانەوەی گشتی سەبارەت بە شێعر کە بێگومان پایەیەکی دروستی نییە.

ئەگێڕنەوە رۆژێك شاعیرێك لە شێعرێکا کوتی لە هەر وردەیەکا ئادەمیزادێك ئەبێ و یەکێك ئەمرێ. ژمارەگەرێك رەخنەی لێگرت و کوتی ئەگەر ئەمە راست بوایە، ئەبوو حەشیمەتی جیهان هەرگیز نەگۆڕێ، نە کەم بێت و نە زۆر، لە کاتێکا وەها نییە. ئەبوو شاعیرەکە بڵێ لە هەر وردەیەکا ئادەمیزادێك ئەمرێ و یەك ئادەمیزاد و $\frac{1}{17}$ ی ئادەمیزاد لەدایك ئەبێ! بەڵێ تەرازوو ئەمەیە بۆ درۆزنی شاعیران!

رەخنەگران ئیتر هاتوونە سەر ئەم بڕوایە کە بەڵێ شاعیرانی وەك ییتس و بلیك blake شێتن، بەڵام لەو شێتانەن کە پیاو سەرگەرم ئەکەن، بەڵام لایەنگران ئەڵێن شاعیران هێزێکی جادوویان هەیە و ئەتوانن ئەو شتانە ببینن کە خەڵکی ئاسایی ناتوانن بیانبینن.

دژی ئەو بڕوایانە کە هەندێ لایەنگری شاعیرن و هەندێ بە شێت و درۆزنیان ئەزانن، مەبەستێك هەیە کە کەمتر کەس ئامادەیە بۆ قبووڵکردنی، ئەویش ئەمەیە کە شاعیر و زانا لە دوو باری زۆر گرنگەوە لە یەك ئەچن، پێش ئەوە ئەم لەیەكچوونە و ئەم دووبارە باس بکەم پێم خۆشە بڕوای ئەرەستوو سەبارەت بە لایەنگری لە شێعر لە بەرامبەر هێرشی توندی ئەفلاتوونەوە بۆ سەر شێعر باس بکەم.

ئەرەستوو ئەڵێ: «شێعر بە هیچ بارێك درۆی زیانئاوەر نییە. شێعر هەر باسی ژیانی خەڵکە، هەر حەقیقەتە، بەڵام لە روانگەیەکی بەرزترەوە. شێعر خەڵك یا رووداوەکان وەها کە هەن و بەرچاو ئەکەون باس ناکا؛ بەڵکوو وەهایان باس ئەکا کە ئەکرا بین.» یا ئەبێ بین. ئەرەستوو بەم چەشنە بەرگرینامەکەی لە راسپێری کۆمەڵایەتی شێعر درێژە ئەدا و ئەڵێ: «شێعر لە مێژوو پتر باری فەلسەفی تێدایە و زۆرتر لە مێژوو شیاوی شیکردنەوەیە.»

تا بەرنامەیەکی تر کە دیسانەوە لەسەر باسەکە ئەڕۆین، بە خواتان لەسپێرین.

# شاعیر و حەقیقەت و واقعییەت

سەلام لە گوێگری خۆشەویستی بەرنامەی تاپۆ.

لە بەرنامەی پێشوودا بەشێکمان لە نووسراوێکی ستانفۆرد پێشکەش کردن بە ناوی حەقیقەتی شاعیرانە و حەقیقەتی زانستی. کورتەی بەرنامەی پێشوومان ئەمە بوو کە سەبارەت بە کاری شاعیران و ڕادەی تەئسیریان لە سەر کۆمەڵ، بڕوای جۆربەجۆر دەربڕاوە. فەلاسەفە و زانایان لە ڕۆژگارانی زوووە تاقمی شاعیریان بە باشی نەهاتۆتە بەرچاو. تاوانباریان کردوون بە درۆو یا لانی کەم کوتوویانە لێکدانەوەی شاعیرانە

دوورە لە راستەقینەی ژیان. باسی ئەفلاتوونمان کرد کە بە شاعیران ئەڵێ درۆزنانی زیانگەیێن و هەر وەها باسی دیفاعیەی ئەرەستووشمان کرد لە شێعر و کوتمان کە ئەرەستوو، پسپۆڕو بلیمەتی جیهانی کۆن لە بەرگری‌نامەکەیا ئەڵێ شێعر لە مێژووی نووسراو زیاتر لە فەلسەفە نزیکە. هەڵبەت ئەم قسەی ئەرەستوو هەمیشە بۆتە مایەی دڵمەندبوونی مێژوونووسانی زانستی. مێژوونووسی زانستی مەبەست لەو کەسانەیە کە بە بارێکی زانستییەوە سەیری مێژوویان کردووە و عیللەت و مەعلولی رووداوە مێژوویەکانیان هەڵسانگاندووە و تەنیا بە نووسینی وەقایع و رووداوەکان، بێ لێکدانەوە و بردنەوەسەریەکی هۆو هەل و هەڵکەوتەکان، بەسیان نەکردووە. لەم مێژوونووسانە ئەتوانین ناوی توسیدید و گیبۆن بەرین. لام وایە کە ئەو بناغەیە وا ئەرەستوو بە هەڵیەوە دایرشت رووکارەکەی لێکدانەوەی «جوانی‌ناسان» واتە عالمانی عیلمی جەماڵ لە دە ساڵەی دوایی سەدەی نۆزدەدا پێکئەهێنێ. ئۆسکار وایلد لە نووسراوێکیا ئەنووسێ: «هونەر، بەرزی و تەواوی خۆی لە ناو خۆیا دەس ئەکەوێ. نە وەك لە جیهانی دەرەوەدا. هونەر نابێ بە تەرازووی وێچوون و شەباهەت لەگەڵ شتی دەرەوەدا هەڵسەنگێترێ. هونەر گوڵی وەهای هەیە لە هیچ جەنگەڵێکا دەس ناکەوێ، باڵداری وەهای تێدایە کە لە هیچ باغ و گوڵزارێکا نییە، هونەر بە هەزاران جیهان دروست ئەکا و ئەیرووخێنێ و ئەتوانێ مانگ بە دەزوویەکی سوور بە ئاسمانەوە هەڵواسێ.»

هەڵبەت ئەم واتەیە لەگەڵ بڕوای ئەرەستوو جیاوازی هەیە؛ بەڵام سەیر ئەمەیە کە هەم ئەرەستوو و هەم ئۆسکاروایلد لە سەر ئەم مەبەستە پێکهاتوون کە شێعر هەرێمێکی سەربەخۆیە نە موستەعمەرەی شۆڕش‌کردوو و جیاوازی‌خوازی مێژوو یا زانست.

بەرامبەر کردنی شێعر و مێژوو لە لایەن ئەرەستووەوە منی هێنا سەر ئەو بیرە کە

لایەنێکی تریش هەڵدەم لەو بڕوایە کە لە پێشدا کوتم. زانایان قسەی شاعیران بە درۆ نەزانن، تاقمێکی زۆر لە زانایانی دێرینەناسی هەوڵیان داوە راستەقینەی مێژوویی لە پەڕاوە حەماسییەکانی جیهانی کۆن وەك ئیلیاد و ئۆدیسە شوێنەواری هۆمێری یونانیا بدۆزنەوە. وایان داناوە کە پیاو نەتوانێ لەو پەڕاوانەدا بە ناشکرا ئەوەی وا رووداوی مێژوویییە لەگەڵ ئەوەی ئەفسانەیە لەیەك جیاکاتەوە. لام وایە ئەو تاقمە زانا و دێرینەناسانە کاریان بە سەر شوێنەواری شاعیرانی وەك بلیك، مایتس، دانتە یا لویس کارۆڵەوە نییە و مەبەستیان ئەو پەڕاوە شیعرییانەیە کە نیوەمێژوویین وەك کتێبی ژولیوس سزار نووسراوی شکسپیر.

هۆمێر شاعیری گەورەی یۆنانی لە جلدی دووهەمی پەڕاوی ئیلیادا قایمەیەکی دوور و درێژی هێناوە لە فەرماندەرانی یۆنانی شاری ترۆوا لەگەڵ ناوی ئەو دەریایانە کە پێیدا هاتوون و ژمارەی کەشتییەکانیان. هەڵبەت ئەو وێژەوانانە کە لە هەرێمی مێژوویشا ئەیانەوێ لێکۆڵینەوەیان هەبێ، مافیان هەیە ئەو قایمەی «هۆمێر»، بە ناوی بەڵگەیەکی مێژوویی بە دەستەوە گرن و بیانەوێ لە بارەی ژیانی ئەو کاتەی ترۆوادا یا باری ژیانی پێنسەد ساڵ لێرەوبەری سەرزەوی مالسیا بە هۆی نووسراوەکانی شکسپیرەوە بزانن، بەڵام ئەبێ ئەمەش بڵێم کە ئەگونجێ ئەو بەڵگانە بە تەواوی نادروست و سەرشێوێن بن، بە تایبەت لە بارەی ئامار و ژمارەوە. چونکە لەگەڵ ئەوەشا کە شاعیر لە راستەقینەیەکی دەرەوە ئیلهام وەرئەگرێ و ئەسڵ و مایەی داستان و سووژەکەی لە سەر واقیعەت دائەمەزرێنێ، بەڵام زۆر گوێ نادا تە وردبوونەوە لە ئامار و ژمارە و رەقەم. تەنانەت ناو و هەرێم بەو چەشنە کە ویستی زانایانە. شاعیر زۆرتر هەوڵ ئەدا وشەی بە ئاهەنگ و مووسیقا هەڵبژێری. بۆ نموونە کاتێ ناوێك بە لایەوە جوان نەبوو یا هەرێمێك خاوەنی وشەی ناقولا و لە سەر زمان گران بوو، ئەیگۆڕێ. واتە فۆرم و قالب و وشە زیاتر بەلای شاعیرەوە گرنگە تا ناوەرۆکی راستەقینە. بۆ نموونەی

دیـسانەوە تووشی هەڵەیەکی تر نەبین و وا نەزانرێ کە منیش شاعیران بە درۆزن دائەنێم و مەبەستم لەوە کە شاعیر دیوی دەرەوەی وتاری بەلاوە گرنگترە، گوایە ئەوەیە کە لە وتاری شاعیرا حەقیقەت نابینرێ، باشترە نموونەیەك بهێنمەوە و مەبەستەکە روون بکەمەوە.

شـاعیـر رووداوێکی مێژوویی کە لە سـەردەمی شـەڕی سـەلیبا هەڵکەوتـووە ئەگێڕێتـەوە. ریچاردی شێردڵ و سـەلاحەددینی ئەییووبی بەشی هەرە گەورەی ئەو رووداوەن. یانی داسـتانەکە لە سـەر ئەوان ئەگەڕێ. شـاعیر ئەو دوو ناوە ناگۆڕێ، بەڵام ئەتوانێ چەشنی رووداوەکە بگۆڕێ. ژمارەی سـپای سـەلیبی و مـسوڵمانەکان کەم و زۆر بکا. هەرێمەکەی وا شـەڕ لەوێ قەوماوە بگۆڕێ، وتووێژەکان بگۆڕێ و زۆرشـتی تر. چونکە هەر وەك لە پێشا لە زمانی ئەرەستۆوە کوتمان شاعیـر رووداوەکان وەك هەن باس ناکا، بە چەشنێ کە ئەکرا و ئەشیا بین، باسیان ئەکا. دەیجا ئاشکرایە، ئەکرا سـەلیبی سـەرکەوتایەن، ئەکرا باری ژیان لە ئورووپای ئەوکاتەدا چەشنێك بوایە کە کلیـسا دەستی ئەوەندە ئەڕۆیشتبایە کە زۆربەی کۆمەڵی ئورووپا بخەڵەتێنن و شـایانی وڵاتە ئورووپاییـەکان بە هـیوای وڵاتگـرتن و تـاڵان، هـان دا بۆ لـەشـکـەرکێـشـان. ئـەکـرا سـەلاحەددین ئەوەندە بەهێز نەبوایە کە سـەلیبیەکان شکـست بدا؛ تەنانەت لە روانگـەی شاعیرێکی ئورووپاییـەوە کە پێوەند و دڵبەستراوی هەیە بە گەلەکەیەوە، باشـتر بوو وەها نەبوایە. باشتر بوو لەو شەڕەدا ئورووپا سـەربکەوتایە و زانیاری شەرق زووتر لـە غـەربا پەرەگر بوایە.

نموونەیەکی تر لەوەیکە شاعیر بۆ پاراسـتنی مووسیقا و ئاهـەنگی فۆرم، ژمارە و ئەرقامی ریازی ئەکاتە قوربانی. زانایەکی میکانیك و فیزیك کاتێ باسـی کەشتیـەك ئەکا کە «٣٠» پێی لە ناو ئاودایە و «١٢٠» پێی لە دەرەوە و بە سـەر ئاوەکەوەیە مـەبەسـتێکی فیزیکی هەیە و ئەڕوانێتە سـەر قانوونی فیزیکی، چونکە ئەگـەر ژمارەی «٣٠» و «١٢٠» ئەبێ لە باری فیزیکییەوە ئەگونجێ کەشتیـەکە نوقم بێ یا لە بەرامبەر تۆفان و شـەپۆلی

دەریادا باش ڕانەوەستێ. بەڵام شکسپیر لە نووسراوەکەیا بە ناوی تۆفان کاتێ بە ئاریل ئەڵێ باوکت سی پێی تەواو لە دەریا چۆتە خوارەوە مەبەستێکی ڕیازی نییە و ڕەنگە هەر ئەشزانی کە ئەگونجێ ئادەمیزاد لە قووڵایی سی‌پێدا تووشی قورساییەکی لە ڕادەبەدەر بێت. شکسپیر وشەی «سی» هەڵبژاردووە، چونکو بەلایەوە لە بیست و چل مووسیقای زیاترە. هەر وەها ییتس yeats لە شێعری I nis free (ئای‌نیس فری)دا بێگومان لە بەر مووسیقای کەلام و ئاهەنگی خۆشی وشەی ٩ ئەڵێ: لەوێ نۆ ڕیز لووبیا ئەچێنم و پلوورێك ساز ئەکەم بۆ هەنگەکانم. بۆچی «ییتس»ی شاعیر نەیکوتوە ١٣ ڕیز لوبیا و دوو پلوور؟ بێگومان لە بەر ناباری وشەی ١٣ و دوو. ئەگەر ئەو شێعرانە هی شاعیرانی سەردەمە کۆنەکان بێ وەك سافۆ یا ئەناکرئۆن Anakron و یۆنانی دێرینەناسی بە ناوی ڕاستەقینە ناچار ئەو ژمارە و ڕەقەمانەیان وەرئەگرت و بێگومان لە ڕابردووی ڕاستەقینەی مێژوویدا تووشی هەڵە ئەبوون. ئەمە بوو کە لە پێشا کوتم نابێ چاوەڕوان بکرێ کە شاعیر خۆی بە تەواوی واقعییەتەوە ببەستێتەوە. شتێکی تر، چۆنە کورتی کەمەوە و بڵێم کە شاعیر حەقیقەت ئەڵێ، بەڵام حەقیقەتێکی بێ واقعییەت؛ کەمتر وا ئەبێ کە حەقیقەت و واقعییەت لە شێعرا یەکتر بگرنەوە. هەڵبەت ئەم لێکدانەوەی من کاتێ دروستە کە ئێوەش لە مانای حەقیقەت و واقعییەتا بڕواتان بڕوای من بێ. من واقعییەت بەو شتانە ئەڵێم کە ئێستە وجوودی واقعی و بەرچاویان هەیە؛ وەك سەختی و زبری بەرد یا کەم‌نرخی ئەوین لە چاو سەردەمانی پێشوو. بەڵام حەقیقەتی بەرد تەنیا زبری و سەختییەکەی نییە و کەم‌نرخی ئەوین بە لای منەوە باش نییە، واتە حەقیقەت نییە لە کاتێکا واقعییەتە، لەوەی کە کوتم باش نییە شتێکی تریشم بە بیرا هات بۆ مانای واقعییەت و حەقیقەت؛ واقعییەت ئەو شتەیە کە ئێستە هەیە. چ باش بێ، چ خراپ. چ جوان بێ، چ دزێو. حەقیقەت ئەگونجێ ئێستە نەبێ، بەڵام ئەگەر هەبوو جوانە؛ئەوپەڕی پاکی و باشییە. باشی لە ڕاستیا مانایەکی ترە لە حەقیقەت. واقعییەت ئەمەیە کە هەژاری و برسییەتی و شەڕ لە جیهانا هەیە. بەڵام ئاخۆ ئەوانە بۆ هەمیشە

پێویستن؟ حەقیقەت ئەمەیە کە نەخێر پێویست نین!

تا بەرنامەیەکی تر کە دیسان لە سەر ئەم باسە ئەڕۆین بە خواتان ئەسپێرین.

# شیعر زیاتر لە فەلسەفە نیزیکە، هەتا مێژوو

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرستی بەرنامەی تاپۆ. لە بەرنامەی پێشوودا کوتمان کە حەقیقەت و راستەقینە لە روانگەی شاعیر و زاناوە جیاوازییان هەیە، بەڵام هیچکام لەم دوو لێکدانەوەیە، واتە لێکدانەوەی شاعیر سەبارەت بە حەقیقەت و لێکدانەوە و بڕوای زانا بەرامبەر بە راستەقینە، هەڵە نین. هەردووکیان بە پێی بڕوایان دەرك و تێگەیشتنێکیان هەیە. باسی بەرەنگاری زانایانمان کرد بەرامبەر بە شاعیران و کوتمان تاقمی زانا بە درێژایی مێژوو بەرهەڵستی شاعیران وەستاون و لایان

وابووە کە لێکدانەوەی شاعیر لە راستەقینە دوورە. ئەفلاتوونمان بە نموونە هێناوە و پاشان باسی ئەرەستوومان کرد کە یەکەم فیلسووف و زانایەك بووە ریزی بۆ شیعر داناوە و کوتوویەتی شیعر لە مێژوو زیاتر لە فەلسەفە نزیکە. بەڵام کوتمان نابێ چاوەڕوان بکرێ کە شیعر لە باری ئامار و ژمارەوە شتێکی لێ دەرکەوێ کە روونکەرەوەی راستەقینە و رووداوی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بێ. هەڵبەت ئەمە بەڵگە نییە بۆ ئەوە کە شیعر لە پایە و بناغەشدا کاری بەسەر راستەقینەوە نییە، بە پێچەوانە شیعر هەوێنی لە راستەقینە وەرئەگرێ، بەڵام راستەقینەی دەوروبەر و رووداوی رۆژانە و رابردوو لە دەروونی شاعیرا رەنگیان ئەگۆڕێ و بە تارای عاتیفە دائەپۆشرێن. لە بەرنامەی رابردوودا کوتمان کە شاعیر وەك زانا و ژمارەگەر نییە کە هەوڵ بدا وتەکانی مووبەموو، بێکەموزۆر لەگەڵ راستەقینەی دەرەوەدا بێتەوە. بۆ ئەو باسەش میسالێکمان هێناوە لە شیعری شاعیرێك کە ئەڵێ: ۹ ریز لۆبیا ئەچێنم. لە وێژەی خۆشمانا زۆر جار تووشی شتی وەها ئەبین. بۆ نموونە شاعیر بەژنی یاری بە دارێکی راست و بەرز تەشبیه ئەکا. لێرەدا راستەقینەیەك لە بەر چاوی شاعیرە، کە زانا کاری بەسەریەوە نییە. حەقیقەتی بەرزی و تەرزی بەژن و باری دڵدار، جا با ئەکرێ بەژنی هیچ ئافرەتێك بە ئەندازەی چنار و سەوڵ بەرز بێ. شاعیر بەرزی باڵای لە بەرچاوە ئەك ئەندازەی بەرزییەکە.

جا هەتا ئێرە هێشتا هەر باشترە و باسەکە باسی کەممی و چەندایەتییە. بەژنی یار بەرزە و سەوڵیش دارێکی بڵند و تەرزە. ئەمە تەشبیهی مەحسووسە بە مەحسووس. واتە لە یەکچواندنی دوو شتە کە هەست ئەکرێن و بەرچاو ئەکەون. هەم بەرزی دار دیارە و هەم بەرزی بەژنی دڵدار. بەڵام گاهێ هەڵئەکەوێ کە شتێکی مەعقوول بە شتێکی مەحسووس تەشبیه ئەکرێ یا پێچەوانەکەی. واتە تەشبیهی مەحسووس بە مەعقوول. لەم دوو جێگایەشدا چونکە یەکێ لە «موشەببەه» یا «موشەببەهونبیهی» هەست کراوە، کارەکە ساکارترە. شاعیر ئەڵێ: «رۆیشتنی ئاو بە ناو جۆبارا وەك تێپەڕینی

تەمەن ئەچێ.» تەشبیهی مەحسووسە بە مەعقوول. یا ئەڵێ: «خەم لە سەر دڵم خەرمانەی داوە»، تەشبیهی مەعقوول بە مەحسووسە. خەم بە چاو نابینرێ، بەڵام خەرمانەی دەوری مانگ کە دەوری ئەگرێ و تاریکی لەکا شتێکی بەرچاوە و هەست ئەکرێ.

لەو جێگایەدا تێگەیشتن کەمێك دژوار ئەبێ کە مەعقوول بە مەعقوول تەشبیە ئەکرێ؛ «حافز» ئەڵێ:

سلامی چو بوی خوش آشنایی

بدان مردم دیده روشنایی

بۆنی خۆشی ئاشنایی شتێك نییە بە لووت هەست کرێ و هەروەها سڵاویش نامەحسووس و هەستنەکراوە. گلێنەی چاوی رووناکایش تەعبیرێکی شاعیرانە و نامەحسووسە؛ گوایە رووناکایی چاوی هەیە و ئەو کەسەش وا «حافز» ئەچێتە سڵاوی، گلێنەی لەو چاوەیە. بڕوانن هونەری شاعیرانە چی کردووە. رووناکایی جگە لە پرشنگ و لوور شتێکی تری تێدا نییە؛ ئەزانین کە رووناکترین بەشی ئەندام چاوە، هەم رووناکە و هەم رووناککەرەوە؛ لە چاویشا گلێنە بەکارترین بەشە بۆ دیتن، واتە رووناککردنەوەی شت؛ جا ئەگەر لەشێك ئەڵێ رووناکایی بێ و لەو لەشەدا چاوێك هەبێ، بێگومان چاوەکە لە لەشەکە رووناکترە، واتە رووناکتر لە رووناکایی، جا گلێنەی ئەو چاوە ئەبێ چی بێ؟! رووناکتر و رووناککەرەوەتر لە چاوی رووناکایی!

دژایەتی زانا و شاعیر لەناو وێژەی فارسیشا زۆر بەرچاو ئەکەوێ و تازەترینیان لە لایەن ئەحمەدی کەسرەوییەوە بوو بەرامبەر بە شێعری شاعیرانی ئێران وەك حافز.

کەسرەوی پەڕاوێکی نووسیوە بە ناوی «حافظ چه می‌گوید؟» و لەو پەڕاوەدا رەخنەی سەیر و نارەوای گرتووە لە حافز. کارم بە سەر ئەمەوە نییە کە رەخنەی کەسرەوی لە شاعیران بەتایبەت لەو شاعیرانەی کە کاریان مەدح و پێهەڵکوتنە

ڕەخنەیەکی دروست و بەجێیە، بەڵام وا دەرنەکەوێ کەسرەوی هەر لە پایەوە بێگانەیە بەرامبەر بە ڕاسپێری شێعر و زۆر ورد نەبۆتەوە لە ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی شێعرەکانی حافز و خۆی لەم ڕاستەقینەیە نەگەیاندووە کە ئیستعارە و ئیماژ گاهێ بە گوێرەی باری کۆمەڵایەتی ناچارییە بۆ شاعیر. وا دیارە کەسرەوی لای وایە کە شاعیر یا هەر کەسێکی تر ئەوەی وا بەلایەوە دزێوە، ئەبێ بیڵێ و ئەگەر ترسی هەیە لە کوتن، باشترە هیچ نەڵێ و بە وتەی داپۆشراو ڕێگا لە خەڵك نەشێوێنێ. کەسرەوی لە ناو شاعیرانی ئێراندا فردەوسی پەسند ئەکا و ئەڵێ شێعرەکانی بۆ هاندانی دەماری نەتەوەپەرەستی بەکەڵکن. ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەگەر فردەوسی پاش بووژانەوەی دووبارەی هونەری ئێرانی نەهاتبایە و بارێکی سازاوی وەك دەرباری مەحموودی نەبوایە خوا عالم کە ئەیتوانی یا ئەیوێرا ئەم شێعرە هاندەرانە بڵێ یام نا؟! ئەگەر فردەوسی پاش هێرشی مەغول بهاتبایە و لە ناو گەلێکا بژیایە کە بڕوایان بە خۆیان لەدەس چووە و ترس دایگرتوون، ئاخۆ لە دەروونیا ئاگری نیشتمانپەرستی هەر بڵێسەی لەبوو یام نا؟

ئەزانین کە شاعیر بارهاتووی کۆمەڵ و شەرایتی کات و پێداویستی کۆمەڵ و مێژووە. بۆچی قەسیدە ئەگۆڕێ بە غەزەل؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ساکارە، ئەگەر بزانین قەسیدە هی کام سەردەمە و غەزەل لە چ کاتێکا پێش کەوتووە. لە بەرنامەی پێشوودا کوتمان کە گاهێ مێژووناس یا مێژوونووسی وێژەویست ناچار ئەبێ لەو پەڕاوە شێعرییانە کە سەبارەت بە ڕووداوێکی مێژوویی یا ئادەمیزادێکی مێژوویی نووسراون کەڵك وەربگرێ.

ئەو مێژوونووسانە تا چ ڕادەیەك ئەتوانن بڕوایان بەو پەڕاوە شێعرییانە هەبێ و پشت بەستن بەو نووسراوانەوە. ئەگەر ئەو پەڕاوانە نووسراوی شاعیرانی جیهانی کۆن بن وەك سافۆ و ئەناکیرئۆن بە دوو دەلیل ئەکرا مێژوونووسان کەڵکی لێ وەربگرن: یەکەمیان لەبەر ئەمە کە شاعیرانی پێشوو تا ئەم ڕادەیە کە ئێستە باو بووە ئیهازیان بە

داپۆشراوی و دوورکەوتنەوە لە هەرێمی راستەقینە و واقیعیات نەبووە، چونکە پێوەندی ژیان بەم هێندە پرپێچ و تەمچ و گرێوگۆڵ نەبووە، ئەمە دەلیلی یەکەم. دووهەمیش ئەمە کە ناچارە مێژوونووس لەم نووسراوە شێعریانە کەڵك وەربگرێ، چونکە بەڵگەی تری بە دەستەوە نییە. لەگەڵ ئەوەشا کەڵکەڵەی هەڵەکردن هەر ئەمێنێ.

تا بەرنامەیەکی تر کە دیسانەوە لەسەر ئەم باسە ئەڕۆین بەخواتان ئەسپێرم.

# کێشەی زانایان و شاعیران نەبەدییە

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ. لە دوو سێ بەرنامەی رابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە حەقیقەت لە روانگەی شاعیران و زانایانەوە جیاوازی هەیە و کوتمان کە زانایان زۆر لەمێژە لێکدانەوەی شاعیران و چەشنی روانینیان بۆ جیهانی حەقیقەت بە هەڵە ئەزانن. لە گزنۆفان و فیساغورس تا هیراکلیت و ئیفلاتوون و تا ئەمڕۆکە کێشەی نێوان زانا و شاعیر بەردەوامە. لێرەدا پرسیارێك هەیە: بۆچ زانایان دژایەتییان هەر لەگەڵ شاعیر هەیە و خۆیان لە بەشەکانی تری هونەر ناگەیەنن؟ لەبەرچی

ئارشیتێکتۆرێك یا پەیکەرساز و نەققاش و نووسەرێکی تاتر و تەنانەت دەورگێرێکی تاتر نەکەوتوونە بەر تەوس و توانجی زانایان؟ مەگەر ئەوانە هونەرمەند نین؟ چما کارەکەیان بە هانی عاتیفەوە نەبەستراوە؟ پرسیار ئەمەیە کە شیعر لە هەموو هونەرێك زیاتر، باری عاتیفی موتڵەقی هەیە. هونەرەکانی تر ئەکرێ لە روانگەی زانایانیشەوە سوودێکی دەسبەجێی بۆ کۆمەڵ هەبێ. کوتم دەسبەجێ چونکە لانی کەم نەققاشی زینەتە، پەیکەرسازیش هەروەها؛ جگەلەمە پەیکەرەسازی بۆ مێژوونووسان زۆر شتی بەکەڵکی لێ‌دەس‌کەوتووە، وەك چەشنی بەرگی کۆن، چەشنی خۆرازاندنەوەی ئافرەت و پیاوی مێژوویی. ئارشیتێکتیش چەشنی خانووبەرە سازکردن و سەرای گەورەیان قەڵای شەڕی سەردەمانی کۆنی لێ‌دەرئەکەوێ. ئارشیتێکت ئیستاش سوودی لێ‌وەرئەگیرێ و بۆ کۆمەڵ بەکەڵکە. تەنانەت مووسیقاش ئەگەر راسپێرییەکی تری نەبێ، لانی‌کەم ئەوەی هەیە کە ئارامیبەخشی گیان و گوێیە. بەڵام شیعر چی؟ شیعر لە روانگەی ئەو زانایانەوە کە دژی شیعرن، لیزگەی چەند وشەی لە راستی بە دوورە و هیچی تر و کەڵکی نییە بۆ کۆمەڵ. بەرپەرچی بروای ئەو زانایانە بەم‌جۆرە ئەدرێتەوە کە ئەو تاقمە هەر لە بناغەوە راسپێری هونەریان نەناسیوە. شیعر و هیچ هونەرێکی تر نابێ بەمەوە راوەستێ کە تەنیا جوان بێ. شیعر لەگەڵ جوانییا ئەبێ بەکەڵکیش بێ، بەڵام چۆن‌بەکەڵکییەك؟ وەها کە دۆزینەوەی هێزی کارەبا لە لایەن ئێدیسۆنەوە بەکەڵکە، چەشنی ئەو بەکەڵکییە کە لە فیزیك و میکانیك و شیمی و پزشکییا هەیە، ئەگەر هەر ئەوانە بن بەکەڵکی، ئەی فەننی حقووق، زانستی ئەخلاق، کۆمەڵناسی و سیاسەت و زۆر بەرهەمی بەکەڵکی تری مێشکی ئادەمیزاد چین؟!

ئاخۆ هەموو کۆششێکی ئادەمیزاد بۆ ئەوە نییە کە باش بژی و مرۆڤانە بژی؟ بەرەوپێش بچێ و بەرز بێتەوە؟ ئایا تێکنیکی پێشکەوتوو، بێ‌ناسینی فەلسەفە و مانای ژیان، ئاگرێك نییە بە دەس منداڵێکی نەفامەوە؟ ئەگەر ئەمەمان قەبووڵ کرد و شارەزای

مێژووی هونەریش بووین و زانیمان کام پێتەویستی کۆمەڵایەتی، هونەری بەدی هێناوە، ناچارین قەبوولْ بکەین کە شێعر بێ‌ئەوەویستی کەسێکی تایبەت، یا تەفەنونی شاعیرێکی دیاری‌کراو بێ، لە کۆمەڵ پەیدا بووە، هەروەك بەشەکانی تری هونەری جادوویی. شێعر باشتر لە ئەسر لەبەر ئەکرێ و لەبەر ئەمە باری هەڵگرتن و ئەفەوتانی زۆر مەبەست و رووداوی کۆمەڵایەتی و مێژووی خراوەتە ئەستۆی شێعر؛ بەتایبەت لە رۆژهەڵاتا شێعر زیاتر لە هەموو هونەرێکی تر پێشینەی خزمەتی کۆمەڵایەتی هەیە. ئەگەر گاهێك و لە سەردەمێکی کورتا بە هۆی بارێکی تایبەتی، سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە شێعر لە رێگای خزمەتی گشتی لای‌دابێ، ئەمە نابێتە مایەی بێ‌کەڵکی شێعر. ئاخۆ سەنعەت و زانست لە هەموو کاتێکا بەکەڵکە؟ تەنانەت ئەگەر بۆمبای ئەتۆمیش بێ و بەسەر خەڵکی بێ‌تاوانی هیرۆشیما و ناکازاکیشا بکەوێ؟ ئەتۆم ئەتوانێ لە خزمەتی ئادەمیزادا بێ و چارەی زۆر دەرد و ئەخۆشی و کەمایەتی بکا، لەکاتێکا تا ئێستا ئەتۆم وەها نەبووە و بۆ ئەم رێگایە کەڵکی زۆر لێ‌وەرنەگیراوە و ئەم مەبەستە نابێ بمانهێنێتە سەر ئەم بڕوایە کە گوایە زانستی فیزیك بێ‌کەڵك و زیانگەیێنە.

مەبەستێکی تریش کە پێویستە بۆپاکانەی شێعر لە لای زانایان، هەڵبەت ئەو زانایانە کە دژی شێعرن، بکوترێ، ئەمەیە کە شێعر و وێژەی پێش زانست هەستیان بە نیازی کۆمەڵی ئادەمیزاد کردووە و زۆر هەڵکەوتووە کە زانست بیری لە شتێك نەکردۆتەوە و بە لایەوە کارێکی نەگونجاو بووە، لەکاتێکا شێعر و وێژە لە خەیالْ و هاتیفەی شاعیرا تەسویری کردوون و رێگاوشوێنی بۆدامەزراندوون. زۆر نوستوورە و ئەفسانە هەن کە ئیختراعاتی زانستی هەزار سالْ پاش خۆیان پێشبینی کردووە. لە سەردەمی کۆنا فڕین بۆئادەمیزاد لە باری زانستییەوە نەگونجاو بووە و تاقیکاری زانایان ئەوەندە لەبووە کە تەنانەت ئاواتی فڕینیشیان هەبێ، بەڵام شاعیر و ئەفسانەوێژی کۆن لە جیهانی بەرینی هونەرا خۆی بە تاقیکاری کەموکورتی دەسکەوتی ئادەمیزادەوە نەبەستۆتەوە و ماوەی هەبووە تا بیر و خەیالْ لە وزەیاندا هەیە، بڕوا و ئاوات بخوازێ بۆ

هەڵفڕین و نموونە و میسالی ئوستوورەیی ساز بکا. قالیچەی سولەیمان، چەرخوفەلەکی پیرێژن لە ئەفسانەی کوردییا و ماشێتی فڕۆك لە داستانی دێدالووس daedalus دا پێشبینی کراوە و بۆتان روون ئەکاتەوە کە شاعیر و نووسەر سەرقافڵەی کاروانی پێشکەوتووی بەشەرییەت بوون. تەنانەت ئاریستۆفان لە پەڕاوێکی شێعریدا کە ناوی «بۆق»ە، شەڕی شیمیایی لە ڕێگای هەواوە پێشبینی کردووە و لووسین سەفەر بۆ مانگی باس کردووە. لە ئەفسانە کۆنەکانی یوونانا، کەسێك هەیە بەناوی ستانووس. کاتێ خەریکی مردن بوو، خوای بەیان لە لای زێئووس تکای بۆ کرد و تەمەنی هەمیشەیی پێ‌بەخشرا. ئەمەش نموونەیەکە هەزاران ساڵ لێرەوبەر لە وێژەدا هاتووە و تا ئەمڕۆش بەشەر نەیتوانیوە خۆی لە دەس مردن رزگار بکا؛ بەلام ئەگونجێ زانست رۆژێك ئەم ئاواتە بەدی‌بهێنێ. زانست، ئەویش زانستی فیزیك و میکانیك و پزشکی کە هیچ پێوەندێکیان بە زانستی کۆمەڵایەتییەوە نییە، هەر ئەوەندەیان لە دەس دێ، کە کەرەسەی ناسوودەیی و پێشکەوتی سەنعەتی بۆ ئادەمیزاد پێکبهێنێ....

کەڵك‌وەرگرتن لەو کەرەسانە لە هەرێمی زانستێکی ترا دیاری ئەکرێ، واتە زانستی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵناسی و ئەخلاق و فەلسەفە و ئەدەب زیاتریان بەیەکەوە پەیوەند هەیە تا لەگەڵ زانستی تێکنیکی. من ناچارم جارێکی تریش ئەم راستەقینە بخەمە بەرچاو کە بە داخەوە زۆرکەس لایان‌وایە شێعر تەنیا جوانی رووتە و هیچ راسپێرییەکی کۆمەڵایەتی نییە. ئەمە هەڵەیەکە کە تەنیا ئەو کەسانە تووشی ئەبن کە نایانەوێ ورد بنەوە لە ناوەڕۆکی شێعر و هێزی هاندەر و بەرەوپێش‌بەری لەم بەشەی هونەر. ئەم ریزە وتارە ئەتوانێ دەرگای وتووێژی ئێمە و ئێوە بکاتەوە و ئەگەر جگە لەمانە کە کوتوومانە شتێکی ترتان بە خەیاڵا دێ، یا رەخنەیەکتان هەیە، تکایە بۆمان بنووسن، بڕواتان بە ناوی خۆتان بڵاوئەکەینەوە و سپاستان ئەکەین.

تا بەرنامەیەکی تر کە دیسانەوە لە سەر ئەم باسە ئەڕۆین، بە خوای مەزنتان ئەسپێرین و چاوەڕوانی نامەتانین.

٥١/٥/٢١

# روانگەی جیاواز لە سەر حەقیقەت

ژن:

سەلام لە گوێگری بەڕێز و هونەر پەروەری بەرنامەی تاپۆ. لە دوو بەرنامەی ڕابوردوودا کوتمان حەقیقەتێ کە زانا ئەیزانێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو حەقیقەتە کە شاعیر ئەیبینێ و ئێستە لە سەر ئەم باسە ئەڕۆین.

پیاو:

فەرمووت ئەو حەقیقەتە وا زانا ئەیزانێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو حەقیقەتە کە

شاعیر ئەبینین. شتێکم کەوتەوە بیر کە پێوەندی بە باسەکەوە هەیە. داستانێکە سەبارەت بە یەکەم دیداری مەولانا جەلالەددین و شەمسی تەورێزی. پێش ئەوە کە جەلالەددین بچێتە ناو کۆڕی تەسەووف و عیرفانەوە، زۆرتر بە ناوی زانا ناو بانگی هەبوو. لە سەرتاسەری وڵاتە ئیسلامییەکانەوە ئەچوونە قوونیە و لە دەریای بێ بنی زانستی جەلالەددین تێراو ئەبوون. بە سەدان خوێندکار لە زانستگەیەکا کە جەلالەددین خۆی بە سەریا رانەگەیشت و دەرسیشی تێدا بە شاگردانی ئەگوت، خەریکی دەرس خوێندن بوون. وەك لە نووسراوەکان دەرئەکەوێ مەولانا پیاوێکی خانەدان و یەگجار دەوڵەمەند بووە. تەنانەت خەرجی ئەو زانا و خوێندکارانەش کە لە زانستگەکەیا بوون، خۆی لە ماڵ و سامانی خۆی داویەتی. شەمسی تەورێزی پیرە پیاوێکی خواناسی دڵ‌ڕووناك بووە کە وەك سۆفی و عارفەکانی تری ئەو سەردەمە بە وڵاتە ئیسلامییەکاندا گەڕاوە. هەڵبەت هەرکەسێ کە بۆ گەشت و دیتنی وڵاتان شار و وڵاتی خۆی بە جێ ئەهێڵێ، مەبەستێکی هەیە؛ یەکێك بۆ دیتنی هەرێمی تازە، یەکێك بۆ هەڵسەنگاندنی زانیاری وڵاتانی جۆر بە جۆر و ئەزانین کە لەو کاتەدا سنوور وەك ئێستە دابڕاو و دیاریکراو نەبوو کە دانیشتووی هەرێمێکی تایبەتی جوغرافیایی و سیاسی نەتوانێ بێ پرس‌کردن و ماوەوەرگرتن لە وڵاتی خۆی بچێتە دەرەوە؛ ئەمرۆ باری تایبەتی سیاسی پێداویستی بەم دیاری کردنی سنوورە هەیە کە لەو کاتەدا نەبووە. شەمسی تەورێزیش بێگومان سەرەڕۆی دوای مەبەستێك کەوتووە کە تەورێزی بە جێ هێشتووە و لە سنووری ئێران تێپەڕیوە و رووی کردۆتە وڵاتی رۆم. واتە تورکیەی ئێستا و ڕێگای کەوتۆتە شاری قوونیە کە جەلالەددین لەوێ بووە. رەنگە کێشەرێکی مەعنەوی شەمسی بردبێتە قونیە تا بە دیداری خۆی مەولانا بکاتە ئاگرێکی هەرگیز دانەمرکاو. شەمسی تەورێزی بە سەر و ڕیشی ئاڵۆزاو و بەرگی تۆزاوی ڕێگای دوور و درێژەوە ئەچێتە ئەو خوێندنگەیە کە مەولانا دەرسی لێ ئەڵێتەوە. لەو رۆژگارەدا بە پاڵ هەموو خوێندگەیەکی

ئاینییەوە مزگەوت هەبووە و جێگایەك بۆ خەوتن و حەسانەوەی گەشتیاران و ڕێبوارانی غەریب دروست کراوە. کامە ماڵ دەرگای بۆ غەریب ئاواڵەترە لە دەرگای ماڵی خودا و کامە خانەخوێ دڵاواترە لە خوایەك کە گیان ئەبەخشێ، چ بگا بە نان؟!

ژن:

شەمسی تەورێزی بە ڕواڵەتی هەژارانەوە ئەچێتە سەر ئەو گۆلە وا مەولانا لە کەناریا دانیشتووە و فەقێ و زانایان وەك پەپولەی دەوری شەم لێی کۆبوونەتەوە. هەرکام لەو زانایانە کە لە وڵات و شاری خۆیان مامۆستایەکن و ئێستە بە شانازییەوە بوون بە شاگردی مەولانا، پرسیارێك ئەکەن. یەکێك لە بارەی فەلسەفەوە، یەکێك سەبارەت بە مەنتیق، یەك حەدیس و ئەوی تر زانستی فەلەکیات.

پێویست ناکا بڵێم مەولانا لەباری زانستەوە چەند بە هێز بووە. ڕادەی زانستی ئەو پیاوە بەرزە بە شێعرەکانیا دەرئەکەوێ، باسی ئەتۆم لە شێعرێکیا بە ڕووناکی دێتە بەرچاو. مەولانا ئەڵێ:

آفـــتـــابـــی در دل ذره نــهـــان

وای اگـر آن ذره بـگـشـایـد دهـان

ذره ذره گـــردد افـــلاك و زمـــيـــن

گر کـه آن خورشـيـد بجهد از کـمين

لەو کاتەدا کە کۆڕی وتووێژی زانستی لە نێوان مامۆستا و شاگردەکانیا گەرمە، شەمسی تەورێزی دێ و لە سەر گۆلەکە دائەنیشێ و گوێ ئەگرێ بۆ قسەیان. پاش ماوەیەك لە مەولانا ئەپرسێ ئەم هەرایە لە سەر چییە و باسی چی ئەکەن. مەولانا کە لای وا ئەبێ لەگەڵ سۆفیلکەیەکا ڕووبەڕووە، بە تەوسەوە ئەڵێ: ئەمە زانستی «قال»ە تۆ تێی ناگەی. شەمس بێدەنگ ئەبێ و مامۆستا و شاگرد دەست ئەکەنەوە بە لێکۆڵینەوە و وتووێژ. لە پڕ شەمس دەست ئەداتە چەند پەڕاوێك و لە گۆلەکەیان ئەخا. مەولانا تووڕە ئەبێ و

گومانی نامێنێ کە ئەو پیاوە پیرە خەریە، شێتە. شەمس پاش ئەوە کتێبەکان ئەخووسێنێ دەس ئەبا و لە گۆلەکە ئەیانهێنێتە دەرەوە و لە یەکیان ئەدا تۆزیان لێ هەڵدەستێ. مەولانا و ئەوانی تر سەریان سوور ئەمێنێ و جەلالەددین ئەپرسێ ئەمە چ بوو ئەی دەروێش؟ شەمس لەسەرەخۆ وەڵام ئەداتەوە: ئەمە زانستی «حاڵ»ە و تۆ تێی ناگەی. شەمس ئەڕوا و مەولانا جەزبەی عیرفان ئەیگرێ و دەرس و خوێندگە ئەنێتە لاوە.

داستانێکی تریش سەبارەت بە زانین و دیتن. واتە عیلمی زیهنی و عەینی لە ئەبوو عەلی سینا و ئەبوو سەعیدی ئەبیلخەیر ئەگێڕنەوە. لە پەڕاوی مەقاماتی ئەبوو سەعید کە نووسراوی نەوەی ئەبووسەعیدە نووسراوە کە «شەیخوررەئیس» ئەبووعەلی سینا و شێخ ئەبوو سەعید یەکتریان چاو پێکەوت. سێ شەو و ڕۆژ تەنانەت کاتی خەویش لە یەك هەڵنەبڕان و لە ژوورەکەیان نەهاتنە دەرەوە. کاتێ لە یەك جیا بوونەوە لە ئەبوو سەعیدیان پرسی: ئەبووعەلیت چۆن وەبەر چاو هات؟ فەرمووی ئەوەی من ئەیبینم ئەو ئەیزانێ.

هەرئەو پرسیارە لە ئەبوو عەلیش کرا لە وەڵاما کوتی ئەوەی من ئەیزانم ئەو ئەیبینێ.

ئاخۆ جیاوازی هەیە لە ناو ئیلهامی عارفانە و شاعیرانەدا؟ ئاخۆ کەشف و شهوودی کە بۆ عارف هەیە بۆ شاعیریش نییە؟ ئایا هەر دووك لەو زانستانە واتە مەعریفەتی عارفانە و شاعیرانە هەر دووکیان سەرچاوەیان لە عاتیفەوە نییە؟ بەم چەشنە شاعیریش وەك عارف لە بەرامبەر زانادایە. هەر وەك زانایەك بە عارفێك ئەڵێ ئەمە عیلمی «قاڵ»ە تۆ تێی ناگەی، بە شاعیرێکیش ئەڵێ لێکدانەوەت لە حەقیقەت دوورە؛ لە کاتێکدا هەم شاعیر و هەم زانا ئەڕوانە سەر حەقیقەت. بەڵام هەر کام لە ڕوانگەیەکەوە. وەك دوو کەس کە لە دوو لاوە تەماشای چیایەك بکەن کە نساری بە دار

و دەوەنە و بەر رۆژی سیاسەنگ و رووتەن. یەکیان شینایی دار و درەخت ئەبینێ و ئەوی تریان رەقەن و وشکارۆ. هەردووك لەو دوو کەسانە یەك چیا ئەبینن، بەڵام هەرکام لە رووکاریکەوە.

لە شوێنەواری هۆمێر کەڵکی مێژوویی وەرگیراوە و بەناوی بەڵگەیەك بۆ ناسینی سەردەمی مایسنا ناسراوە؛ لە کاتێکا ئەو هەڵەیانە کە کوتمان ئەگونجێ سەر لە لێکۆڵەرانی مێژوویی بشێوێنێ و ئەو شتانە کە هۆمێر بۆ ئاهەنگ و وەزنی شێعر کوتوویە و تەنیا لە باری هونەرییەوە هەڵبژاردووە بە شتێکی راست و رەوانی مێژوویی ئەزانێ. شاعیر جگە لە عەناسوری سەوتی وەك: وەزن، ئاهەنگ و قافیە، سەرمەشقێکی تریشی هەیە کە ئەبێ لە بەر چاوی بگرێ، ئەویش پێوەندی هەیە بە لەگەڵ یەك هاتنەوەی تەواوی وشەکان لەگەڵ یەك. یەك وشەی ناحەز تێکرای شێعرەکە ناحەز ئەکا. وەك رەنگێکی ناشارەزایانە کە لە تابلۆیەکی نەققاشی درابێ، یا مێلۆدییەکی نەرم کە بۆ سەمفۆنییەکی حیماسی کرابێتە پێشەکی یا بەردێکی نەتاشراو لە خانووبەرەیەکی بە بەردی تاشراوی مەرمەر.

ژن:

لە بەرنامەیەکی ترا دیسانەوە لە سەر ئەم باسە ئەرۆین. تا ئەوکاتە بە خواتان ئەسپێرین.[١]

١٣٥١/٦/٨

١ - ئەم بەرنامەیە بە دووقۆڵی خوێندراوەتەوە.

# شار

سەلامێکی گەرم و گوڕو پڕبە دڵ پێشکەش بە گوێگری هۆگری هونەر و یستیاری هەبێتیاری بەرنامەی تاپۆ. تکایە لە سەرەتای بەرنامەکەماندا گوێ بگرن بۆ پارچە شێعرێك لە شوێنەواری نووسەری بەرنامەکە:

گوڵم! دڵم پڕە لە دەرد و کوڵ

دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت

دەڵێم بە جامێ ئاوی کانیاوی دێیەکەم

عەلاجی کەم

کوڵی دڵی پڕم، لە دەردی ئێنتزارەکەت!

وەڕەز بوو گیانی من لە شار و هارە هارەی ئەو

لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆش و تاو و یاوی شەو

دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت

لە شاری چاو لە بەر چرای نێتۆن شەوارەکەت
بڕۆمە دێ کە مانگە شەو بژێتە ناو بژەم
چلۆن بژیم لە شارەکەت کە پڕبە دڵ دژی گژمم.
لە شارەکەت کە رەمزی ئاسن و منارەیە
مەلی ئەوین غەوارەیە؛
دەڵێی لە دەوری دەست و پێم
ئەوەی کە تێل و تان و رایەڵە، کەڵەپچەیە
ئەوەی کە پەیکەرە میسالی داوڵە
ئەوەی کە دارەتێلە مەزهەری قەنارەیە!
لە شارەکەت کەمەندی دووکەڵە
کە دێتە دەر لە ماڵی دوڵمەمەند
وە تیشکی بێ گوناهی خۆرەتاو ئەخاتە بەند!
لە هەر شەقام و کووچەیەك شەپۆلی شینە دێ بەرەو دڵم
دەستی گەرمی ئاشنا نییە کە ئەیکوشم
دەستی چێوییە!
لە شارەکەت زەلیلە شێر،
باوی ڕێوییە!
بە هەر نیگایەکو پەتایەکە!
ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت گوڵم!
گوڵم هەرێمی زۆنگ و زەل
چۆن ئەبێتە جارە گوڵ؟
لە شاری تۆ

له بانی عەرشە قۆندەرەی دراو
شارەکەت، ئاسکە جوانەکەم
تەسکە بۆ ئەوین و بۆ خەفەت هەراو!
کێ لە شاری تۆ، لە شاری قاتڵی هەژار
گوێ ئەداتە ئایەتی پەڕاوی دڵ؟
منێ کە گۆچی تاوی گەرمی بەر دەوارەکەی عەشیرەتم
بە دارە تەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت
رانەهاتووە لەشم!
بناری پڕ بەهاری دێ
رەنگی سوور و شین ئەدا لە شیعر و عاتیفەی گەشم!

لاوێکی دێهاتی کە بەیانی رەنگاورەنگی بەهارانەی هەواری چیای بەرزی دیوە و هەمیشە چاوی بە روانگەی بەرین و راخراوی دەشتی بە گوڵ و گیا خەملیو راهاتووە، دێتە شار. کۆڵانی تەنگ و درێژ وەك تابووت لەشی ئازادی ئەو لاوە ئەگوشن. هەزاران بەندی رەسم و یاسا لە دەوری دەست و پێی هۆگری رزگاری ئەو ئەپێتە کەلەپچە. روالەتی شار جیاوازی هەیە لەگەڵ نیگای میهرەبانی دێ. لە شار ژیان چەشنی پیاز، هەموو تێکولە و کاکڵی نییە. روالەتی ژیان رازاوە و شکۆدار، بەڵام رەنگی ئەو ژیانە رەنگی دەسکرە. هەر وەك رەنگێ کە لێو و گونای ئافرەتانی شار سوور ئەکا. بەڵام لە دێ، هەموو شت سروشتییە. تەنانەت سوورایی نیوەرەنگی لێوی بزەتێزاوی کچێ کە لە ژێر گەرمای روانینی لاوێکی ئەویندارا شەونمی شەرم ئەکەوێتە سەر گوڵی گونای و خوێنی هەستی پاکی کچانە بە پێستی ئەرمی دەموچاویا ئەگەڕێ، رەنگێکی سروشتییە. لاوی دێ‌نشین بە هەزار هەودای ئاوریشمین بە رابردووی خۆیەوە بەستراوە، فێر نەبووە

کۆشکی دەنەهۆمی سەر لە ئاسمان بینێ و بۆ ئەوە تماشای بکا کڵاوی سەری بەرێتەوە.
لە دێ خانووبەرەی لار و کۆمی دیوە بەڵام هەنگاوی لاری لە رێگا لادەری نەدیوە...

لەو حاڵەدا دڵی ئەدا بە کچێك کە وەك گوڵی لەیلووپەڕی ئاوی لە ناو زەلکاوی شارا پشکووتووە. دوو هێزی کێشەر بۆ دوو لای جیاوازی ئەکێشن؛ هێزی ئەوین فەرمانی مانەوەی ئەداتێ لە شارێکا کە چەشنی پێڵاوی تەنگ پێی رێبواری ئەوین ئازار ئەدا و هێزی دەرچوون و رزگاربوون لە کەمەندی دووکەڵ و دراو و گەڕانەوەی بۆ دێ و دیسانەوە دەستەملانبوونەوەی پرەوەری خەیاڵووروژێنی هەست بزوێنی سەردەمی منالی و گەنجی لە لادێ و ئەم شێعرانە ئاکامی بەرەنگاری ئەو دوو هێزەن لە هەناوی لاوەکەدا و ئەبینین کە تەنانەت زەنجیری زێڕینی ئەوینیش پێی رەوەکی لاوەکە نابەستێ و ئەچێتەوە دێ کە رەنگی سوور و شینی بەهاری بنار لە عاتیفەی گەشی بدا.

تا بەرنامەی داهاتوو خواتان لەگەڵ ـ ١٣٥١/٦/١٥

# هونەرمەند ئەندازیاری کۆشکی ئاواتی گەلە

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرستی بەرنامەی تاپۆ.

تا ئەمڕۆ سەبارەت بە هونەر و هونەرمەندی زۆر قسە کراوە و بەسەدان سپارە و پەڕاو لە بارەی هونەرا نووسراوە و هەر نووسەر و لێکۆڵەرێك ویستوویەتی لە ڕوانگەی خۆیەوە سەیری هونەر بکا، بەڵام هەروەك شاعیری فارس ئەڵێ:

یك نکته بیش نیست غم عشق و این عجب

از هر زبان کە مى‌شنوم نامکرر است

باسی هونەریش هەر یەك باسە، هەر باسی جوانی و شکۆیە، بەڵام هەرکەس بە چەشنێ بە تانوپۆی هونەرا ئەچێ و لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە ئەڕوانێتە سەر جیهانی بژوێن و هەمیشە بەهاری هونەر. ئەڵێی هونەر کۆشکێکی بەرزە بە هەزار پەنجەرەوە کە هەرکام لەو پەنجەرانە بەرەو جیهانێکی جیاواز ئەکرێتەوە. جیهانێك بە جەنگەڵێکی کاتی پاییزەوە کە گەڵاڕێزان ڕووی تێکردووە و بە لوورەی هەر کزەبایەك، گەڵایەك بە

سەمای مەرگەوە بەرەو زەوی شۆڕ ئەبێتەوە. جیهانێك بە دەشتێکی بەگوڵ خەملیوەوە کە هەتا چاو بڕ ئەکا سەوز و سوور ئەکاتەوە، ئەڵێی دەشت کلکی تاوسە و چەتری ئەنگاوتووە و سەری ئەو تاوسەش چیایەکی بەرزە کە بە شانازییەوە بەرەو خۆرەتاو هەڵچووە.

بەڵێ هونەر ئەمەیە؛ بەڵام دیتنی ئەو جیهانە بۆ هەموو کەس دەس نادا، لە راستیا جیهانی هونەر لە گیان و هەستی هونەرمەندا خۆی ئەنوێنێ و هەناوێکی ساف و بێگەردی گەرەکە تا ببێتە ئاوێنەی هەستی هونەرمەندانە و ئەو جوانییانە کە لەبەر وردی و ناسکی بەرچاوی خەڵکی ئاسایی نایەن لەو ئاوێنەدا دەرکەون؛ لەگەڵ ئەوەشا هونەرمەند چێشکەیەکی پاراوی هەیە، هەر ئادەمیزادە و خاوەنی هەموو هێز و هەستێکی ئادەمیزادیە، هونەرمەند بە زرنی هونەر لەشی نەبۆتە پۆڵا. شکست و سەرکەوتنی هەیە، وەك خەڵکی تر تەنانەت شکستی لە خەڵك تاڵترە و سەرکەوتنی شیرینترە. هونەرمەند بێ ئەوین ناژی، وەك ماسی بێ ئاو هەڵناکا جا ئەو ئەوینە چ ئافرەت بێ، چ تەبیعەت، چ شتی شکۆداری تر، بەڵام هونەرمەندی بەڕاستی ناتوانێ تەریك بێ لە کۆمەڵ. گریانی کۆمەڵ فرمێسك دێنێتە سەر چاوی و پێکەنینی خەڵك لێوی ئەکاتە گوڵزاری هەزاران خونچەی تازە پشکوتوو. لاپەڕەی سپی هەناوی وەك ئاوێنە بە هەناسەیەك لێڵ ئەبێ و حەریری سپی هەستی بە هەموو پەڵەیەك ئەشەمزێ، جا لەبەر ئەمەیە کاتێ جیهان بە دڵی ئەو ئەسوورا، ئەکەوێتە پەلەقاژە، تەنگاوتیلکە ئەبێ و لێرەدایە کە ڕێگای شاعیران لەیەك جیا ئەبێتەوە.

هەندێ بە دیتنی یەکەم ناحەزی و تووش بوونی یەکەم شکست هەست ئەکەن ئیتر هەموو شت دوایی هاتووە و لەبەر ئەوە کە هەست بە بێ هێزی ئەکا دێتە سەر ئەو بڕوایە کە لە وزەیدا نیە بەگژ ناحەزی و ناباری ژیاندا بچێ و ناشتوانێ بێدەنگ دابنیشێ و هیچ نەڵێ، یا هۆگری ڕەشی و تاڵی و دزێوی بێ، خۆی کەنار ئەگرێ و خۆی

ئەدۆزێتەوە و گۆشەگیری ئەکاتە پیشە، تا بەواتەی خۆی لانی کەم ئەو لەم بازاڕە شێواوەی ژیانەدا سەرگەردان نەبێ و بەشێك لەو ناحەزیانە نەگرێتە ئەستۆ. هەندێکی تریش کاتێ چاویان بە ناحەزی و ئاڵۆزی ژیان کەوت لێ‌ئەبڕێن بەرەنگاری ناباری بوەستن و تا پێیان ئەکرێ بەرگری بکەن و هەوڵ بدەن بۆ پاراستنی جوانی و باشی، لە ڕاستیا هەردووکیان یانی هەم دەستەی یەکەم کە هیوابڕاوە و هەم تاقمی دووەمم کە لە تێکۆشاندایە ئەناڵێن. یەکەمیان شینی مردوویەك ئەگێڕێ کە ئیتر بە هیچ بارێك هیوای زیندووبوونەوەی نییە، دووەمیان هاوار ئەکا بۆ رزگارکردنی نەخۆشێك کە هێشتا زیندووە و ئەکرێ بە داو و دەرمان چاری بکرێ و بێتەوە ئادەمیزادێکی ساغ و لەش دروست.

شاعیر لەگەڵ خەڵکی ئاسایا تەنیا جیاوازی لەوەدا نییە کە جادووگەری بەدەسەڵاتی هەرێمی وتارە و ئەتوانێ بە تەردەستی و پسپۆری گەوهەری وشە بهۆنێتەوە، بەڵکوو گەورەترین جیاوازی ئەمەیە کە شاعیر بە هەستی تیژ و چاوی وردبینەوە زووتر هەست بە مەبەستی ژیان ئەکا و ئەزانێ کام کۆسپ و قۆرت و گرێ دێتە سەر ڕێگا. شاعیر نایێتە شاعیر تا لە پێش هەموو شتێکا نەبێتە کۆمەڵناس، نەبێتە نوێنگەی ئاواتی سەبێتی کۆمەڵ و مەکۆی زانیاری دوێنێی کۆمەڵ.

شاعیر بەتایبەت شاعیری ئەمڕۆکە ئیتر کۆت و بەندی پێداهەڵکوتن و شاباش‌وەرگرتن لە دەوری دەست و گەردنی نەماوە، ئەبێ سەربەخۆبێ لە بیرکردنەوە و هەستیا، لە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەیا. تا دوێنێ شاعیر ناچار بوو بۆ ژیان بە کەسێك هەڵبڵێ و بە شوێن کەسێکا بڕوا کە زۆر لە هونەر بێبەش بوو، هەڵبەت هەبوون شاعیرانی گەورەی وەك «ناسرخوسرەو» و «ئەبولەلا» و «ئەحمەدی خانی» کە گەوهەری وشەیان نەدەخستە بەرپێی ڕێزنەگر و قەدرنەناسان، بەڵام ئەو شاعیرانە لە کەمایەتیدا بوون لەوکاتەدا، بەڵام ئەمڕۆ شاعیر ئامانجێکی تازەی دۆزیوەتەوە و ڕاسپێرییەکی نوێی کەوتۆتە سەرشان. ڕاسپێری بۆ خەڵك‌ژیان و لە پێناوی مرۆڤایەتیا

مردن؛ شاعیری لەمرۆئەبێ شارەزا بێ بەم راستەقینەیە کە هەزارها گوێگر بە تاسەوە گوێیان لە وتاری ئەو گرتووەو شاعیر ناچارە لە ئاسایی بەرزتر بێتەوە، لە هەموو تێکۆشانێکا هەنگاوی یەکەم ئەو هەڵیگرێ، هەڵبەت ئەم راسپێرییە هی گشت ئەو کەسانەیە کە بە چەشنێ ئەبنە جێگای چاولێکردنی خەڵك و قسە و کردەوەیان لە ناو خەڵکا لایەنگری هەیە و رەوایە.

هونەرمەند ئەندازیاری کۆشکی ئاواتی بەیانی کۆمەڵە؛ رچەشکێن و هاندەر و رێ‌پیشاندەرە؛ شاعیریش کە هونەرمەندی هەرێمی وتارە، رازێنەرەوەی جیهانێکە کە ئەبێ کۆمەڵ بەرەو ئەو جیهانە بڕوا. خەڵکی ئاسایی بە کەنار هەزار دزێوی وناحەزییا بێ ئەوە سەرنج بدەن و ئەو ناحەزییانە هەست بکەن تێئەپەڕن، تەنیا شاعیرە کە ئەتوانێ گاهێ بە هەڕەشەی وشەی ترسێنەر و گاهێکیش بە هیوابزواندن و وتاری ئاگرین خەڵك تێگەیێنێ کە ئەوەی وا بێ‌دەربەست بە پەنایا رائەبوورن نابارییەکە کە تازە خەریکی ریشاژۆو سەرهەڵدانە و ئەگەر بژار نەکرێ بەیانی ئەبێتە کوسپێکی پڕمەترسی.

شاعیر نییە ئەو کەسە وا وشە لێزگە ئەکا. ئەو کەسە هەڵبەستچییە نەك شاعیر؛ شاعیر تا دەردێکی نەبێ، تا بڕوایەك لە دەروونیا نەبێ هەوێن و شەپۆل نەدا، شیعر ناڵێ؛ کاتێ دەرد ئەوەندە زۆر بوو کە ئیتر دڵ و سینگ و هەناو هەڵیەگرت، سەرڕێژ ئەکا. ئەم سێلاوە کە لە کۆبوونەوەی هەزاران سەرڕێژی بەربەندی دەرد پێکدێ، مەزرای هەژار و جووتیار ئەگەشێتەوە و ماڵی چەوسێنەرەوە خاپوور ئەکا؛ بێ‌گومان هەر دڵێ کە دەردی هەبێ ئەناڵێنێ، هەر زمانێ کە بلێسەی بەتینی دڵی تیبەربێ دێتە وتار و هەر وتارێ لە ناخی دڵی بە دەردەوە هەستێ، ئەنیشێتە سەر دڵی خەڵك. «لانك‌فلو» شاعیری ئامریکایی ئەڵێ: رۆژێك تیرێك لە کەوانێك دەرچوو بەرەو فەزای بێ‌بن، هیچ چاوێك نەیدی تیرەکە لە کوێ کەوتە خوارەوە، پاش ماوەیەك تیرەکەیان دۆزییەوە کە لە دارێکی بەڕوو هەڵچەقیوو، چونکە تیرەکە لە داری بەڕوو بوو؛ رۆژێك من ئاوازێکم لە ژێر

لێوەوە زمەزمەمە ئەکرد، ئاوازەکەم نیوەتەواو مایەوە، پاش ماوەیەك هەر ئەو ئاوازەم لە دەمی دۆستێك بیست لەو جێگایەوە کە من نیوەتەواوم هێشتبۆوە...

وتارێ کە راستی و جوانی بنوێنێ بێگومان لەسەر کۆمەڵ کار ئەکا. کە وەهایە بۆ ناسینی شاعیر لە پێشا بزانە کێ شێعری ئەخوێنێتەوە.

تا بەرنامەی داهاتوو بە خواتان ئەسپێرین. شەوباش.

١٣٥١/٦/٢٠

# ئاواتی پیرۆز

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ. تکایە لە پێشا گوێ بگرن بۆ پارچە پەخشانێك:

ماوەی نیوسەعات هەروا بێدەنگ دانیشتبوون و جار جار لە ژێر چاوەوە بۆ یەکتریان ڕوانیبوو، هەڵبەت وەها کە ئاشکرا نەبێ. هەر کات ئەم سەری داخستبوو ئەو چاوێکی بە چارەیا خشاندبوو. وا دیار بوو هەردووکیان لە دڵیانا بە خۆیان کوتبوو: وریا بە، هاوسەر گرتن و هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان کارێکی ساکار نییە. تەواو چاوت

بکەوە و باش بڕوانە دەم و چاوی، بەژن و باڵای. بەڵام هەر دووکیان لەم بیرە کە بە دڵیاندا هاتبوو شەرمەزار بوون و دیار بوو هەر دووکیان لە دڵیانا بە خۆیان کوتبوو بۆ مەگەر هاوسەرگرتن و هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان هەر بەوەی کە ڕواڵەت جوان بوو، پێکدێ؟ باشترە خوو و ڕەفتاری بزانم. بەڵام هەر دووکیان کاتێ گەیشتبوونە ئەم جێگایە دامابوون چونکە نەیانەزانی بە چ ڕێگایەکا...؟

باوك و دایکی کچەکە پاش ئەوە زۆر لە سەر مارەیی و جل و بەرگ و خشڵ و زێڕ و گوێ و گوارە و کرمەك و ژێرچەنە قسەیان کردبوو و کوڕەکە بە شەرمە هەموو شتێکی قبووڵ کردبوو، لە هۆدەکە چووبوونە دەرەوە، تا کوڕ و کچ بە یەکەوە قسە بکەن. خوا ئەزانێ شێرکۆ چەند جار لێبڕابوو ئەمە بڵێ و لە شەرما زمانی بەسترابوو و چەند دەسرەی بە ئارەق تەڕ کردبوو تا بە دەنگێکی نەرم و بە لەرزینەوە توانیبووی بڵێ من ئەبێ خۆم لەگەڵ «چرۆ» قسە بکەم و بزانم ئەویش ڕازییە یام نە. پاش ئەو چەند وشەیە قسەی تریشی کردبوو و کوتبووی من و چرۆ ئەمانەوێ بە یەکەوە بژین و ئەبێ ئەو بتوانێ لەگەڵما هەڵبکا و بتوانێ بە دڵ خۆشی بوێنم. بەڵام باوك و دایکی چرۆ، ئیتر گوێیان نەدابووە قسەکانی دوایی «شێرکۆ». تەماشایەکی یەکتریان کردبوو؛ وەك قسەیەکی سەیریان بیستبێ و هەر دووکیان لە دڵی خۆیانا کوتبوویان: یانی چی، چرۆ چ کارەیە، ئێمە داومانە و بڕاوەتەوە. بێگومان ئەم قسەیان لە دڵ گران هاتبوو کە زاوای داهاتوویان ئێستە هیچ نەبووە ئەیەوێ لەگەڵ کچەکەیان تەنیا بێ. شێرکۆ ئەمەی لە ڕواڵەتی خەسوو و خەزووری داهاتوویدا بەدی کردبوو، بەڵام ئیتر هێزی پاکانەی نەمابوو، چونکە هەموو وزەی خۆی بۆ دەربڕینی قسەکەی پێشوو لە دەس دابوو.

نیو سەعات بێدەنگ دانیشتبوون. تەنیا خشەی کراسی تازەی چرۆ جار جار هەوای کپی هۆدەکەی ئەلەراندەوە. ئەبوو شێرکۆ دەس بە قسە کردن بکا، بەڵام بڵێ چی. بیری کردەوە بڵێ ئەمڕۆ هەوایەکی خۆشی هەیە و ئەمە بکاتە سەرەتایەك بۆ وتووێژ،

بەڵام لەم بیرە هەم رقی هەستا و هەم پێکەنینی هات. رقی هەستا لە خۆی کە بۆچ خووی بێگانەی گرتووە، ئاخر ئەو لە فیلمی سینەما و لە نووسراوەکانی نووسەرانی رۆژاواییدا دیبووی و خوێندبوویەوە کە سەرەتای هەموو ئاشنابوونێك بەم جۆرەیە: ـ «هەوایەکی خۆشی هەیە، وا نییە؟» کچەکەش پێئەکەنێ و ئەڵێ: «بەڵێ زۆر خۆشە.» پاشان کورەکە ئەڵێ: «ئەهارێك لە فلان جێ بە مووسیقا و سەماوە؛ پێت چۆنە؟» کچەکە ئەڵێ: «باشە، زۆر باشە...» و ئیتر بوون بە ئاشنا و کاریان تەواوە، یا بەسەرهاتێکی تر دەس پێ ئەکا: ـ «ناوت چیە؟» «ئینابیلا، tresa یا ماری mary یا rose رۆز.» ـ «بەهـ بەهـ چ ناوێکی جوانە، بەڕاستی جوانە.» کچەکە ئەڵێ سپاس و زەردەیەك دێتە سەر لێوی. پاشان بانگ کردنە بۆ سەما و ئیتر کاریان تەواوە. ئەڵێی ساڵهایە یەکتر ئەناسن. بەم رقی لە خۆی هەستا و بەمەش پێکەنینی هات کە ئەگەر بڵێ هەوایەکی خۆشە، ئەو کچە ساکارە کوردە چ حاڵێکی بەسەرا دێ. بێگومان لە بەر خۆیەوە ئەڵێ مەگەر قسە نەمابوو کە باسی هەوا ئەکەی! ئێمە لە سەر دووڕێیانی ژیان وەستاوین و ئەبێ بە وردی و ژیری ڕێگایەکی ئەوتۆ هەڵبژێرین کە بگاتە ئاکامی بەختەوەری، کەچی ئەو باسی هەوا ئەکا.

شێرکۆ هەستی کردبوو کە لەمە زیاتر بێدەنگی بە لای چرۆوە مانایەکی باشی نابێ، چونکە سێ چوار جار دیبووی کە چرۆ چاو ئەبڕێتە چاوی و باری دانیشتنی ئەگۆڕێ و ئەڵێی لەم بێدەنگ دانیشتنە وەڕەز بووە. شێرکۆ کوتی: «چرۆ» و ئەو وەڵامی داوە: «بەڵێ!»

ـ «من و تۆ خەریکین دەست ئەدەینە گەورەترین کاری ژیانمان.»

چرۆ لە دەمی وەرگرتەوە: ـ «نا گەورەترین کار نییە، بەڵام گەورەیە. یانی زۆر کار هەیە لە بەختەوەری من و تۆ بانترە.»

ـ «کە وەهایە تۆ قەبووڵتە کە ئەم کارە بەختەوەری من و تۆی تێدایە.»

چرۆ بە چاوێکی پڕ سکالاوە سەیری شێرکۆی کرد و گوتی: «تۆ لات وا نییە من کچێکی ساکارم و تێناگەم ئەوین یانی چی؟ ئەگەر لات وا بێ هەم بێ ئینسافی و هەم بە هەڵە چووی.»

شێرکۆ لە تاسانی سەرەتای قسە کردن رزگاری هاتبوو و نەیتوانی بە زمردەی پیاوانە و روانینی گەرم هەستی خۆی دەربڕێ.

لە دەرەوە بایەکی بە تەزووی پایزی لە درزی دەرگا و پەنجەرەکانەوە خۆی بە ژووریدا ئەکرد و پەردەی ناو هۆدەکەی ئەلەراندەوە. ئەتکوت بێچوە پشیلەیەکی بزۆز خەریکی کایەکردنە بە پەردەکە.

شێرکۆ گوتی: «تۆ رازی؟»

چرۆ تەنیا بزەیەك گرتی و سەری دانەواند.

شێرکۆ گوتی: «بیری لێ بکە. ماڵێکی خۆش و خنجیلانە. کوڕ و کچی جوان!»

چرۆ لەبەر خۆیەوە گوتی:

ـ «ئاواتەکانت جوانن، بەڵام شکۆدار نین. تەنیا بۆ خۆم و خۆتە.»

شێرکۆ بە سەرلێشێواوی پرسی: «دەیجا» و نەیتوانی قسەکەی تەواو کا. چونکە نەیدەزانی چرۆ مەبەستی چییە.

چرۆ ئەوی لەم سەرسامییە رزگار کرد: «بەختەوەری کاتێ تەواوە کە بۆ هەموو کەس بێ. بە چاوی گەش و کوڵمی سوور و لێوی بە پێکەنینەوە چون بژین، کاتێ فرمێسك لە سەر گۆنــوانی هەزار چاو، سەما ئەکا و کوڵمی منالی دەردەدار وەك بەهێی زەرد وەهایە و لێوی بە باری هەژاران بەختەوەری تاکی من و تۆ ئەکاتە گەپجار؟! چۆن بێ دەربەست و سەرخۆش بە لای هەزاران کەمایەتیدا تێپەڕین، لە کاتێکا لە دەستمان نایە کارێکیان بۆ بکەین و نەمانکردووە!»

شێرکۆ لە ژێر لێوەوە گوتی ئەمەیە رازی مانەوەی ئادەمیزاد و بەرزتر گوتی:

«زەکاتی بەختەوەری دەسگیرۆیی هەژارانە. من و تۆش لەم سامانە خودا داوە زکاتی ئاتاجان نەدەین. ئەگەر بەختەوەر بین بەهێزترین بۆ یارمەتی خەڵك.»

چرۆ بە پێکەنینێك دەریخست کە دژی ئەو بڕوایەیە و کوتی: «بەڵام بە داخەوە بەختەوەران لە دەردەداران دوورن.»

شێرکۆ بە ناڵینەوە کوتی: «پێویست ناکا ئێمەش وەها بین. ئەگەر ئادەمیزاد هەر لە سەر باری پێشووی بڕوا، پێشکەوت مانای نابێ. چ دەبێ من و تۆ یەکەم رێبواری ئەم رێگایە بین؟»

چرۆ دەنگی نەکرد، بەڵام وەك ئەوە نەچوو بڵێ با وا بێ.

گوێگرانی بەڕێز: بەرنامەکەمان لێرەدا تەواو بوو. چاوەڕوانی نووسراوەکانتانین و تا بەرنامەی داهاتوو هەمووتان بە خودای مەزن ئەسپێرین و سەرکەوت و بەختەوەریتان بۆ داوا ئەکەین. شەوتان باش.

٥١/٧/٢

# چاوەڕوانی

سەلامێك لەم پایزەدا وەك گوڵێ كە مایتەوە لە بەر تاڵانی گەڵاڕیزان، پێشكەش بە ئێوە كە ژیان و هەرچی رازنەرموەی ژیانە خۆشتان ئەوێ. پێشكەش بە ئێوە كە بە هەست و هونەرپەرستن. لەم بەرنامەیەدا نموونەیەكی نوێتان لە داستانی كورتی كوردی پێشكەش ئەكەین و چاوەڕوانین ئێوەش بە ناردنی داستانی كورتی شوێنەواری خۆتان یا شوێنەواری نووسەرانی ناسراوی كورد یارمەتیمان بدەن.

لە دێوە ڕێگایەکی پان و ڕێك ئەچوو بۆ کەناری چۆم. سەرەتای ڕێگاکە لە خوار دێوە لە پاڵ ماڵی پوورە پیرۆزەوە دەستی پێ ئەکرد. لە پردێکی بچووك کە لە سەر بەندەکە هەڵبەسترابوو ئەپەڕیمەوە و ئەچوومە ناو ڕێگاکەوە. ئەم بەر و ئەو بەری ڕێگاکە بە ڕیز داری سپیدار و پەڵك و چنار بوو. سپیداری ئەستوور و گەڵا پان. پەڵکی لار و کۆم کە هەندێکیان گەندەڵ بیوون و لە جێگایەکەوە کە کرم لێی دابوون، کونی ورد و درشت، بەر چاو ئەکەوت. بارانێ کە باریبوو لەو کونانەوە، لە گەندەڵایی دارەکان زەلیبوو و ئاوێکی تاڵەی هەندێ سوور و هەندێ ڕەش لەو کونانەوە بە سەر لەشی دارەکانا هاتبووە خوارەوە، ئەتکوت پیرەمێردێکی کوردە کە لە تەنیایی و بێدەنگیا بە چاوی پڕووشڕ و کز گریاوە. چناری سەربەرز کە لە پەنا پەڵکەکانا ئەتکوت کوڕی گەنجی قیت و قۆزەکە پاڵ دەستی باوکی پیری نوشتاوەوەی، ڕاوەستاوە. پاش ڕیزی دارەکان لەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکەوە پەڵە وێنجەیەك بوو کە کاتی دروێنەی بەری سێهەمی هاتبوو. پرشنگی خۆرەتاوی ڕەنگ پەڕیوی ئێوارێ ئەتکوت داوێنی کراسی بووکێکی شۆخ و شەنگە لە پێچی کۆڵانێکا ئەدیو ئەبێ. نیوەی پەڵە وێنجەکان لە بەر نووری خۆرەتاوا تێکەڵ یەك بوون لە شینی مەیلەوزەرد و نیوەکەی تریان کە لالە سێبەری بەسەر کێشابوو شینێکی تاریك و بەرەو ڕەش بوو. یەکەمیان ئەتکوت چاوێکی مەڕییە کە گەشەی پێکەنینی تێکەڕاوە و بەشی دووهەمیان لە چاوێکی شین ئەچوو کە چاوەڕوانییەکی دوور و درێژ لێڵی کردبێ.

من هەموو ڕۆژێ کاتی ئێوارانە دائەکشام بۆ خوار دێ و لە لای ماڵی پوورە پیرۆزەوە تێئەپەڕیم و بە سەر پردەکەدا پێم دەنا ناو ڕێگا و ئەچوومە سەر چۆم. ئەوە کاری هەموو ڕۆژێکم بوو، بەڵام هەموو ڕۆژێش کە ئەگەیشتمە سەر پردەکە لە پێشا ئاوڕێکم ئەداوە بۆ ناو دێ و هەمیشە پوور پیرۆزم ئەدی کە لە ناو حەوشەکەیا دانیشتووە و چاوی بڕیوەتە ئاسۆی ئەوبەری چۆمەکە. چاوم کە لە دیمەنی تێکشکاوی پوور پیرۆز

ئەترازا نیگام بە ئاوی مەندی قەوزەگرتووی بەندەکە ئەکەوت کە بۆقی ورد و درشتی شین و خۆڵەمێشی بە سەر قەوزەکانییەوە خەریکی پشوودان بوون و ئەو پشوودانە تەنیا سێبەری مارێکی ئاوی تێکی ئەدا و بۆقەکان بە گورجی و کەمێك سەرشێواوی خۆیان ئەشاردەوە. پاشان کە ئەچوومە ناو رێگاکەوە پێش هەموو شت کونی دارپەڵکەکان سەرنجیان ئەدزیم. مناڵانی ئاوایی لایان وابوو لەشی پەلکەکان خوێنی تێدایە، چونکە ئەیاندی ئاوێکی خەستی نزیك بە سوور بەم کونانەدا دێتە خوارەوە و منیش نازانم چۆن بوو کە لە سەر پردەکە تا ئەگەیشتمە سەر کەندەڵانی چۆمەکە و چاوم بە ئاوی شینی گۆمی مەندی پڕ لە ماسی ئەکەوت؛ لەو نێوانەدا مناڵ ئەبوومەوە و ئەهاتمەوە سەر بڕوای مناڵانی ئاوایی. بڵێی خوێنی شەهیدێك بێ؟ بڵێی ئەم شەبایە کە گەڵا و لکی دارەکان ئەشەکێنێتەوە دەستێکی نادیاری پیرۆز بێ باوەشێنی ئەو شەهیدانە ئەکا؟!

بەڵام زوو ئەگەیشتمە سەر چۆمەکە و لەوێ دیمەنێکی تر بیری خاوێنی مناڵانەی لە مێشکم ئەتاراند.

لە مێژ بوو پێوە بووم دەرفەتێك بدۆزمەوە و لەگەڵ پوورە پیرۆز قسە بکەم. هەندێ شتم لە خەڵکی ئاواییەکە بیستبوو و لە باتی وەسوەسەم دامرکێنێ زیاتر هانی دابووم بۆ ئەوە لەگەڵ خۆی بدوێم. ئەو رۆژەش وەك رۆژانی دیکە، من چووبوومە سەر چۆم. ماسییەکان لەو بەشەی گۆمەکەدا کە ئەکەوتبووە ژێر سێبەری دارەبی کەناری چۆمەکە و تاویشی بە سەر ئەکشابوو لە هات‌وچۆدا بوون. گاهێ بەر زگی زەردیان وەدەرئەخست و لەو کاتەدا ئەتکوت گۆمەکە ئەبێ بە زارێك کە بە زەردەیەك لە یەك ئەبێتەوە و پرشنگی ددانی رێك و جوانی دەرئەکەوێ. من زیخێکی وردم ئەهاویشتە ناویان و کۆڕی ئەوینداڕانەیانم ئەشێواند. ماسییەکان تێکڕا ئەهاتنەوە سەر زگ و بە بزوتنەوەیەکی بەپەلە کە لە باڵەیەکی توند ئەچوو، بڵاوەیان ئەکرد و لەیەك جیا ئەبوونەوە، ئەتکوت لە پڕ چرای هۆدەیەك کز ئەکەی. لە گۆمەکەدا تەنیا پرشنگی نیوەرەنگی

خۆرەتاوی ئێواریّ ئەمایەوە.

هەستم کرد یەکێك لە پالّ دەستما دانیشت. ئەوەندە بە ئەسپایی کە ئەگەر دەنگی نەکردبایە، لام وا نەبوو هەستم بە هەڵە چووە و لە تێکەڵبوولی سنووری سێبەری خۆرەتاو کە ئێوارانە لە ناو گژوگیای رەنگاورەنگی دەشتی ئاوایا هەر دێ و دەسەڵاتی تاریکی زۆرتر ئەبێ و خۆرەتاو پاشەکشە ئەکا، لام وانەبوو پنجەگیایەکی زەرد و بەرز لە پێشا لە ژێر نووری خۆرەتاوا بووە و ئێستە وەك سەنگەرەکانی تری خۆرەتاو تاریکی مۆنی ئێوارانە گرتوویەتی. بەڵام دەنگێك هاتە گوێم کە ئەڵێ: «میرزا!» دەنگی ئافرەتێکی پیر بوو. لە دەنگێك ئەچوو زۆر لە دوورەوە هەرات لێبکا و تۆ هەر ئەوەندە تێگەی لەگەڵ تۆیەتی، بەڵام نەزانی کێیە. کەمێك وەرسووڕام. دیمەنی پەڕپووتی پوور پیرۆزم ناسییەوە. لام سەیر بوو کە ناوی من لە کوێ ئەزانێ. خەڵك ئەیانکوت دە ساڵە پوورە پیرۆز تەنانەت یەك وشەش لە دەمی دەرنەهاتووە. من هێشتا سەرسام بووم کە پوور پیرۆز هاتە قسە. لە کاتێکا دەمی لەگەڵ گوێم لە مترێك زۆرتر نێوانی نەبوو، هەستم کرد لە ئاسۆی ئەوبەرەوە کەسێك قسەم لەگەڵ ئەکا. باش نەمدەزانی کە پوور پیرۆز لای منە یا لەو سەر ئاسۆیەیە کە چاوی کزی تێبڕیوە. نەمدەزانی قسە بۆ من ئەکا یا بۆ ئەو کەسە کە دە ساڵ لێرەوبەر لەو تیرەگە سەرکەوت و ئیتر نەگەڕایەوە.

ـ «... بەڵێ میرزا. ئاغا کردیە سەرمان کە بچێ بۆ دێی ئەوبەری ئەم کێوە و لەوێ هێلکە و مریشك بکڕێ بۆ میوانەکانی ئاغا. نەخۆش بوو. لەشی وەك برێشکەی سەر سێڵ لە چەق‌وچۆدابوو. ددانی ددانی نەدەگرت. پێش ئەوە گزیری ئاغا بێتە سەرمان بە چەند لێفەی گەرم داپۆشیبوو. تەندوورەکەشم بۆ ئێلّ دابوو. ئازانی لەو رۆژە چ توف و سەرمایەك بوو. تەت هەڵاویشتبایە لە حەوا دەیبەست. گزیری ئاغا هات و کوتی، ئەبێ زوو بڕوا و زوو بگەڕێتەوە. من کوتم، نەخۆشە و چەق و چۆیەتی. ناتوانێ بچێ. گزیری ئاغا کوتی، چارە نییە، فەرمانی ئاغایە، میوانی هەیە. من لە بەری

پاڕامەوە، داوێنیم بادا، بە سەر دەست و پێیدا کەوتم وەرینەگرت. بەم حاڵەوە هەستا و ڕۆیشت. لالایم گاتێ، پووزەوانەکانی دڕابوون، کاڵەی شڕی لە پێدا بوو. کاتێ گەیشتە سەر ئەم پردەی بەر ماڵی خۆمان ئیتر لە بەر چاوم گوم بوو. کرێوە بە باوە ئەیهێنا و ئەبوو بە دیوارێکی سپی و بەرچاوی ڕێبواری ئەگرت. ئەو ڕۆژە دە زستانی بە سەرا هاتووە و من چاوم لەم ئاسۆیەیە کەی ئەگەڕێتەوە. دڵنیام ئەگەڕێتەوە. ئەو منی خۆش دەوێ. دایکی پیر و لێقەوماوی خۆی خۆش ئەوێ.»

پوورە پیرۆز بێدەنگ بوو و من گریانم پێ بچووك بوو. لەم کاتەدا بۆ دەربڕینی هەستم، تەنیا چاوم بەم دەم و چاوی پڕ چرچ و گنجەدا خشاند کە هەر خەمێ شوێنێکی لە سەر دانابوو. لە زارم دەرپەڕی: «نا نا، هەڵنا گرێ!» بەڵام دیتم بۆچ ئەو هەڵیەگرێ! لە بێ هێزییا ڕووم کردەوە کاتی ماڵی. بڵێی ئەم دارانە شەهید نەبن و ئەم خوێنانە خوێنی پاکیان لەبێ بە سەریانەوە دیارە؟!

ڕۆژ ئاوا ببوو. پوورە پیرۆز چۆن وەك پەڕێك با یهێنی هاتبوو، چەشنی خەمێك کە شەقڵێکی تاڵ لە ناوی بەرێ، لە لام ڕۆیشتبوو. کۆشکی ئاغا هێشتا تاوی لێ ئاوا نەبوو کە بە چەن چرای تۆڕنوورباران کرابوو و ئەمە قسەی دوایی من بوو: «بڵێی لەم کۆشکانەش، ڕۆژێك خۆرەتاو نەتۆرێ؟!»

۵۱/۷/۵

# بیرەوەری

پاش چەند ساڵ ئەوم لە ئیستگەی قەتار چاو پێکەوتەوە. جانتایەکی بە دەستەوە بوو، ئەچوو بۆ شوێنی بلیت‌کڕین. هەیکەلی وردیلانەی و روومەتی لاوازی سەرنجی راتەکێشا؛ ئیتر مووی تەواو ماش‌وبرینجی بوو و لە دوو لای ناوچاوانیەوە مووی سەری هەڵوەریبوو. دەورو پشتی چاوی، گنجی ورد و باریك چەشنی نیزە هێرشیان بۆ چاوی بردبوو، کە ئەتکوت شوێنی کێلگەیە. کاتێ پێتەکەنی گنجەکانی دەوری چاوی قووڵتر ئەبوو و پیرتر ئەهاتە بەرچاو. وەك ماسیەك کە بکەوێتە سەر زیخی بەستێن، بێ ئارام

بوو. لە مەیدانی ئیستگە بە پەلە هاتوچۆی ئەکرد و لەگەڵ کابرایەکا قسەی ئەکرد. ئەم بزۆزی و ئەسرەوتوویییە بۆ من نەناسراو نەبوو. هاتەوە بیرم کە هەمیشە زوو دانووی لەگەڵ خەڵکا ئەکولا. هەرکەس قسەی لەگەڵ بکردایە، پاش چەند جار بۆ لای ئەکێشرا. لەگەڵ هەرکەسێکا ئەبوو بە ئاشنا، پێش ئەوە باش بیناسێ، دەستی ئەکرد بە دەردی‌دڵ. ئەیکوت: «خەریکم هاورێیەك بدۆزمەوە و لەگەڵیا هەڵێم.» ئەگەر کەسێك لێی پرسیایە بۆ کوێ؟ خێرا تووڕە ئەبوو. ئەو رۆژە کە چاوم پێی‌کەوت لە خەیاڵا گەرامەوە بۆ رابردوو. لە گەڕەکێکا ئەژیاین. ماڵیان نزیکی ماڵمان بوو. پاش‌نیوەڕۆیانە ئەمدی بە باوەشێ کتێبەوە لە ماڵ ئەچووەدەر؛ جار جارەش بە بەرگی حەسانەوەوە لە بەر دەرگای ماڵەکەیان ئەوێستا و سەیری هەرا و هوریای کووچەی ئەکرد. ئەو، لە بیرمە ئەو رۆژانەی زیندوو ئەکردەوە کە پڕ بوون لە شادی و بزووتن. ئەو رۆژانە کە لە ژێر دیرەکی چرای بەرقا کۆ ئەبووینەوە و لە هەموو بابەتێکەوە ئەدواین و ئەو رواڵەتانە کە لە سەر بیرم بە یادگار هەڵکەنرابوون.

ئیستگەی قەتار قەرەباڵغ بوو، قەتارێك لە «خورمشەهر»ەوە هاتبوو، لە سەر پلیکانی ئیستگە ئادەمیزادی جۆربەجۆر و نەتەوەی جیاواز کەل و پەلیان بە باوەش و کۆڵ هەڵگرتبوو. وەك شارە مێروو بە ریز ئەچوونە سەر و لە ناو هەرای شارا گوم ئەبوون، چەفتە و عەگال و مێزەری کوردی و ترکمانی؛ لاوەیی موو زەرد کە پرچیان بە سەر شانیانا هاتبووە خوارەوە و کۆڵەپشتێکی گەورەیان بە پشتیانەوە شەتەك دابوو و شتی دەسکاری ئێرانیان بە قایشی پشت و پەتی کۆڵەپشتییەکەیانەوە هەڵواسیبوو. بێگومان ئەم گلێنە و ئەستێوڵك و قرۆشکەیە کە بۆنی رۆژهەڵاتی کۆنی لێوە ئەهات لە وڵاتی ئەوانا بە بایەخ بوون. منداڵی عەرەب کە کراسی سپی ئاودامێنیان لەبەرابوو، بەم و بەو لادا رایانئەکرد و لە ناو دەستوپێی گەشتیارانا رێگایان ئەدۆزییەوە و لە گۆشەیەکا سەریان هەڵئەدا. ئەو بە تامەزرۆییەوە تەماشای یاری بێ خەیاڵانەی منداڵەکانی ئەکرد.

ئەو هەمیشە منالی خۆش ئەویست. زۆر جار لێم بیستبوو ئەیکوت: «منال ئەوەی باشە کە نازانێ فریودانی خەڵك چییە. خەڵك بە چاو ئەڕوانن، بە لێو پێئەکەنن و بە زار ئەدوێن، لە کاتێکا ئەو هەموو ئەمانە بە دڵ ئەکا.» هەمیشە قەرەباڵغی پێ خۆش بوو. کاتێ دەوروبەری پڕ ئەبوو لە دەنگ، کتێبە شێعرەکەی پێکەوە ئەنا و ئەیڕوانی. نیگای ئەتکوت شەقارێکی برسییە بە شوێن مەلێکا ئەگەڕێ راوی‌کا. هەر مەپرسە کە چەندە خۆشحاڵ ئەبوو کاتێ لەو ناو حەشیمەتەکەدا ناسیاوێکی ئەدۆزیەوە. رقی بوو لە تەنیایی و ئەگەر هەواڵێك بەجێی بهێشتبایە، هەتاهەتا لە بیری نەدەچوو. لە بەر ئەوە ئەموێرا بچمە لای. زانیم ئەبم بە گەپجاری نیگای.

ئەو هاوینە بێ ئەوەی بزانم یا بمەوێ، ئەو ئاواتە کە پیاو هەڵومدای خۆی ئەکا کێشابوومی بۆ ئەو شارە. شارێکی غەریب. زۆر رازی وای هەیە کە پێت نالێ و ئەبێ خۆت هەڵیهێنی. غەریبی زۆر شتت فێر ئەکا. یەکیان ئەمەیە کە بیر بکەیەوە و رێگا بدۆزیەوە، بێ ئەوە کەسێك ژێر باڵت بگرێ. غەریبی زیز و مۆن و بێ بەزەییە، بەڵام فێرت ئەکا کە لە سەر پێی خۆت راوەستی و پاڵ بە کەسێکی ترەوە نەدەی. منیش بەو لیازە چووبوومە ئەو شارە دوورە. رۆژێك سواری ماشێن ببووم و رۆشتبووم. بە سەر چەند شار و دێ دا و هەر کوتبووم نا، هێشتا ماومە. ئێوارەیەك لەو شارە بچووکە دابەزیبووم کە دار و بەرد و شەقام و کێو و دەشتی بۆ من نەناسراو بوو. راستی جار جار تەبیعەت یاری سەیر ئەکا و روانگەی سەیر لە خاتە بەر چاو. ئەو شەوە لە هۆدەی میوانخانەکەما راکشابووم و گوێم گرتبوو بۆ وتووێژی خەڵك کە بە بەر پەنجەرەی هۆدەکەی منا تێئەپەڕین. هەر دەنگێك ئەهات ئەمویست لەگەڵ دەنگێکی ئاشنا هەڵیسەنگێنم. پێکەنینم ئەهات کە لەو شارە دوورە بە شوێن دەنگی ئاشنادا ئەگەڕێم، بەڵام هەر چیم ئەکرد ئەم نیازەم لە هەناوم پێ دەر نەدەکرا. لە پڕ دەرگا کراوە و هەیکەلی لاوێکی لاواز خزییە ناو هۆدەکەوە و لە سەر تەختەکەی بەرامبەرم درێژ بوو. بێ ئەوە بۆم

بروانێ لە کاتێکا جل و بەرگەکەی دانەکەند کوتی: «لە کوێوە هاتووی؟» دەنگی وەك دڵۆپەی وردەباران لە زەوی دەم وشکی تاسەباریم چووە خوارەوە. ماوەیەك گێژ بووم. لام وابوو لە بیرەکەی پێشوومدا کە دەنگی ڕێبوارانی ناو کوڵانم ئەپشکنی بۆ دۆزینەوەی دەنگی ئاشنا، ئەوەندە چوومە پێشەوە کە لێم بووە بە ڕاستی. لام وابوو خەو ئەبینم. بێگومان پرشنگی نیوەڕەنگی چرای هۆدەکە ماوەی نەئەدا بزرکانی ڕەنگم بەدی بکا. لای وابوو گوێم لە پرسیارەکەی نەبووە. کەمێك بەرزتر کوتی: «لە کوێوە هاتووی؟» بە دوو دڵییەوە کوتم: «فەرهاد!؟» کوتی: «بەڵێ!» بەڵام پاشان سەری هەڵبڕی و ورد بە سەرتاپای منی ڕوانی. ـ «تۆ لێرە چی ئەکەی؟» کوتم: «نازانم.» وەك منداڵێك کە ئەسبابی یاری لێ گوم بێ و لەپڕ بیدۆزێتەوە، شادی بە هەموو لەشیا گەڕا و کوتی: «تۆش ڕاتکردووە؟» نەموێرا بڵێم لە دەس چی، چونکە ئەمزانی تووڕە ئەبێ و ئیتر نامدوێنێ. کوتم: «بەڵێ چەشنە ڕاکردنێك.» کوتی: «ئافەرین کوڕی باش» و هەستا لە بەر پەنجەرەکە کاسەیەکی هێنا کە کەمێکی ئاو تێدا بوو. ـ «بڕوانە ئەم ئاوە لە دوێنێشەوەوە لەم بلوورەدا قەتیس ماوە، بڕوانە خەریکە لێڵ ئەبێ. ئادەمیزادیش وەهایە. زۆر لە جێگایەکا بمێنێتەوە ئەگەنێ.» کوتم: «لێرە کار پەیدا ئەبێ؟» کوتی: «خەڵك لە هەموو شوێنێك وەك یەك وان. ئەیانەوێ بژین و بۆ ژیان کار پێویستە. من لێرە کار ئەکەم. لەگەڵ کارەکەما ئەڕوانم، هەرکات تۆزی کۆنی بە سەر ئەم شارەوە بنیشێ لێی ئەڕۆم، بەڵام ئێستە درەنگە، با بخەوین.»

بەیانی کاتێ هەستام لە جێگاکەیا نەمابوو. پەڕاوە شێعرەکەی کە مابۆوە بە دەستمەوە گرت. چەن دێڕ لە حاشیەکەی نووسرابوو. خەتی فەرهادم ناسییەوە نووسیووی: «هەموو شت جوانە بەڵام نەك تا سەر. تەنیا یەك شتە کە هەمیشە تازەیە، کار، کار کە جگە لە ژیان مانایەکی تری نییە. ژیانی بێکار وەك ڕۆژی بێبەیان، وەك قەسیدەی بێ تەغەززول، وەك هەمیشە لە جێگایەکا مانەوە وەهایە!»

لە یادم نییە چەند مانگ لەو شارە بچووکە ماینەوە، بەڵام باشم لە بیرە کە فەرهاد هەرگیز پێی لە سەر زەوی نەبوو. هەمیشە ئەتکوت میوانێکی بەپەلەیە کە هەملی گیرکەوتووە لە نەخۆشێك پرسێ. لە بەر دەرگاوە دائەنیشت. لە رۆژ بە پەلە بوو کە بێتە شەو و بە شەوا بۆ هاتنی رۆژ چاوی ئەبڕییە پەنجەرەکە، شەبەقی بەیان لێڵایی لە سەر لابدا....

تا حەوتەیەکی تر بە خواتان ئەسپێرین.

٥١/٧/١٥

# ئەرکی سەرشانی شاعیران و نووسەران

سەلام لە گوێگری بە هەست و هونەرپەرستی بەرنامەی تاپۆ. ئەم باسە کە وێژە شتێکی راسپێری دارەو ئەبێ لە خزمەتی کۆمەڵا بێ، یام تەنیا هونەری رووتە و کاری بە سەر کۆمەڵەوە نییە، زۆری قسە لەسەر کراوە. هەندێک ئەڵێن ئەگەر هونەر و وێژە کە ئەویش بەشێکە لە هونەر، کاریان بەسەر کۆمەڵەوە نەبێ، بوونیان بێ سوودە. بەتایبەت لەم رادەیەش تێنەپەڕن و ئەڵێن هیچ رووداوێک، هیچ جووڵانەوە و هیچ قسەیەک، تەنانەت ئەگەر لە نێو دوو کەسیشا بێتە گۆڕێ کار ئەکاتە سەر کۆمەڵ، بەڵام تەئسیری

ئەو وتووێژە دوو کەسییە ئەوەندە کەمە کە بەرچاو ناکەوێ، بەڵام لە لێکدانەوەی دوایـدا و پاش سەرنجێکی ورد و قووڵ دەرئەکەوێ کە هیچ رووداوێك نیـە کاری کەم یا زۆر بە کۆمەڵەوە نەدابێ. ئادەمیزاد هەرچی ئەیکا و هەرچی ئەیڵێ راگەیەنی مەبەستێکە؛ هیچ مەبەستێکیش نییە کۆمەڵایەتی نەبێ. لەگەڵ یەك‌دوانی ژن و شوویەك و قسەیەك کە لە نێوان دوو رێواری نەناسراوا ئەکوترێ، پەیوەندی کۆمەڵایەتییان هەیە و ناکرێ وەها نەبن. ژن و شوو یا باسی دڵداری ئەکەن یا سەبارەت بە مەسەلەکانیان ئەدوێن یا لەبارەی هاوسێ و کار و کڕینی شت‌وەکی پێویستی ژیانیانەوە باس ئەکەن. دوو رێوار کاتێ گەیشتە یەك سڵاو ئەکەن، پرسیار لە یەك ئەکەن، ئەگەر رێگایان بە یەکەوە بێ ئەبن بە هاورێ، سڵاوکردن کارێکی کۆمەڵایەتیە. پرسیار کردن بۆ روون‌بوونەوەی مەبەستێکی کۆمەڵایەتیـە و هاورێیەتیش هەروەها کۆمەڵایەتیە. بەشەر کاتێ لە ناو کۆمەڵا بێ هیچ کارێکی، تەنانەت کارە تاکییەکانیشی ناتوانێ لە کۆمەڵا بێ تەئسیر بێ، بەڵام ئەو تەئسیرە گاهێ دژی کۆمەڵە و ئەبێتە هۆی وەدواخستن و راوەستاندنی کۆمەڵ، گاهێکیش تەئسیرەکە تەئسیری باشە و کۆمەڵ بەرەو پێش ئەبزوێنێ.

لە مانگی ئووتی ساڵی ١٩٦٣ی میلادیـا، لەگەڵ بەسترانی پەیمانی جیهانی وەستاندنی تاقیکردنەوەی ئەتۆم کە لە مسکۆ پێکهات، کۆڕێك لە نووسەرانی رۆژاوایی و رۆژهەڵاتی لە شاری لێنینگراد بەسترا و وتاری ئەو نووسەرانە سەبارەت بە وێژەی ئەمرۆی جیهان، لە هەموو شوێنێکا دەنگی داوە. لەم کۆڕەدا دوو بڕوا پێشان درا کە لە راستیا هەرکام ناوەرۆکی یەکێ لە شێوە وێژەییە گەورەکانی ئەمرۆن: «ریئالیستی سووسیالیستی» کە ئەڵێ نووسەر لە بەرامبەر کۆمەڵا مەسئولیەت و راسپێری هەیە و «رۆمانی نوێ» کە لای وایە نووسەر تەنیا لە بەرامبەر هونەرەکەیدا راسپێری‌دارە. «ئالێن روب گرییە» نووسەر و هەڵسەنگێنەر و فیلمسازی بە ناوبانگی فەرانسەیی لایەنگری رۆمانی نوێ لەو کۆڕەدا وتارێکی دا کە لە لایەن ئەبولحەسەن نەجەفی

وەرگێری ئێرانییەوە کراوە بە فارسی و ئێمە ئەیکەین بە کوردی.

ئالێن روب گرییە لەو کۆڕەدا وتی:

- «ئێمە لێرە زۆر قسەی باشمان بیست بەڵام ناتوانم ئەوەم پێ سەیر نەبێ کە لە لایەن زیاتری ئەو وتاردەرانەوە کە خەڵکی شوورەوی بوون رەخنەی زۆر توند و تیژ لەو کۆشش و کەند و کۆیانە گیرا کە ویژەی نوێ ئەیکا و رەخنەکان زۆر لەو رەخنانە ئەچوون کە لە کۆمەڵی بوورژوازی رۆژهەڵاتا لە ئێمەی ئەگرن. لێرەش هەر وەك ئەوێ، بێ‌کەڵکی و تێکوڵ‌پەسندی و فۆرمالیسمی کارەکانمان لەسەر ئەکەن بە ئیراد و بە ویژەکەمان ئەڵێن دواکەوتوو و دژی مرۆڤ. پرسیارێك کە لێمان ئەکرێ ئەمەیە: «بۆچی ئەنووسن، کارەکەتان کەڵکی چییە و خۆتان بە چ کارێکی ئەم کۆمەڵە دێن؟» بێگومان ئەم پرسیارە پووچ و بێ‌مانایە. نووسەر و هەروەها هونەرمەندی تریش ناتوانێ تێبگا، کارەکەی کەڵکی چییە و بە کاری چی دێ. ویژە بۆ ئەو ئەسبابی پاراستنی بیر و بروایەك نییە. ئەڵێن ئێوە لاتان داوە لەو وەسیلە باشە کە ناوی رۆمانی سەدەی ۱۹ بووە لە کاتێکا ئەو وەسیلە باشە ئێستەش ئەتوانێ دەردی جیهانی ئەمڕۆ چارە کا و خەڵك لە دەردەکانیان بگەیەنێ، هەڵبەت ئەگەر دەردێك پێویست بێ چارە بکرێ و ئەگەر پێویستیش نەبوو لانی کەم دەرمانی کەم‌وکوور، بەڵام باشتر بدۆزێتەوە. هەمیشە پێمان ئەڵێن نووسەر راسپێری‌دارە و ناچارمان ئەکەن بڵێین گاڵتەمان پێ‌ئەکەن و بڵێین کە رۆمان وەسیلە نییە و رەنگە بۆ کۆمەڵ هیچ کەڵکێکی نەبێ.

نووسەر بێگومان خاوەن راسپێرییە، بەڵام وەك راسپێری خەڵکی تر، نە کەمتر و نە زۆرتر. واتە ئەو یەکێکە لەو گەلە. لە وڵاتێکا، لە سەردەمێکا، لە رێکخراوێکی ئابووریا و لە ناو داب و دەستوورێکی تایبەتی کۆمەڵایەتی و ئایینی و رێگا و شوێنی ترا ئەژی. هەر ئەوەندەی‌کە ئازادە، راسپێریشی لە سەرە. یەکێك لەو شتانە کە ئازادی ئەو بەربەست ئەکا، زۆرێکە کە کۆمەڵ بۆی ئەهێنێ بۆ ئەوە پێی بسەلمێنێ کە

نووسەر ئەبێ بۆ کۆمەڵ بنووسێ، یا دژی کۆمەڵ بنووسێ، کە هەر دووکیان راسپێرین. ئەم مەبەستە شتێکی زۆر سەرنجڕاکێشە کە لە سەردەمی ئێمەدا ناویان ناوە «بێگانەبوون لە خۆ» Alienation رووناکتر بڵێم نووسەریش وەك هەموو ئەندامانی تری کۆمەڵ بە چارەرەشی خەڵك خەمبارە، بەڵام پێچەوانەی راستی و دروستییە ئەگەر لامان وابێ کە نووسەر بۆیە ئەنووسێ دەرمانی دەردێك بدۆزێتەوە. ئەو چیرۆکنووسەی ئالمانی رۆژهەڵاتی کە لەم کۆڕەدا رایگەیاند کە داستان ئەنووسێ تا بتوانێ لەگەڵ فاشیسم شەڕ بکا، من ئەهێنێتە پێکەنین و زەحمەتە بڕوا بکەم ئەتوانێ؛ بەڵام بەختیاریم ئەمەیە کە هەموو ئەزانین کە ئەویش نازانێ بۆچی ئەنووسێ و بیانوویەك کە بۆ پاکانەی خۆی ئەیهێنێتەوە بێ بایەخە.»

پاشماوەی ئەم وتارە کە «ئالێن روب گرییە» نووسەر و هەڵسەنگێنەری وێژە و لایەنگری وێژەی نوێ لە ساڵی ١٩٦٣دا لە لینینگراد بڵاوی کردەوە، ئەهێڵینەوە بۆ بەرنامەیەکی تر و لە دوایی بەرنامەکەماندا کەمێك سەبارەت بە بڕوای لایەنگرانی «رۆمانی نوێ» ئەدوێین.

رۆمانی نوێ خەریکی دەرمانی دەرد و راستکردنەوەی چەوتی کۆمەڵ نییە و ئەگەر نووسەری رۆمانی نوێ ددان بەوەدا بنێ ئەرکێکی لەسەر شانە، ئەو ئەرکە تەنیا سەبارەت بە هونەرەکەیەتی، هەروەك «ئالێن روب گرییە» ئەڵێ نووسەریش وەك ئەندامانی تری کۆمەڵ بە دەرد و خەمی خەڵك پەرۆش و پەشێو ئەبێ، بەڵام ئەرکی سەرشانی ئەو لە خەڵکی ئاسایی زیاتر نییە و بۆ ئەوەش نانووسێ کە بە هۆی نووسینەکەیەوە دەردێك دەوا بکا و یا رێگای چارەیەك بۆ دەرد و کەسەری کۆمەڵ بدۆزێتەوە. لەم وتەیە دەرئەکەوێ کە بە لای ئەو تاقمەوە نووسەر لەبەر ئەمە کە پێنووسی بە دەستەوەیە و خاوەنی هونەرێکە، راسپێرییەکی زۆرتری لە ئەندامانی ئاسایی بە ئەستۆوە نییە، واتە هونەرەکەی شتێکی تاکییە و دوورێکی لە ژیانی کۆمەڵا نییە. وەك

«گرییه» ئەڵێ: وێژه بۆ نووسەر وەسیلەی پاراستنی بیروبڕوایەکی سیاسی و گشتی نیە.

ئێمە لە بەرنامەکانی پێشووا بڕوای ئەو کەسانەشمان بڵاو کردۆتەوە کە دژی بڕوای «گرییە»ی فەرانسەیین و ئەڵێن هونەرمەند ئەبێ هولەر چەشنی چەکێک بۆ پاراستنی کۆمەڵ کەڵکی لێوەربگرێ و ئەم مەبەستە شیاوی شاردنەوە نیە کە هونەرمەند قسەی لە ناو کۆمەڵا رەوایە و لەبەر ئەمە باشتر ئەتوانێ لە پێناوی بەختەوەری گشتییا خەبات بکا. لە بەرنامەی داهاتوودا لە سەر ئەم باسە ئەڕۆین.

٥١/٧/١٧

# «تەنز» لە ویژەی کوردییا

سەلام لە گوێگری هۆگری هونەر و بیستیاری هەستیاری بەرنامەی تاپۆ.

بەداخەوە لە ویژەی کوردییا بەشی نووسینی تەنز کەمە. تەنز نووسی، بە چەشنە نووسینێك ئەکوترێ لەودا مەبەستی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی گاڵتەچیانە دەرئەخرێ. لە راستییا نووسینی جیددی و ئاسایی لەگەڵ شێوەی تەنزا هەریەك باری کۆمەڵایەتییان هەیە، بەڵام لە شێوەی تەنزا لە قەشمەری و گەپ و گاڵتە کەڵك وەرئەگیرێ بۆ ئەوە لە تاڵایی دەربڕینی راستەقینە کەم بکاتەوە. تەنز چەشن و جۆری زۆرە. هەندێك تەنزی

تاڵ و نادیاری لە ویژەدا هەن وەك شێوەی نووسینی چێخۆف نووسەری رووس یا نووسەری كلاسیكی فەرانسەیی ئاناتۆل فرانس و هەندێ تەنزی تریش هەن كە رەخنەگر و ئاشكرا و توند و تیژن. وەك نووسراوەكانی ئارت بوخواڵدی ئەمریكایی و «عەزیز نەسین»ی تورك. جگە لەمانە لە بەشەكانی تەلز، تەنزی سیاسی و كۆمەڵایەتی ئەتوانین ناو بەرین.

مەبەستێ كە نووسەران بۆ لای نووسینی گاڵتەیی رانەكێشێ ئەمەیە كە لە تەنزا دیوار و شوورەی ئیماژ و ئیستعارە و داپۆشراوی بەرز و پتەوە. تەنزنووس لە پشت ئەو دیوارە بەرزەوە بە دڵنیاییەكی زۆرترەوە ئەتوانێ هێرش بكاتە سەر سەنگەری دزێوی و نالەباری ناو كۆمەڵ. تەنزنووس لە هەموو شتێك بۆنواندنی مەبەستی خۆی كەڵك وەرئەگرێ. لە زمانی پەلەوەرەوە، لە زمانی پرسۆنل و قارەمانی ئەوتۆوە كە لە ناو ئوستوورە و ئەفسانەكانا هەن قسە ئەكا. ئەتوانێ سەردەمی رابردوو لە رۆژگاری خۆیا زیندوو كاتەوە. واتە زەمان بەربەستی ناكا. بۆنموونە ئەگەر نووسەرێك بیەوێ گیانی پیاوێكی مێژوویی یا زانستی و هونەری بهێنێتەوە بەر لەشی و لە لایەن ئەوەوە قسە بكا، ناچارە رەنگی خۆڵەمێشینی تەنز و گاڵتە لە نووسراوەكەی بدا، دەنا نووسراوەكەی بە ناوی شوێنەوارێكی دژی راستەقینە ئەخرێتە لاوە و كەس نایخوێنێتەوە.

لەم بەرنامەیەدا نووسراوێكی تەنزی كوردیتان پێشكەش ئەكەین و هیوادارین ببێتە سەرمەشق كە نووسینی تەنز پەرە بستێنێ و لەو شێوە جوانە لەم رادەیە كە ئێستە لە ویژەی كوردییا هەیەتی بەرزتر بێتەوە.

## لە گۆڕگی برسییەوە پێشكەش بۆ بەرانی دابەستەی بەرێز

پێش هەموو شت لە خودای مەزن ئەپاڕێمەوە كە ژیانی درێژت بكاتە نەسیب. بێگومان

لەم مانگە موبارەکەدا زمانم بە رۆژووەو لە گوناه ئەوەندە دوورم کە باپیرە گەورەم لە رشتنی خوێنی کوڕی یەعقووب دوور بوو. خوا نەزام وەرنەگرێ، ئەمەی کە من بەڕۆژووم و لە ترسی خودا وەك بێ ناو ناو ئەلەرزم، لە بیرت بێ و بیسەنگێتە لەگەڵ ئەزیلە مفتەکەی ئادەمیزاد کە ئەڵێن: «تۆبەی گورگ مەرگە»، تا بزانی ئادەمیزاد جناتی چییە! و چۆن ئەو زمانە کە خودا پێی داوە تا یادی ئەوی پێ بکا، قسەی راستی پێ بکا و بە درۆو دەلەسە چەپەڵی ئەکا، بە هەموو لایەکا ئەیگێڕێ. هەر لێم گەڕێ برای باشم، بریرەی پشتم. چەندە لەو ئادەمیزادە تووڕەم. راستە ئێمە لەو کاتەدا یوسفمان نەخواردووەو بوختانیان پێ کردووین، خودا کە خۆی هەموو ئاشکرا و نهێنییەك ئەزانێ، ئەواڵەی بۆ بڕیوینەوە و پێویستمان بە خواردنی گوشتی تر نەماوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر بۆم هەڵکەوێ ئیسك و پێستی ئادەمیزاد لەیەك ئەهاڵێنم.

یوورە کە سەرەتای نامەکەم باش دەست پێ نەکرد. بە راست کاك بەران چۆنی؟ چاکی شوکر؟! پێم بڵێ بزانم خەوت چۆنە؟ دوێشەو باش خەوتی، یام گوڵەبۆری خوێن تاڵی ئیسك گران هەر بە دەوری گەلەخانەکەتاندا هەڵسووڕا و حەپەی هات. ئەم خۆشیرین کردن و کلکەسووتەی سەگیشم بەلاوە زۆر شوورەییە کە بۆ پاروەوە ناتێك ئەیکا. جا ئەگەر ئێمە بە یەکەوە باش بوایەین ئادەمیزاد چۆن ئەیتوانی ئەم چەرمەسەرییەمان بە سەر بێنێ؟!

بڕوانە گا جووت بەم هەموو زلییە بە ئۆحەیەکی جووتیار وەك مێو و رۆن لە سەرخەتی جووت ئەگەڕێتەوە. کاتێکیش لە گێرەیان کرد، دەمبێنی ئەکەن، نەکا دەم بۆ دەنکە گەنمێك بەرێ کە بە رەنجی شان و پیلی ئەو هاتۆتە بەرهەم. دڵی بەمە خۆشە کە یەکەم گیاندارێکە کە یارمەتی خێڵی ئادەمیزادی داوە. تکایە لە زمانی منەوە بەم گایە بڵێ نەیبیستووە کە ئادەمیزاد لە ناو خۆیانا ئەڵێن: «جووتبەندەی باش ئەو کەسەیە کە گای لاواز بێ و سەگی قەڵەو!» ئەگەر مانای ئەم قسەیەشی لێپرسی هەر لە زمانی منەوە پێی

بڵێ که گا ئەبێ زۆر کار بکا. بووره و بەیار و چرگەن و جارەفریزوو دەربهێنێ، تا ئەو لاواز بێ و سفرەی ئادەمیزاد برازێتەوە، سەگیش که جگە لە پاسەوانی کارێکی لە دەس نایە ئەبێ تیر و تەسەل بێ تا بتوانی قازانج و سوودی ئادەمیزاد باشتر بپارێزێ. ئەمە پێی ئەڵێن: «کار به نانەزگێ».

کاکی خۆم، بەڵام خۆمانین ئەو سەگە وا من ئەیناسم ئەگەر لە برسا لار بێتەوە و لاکەی سەری بێ، هێشتاش دەس لە کلکەسووتێ و نووزەنووز هەڵناگرێ. شتێك که بۆ من سەیرە، ئەمەیە که تۆبەم گیانە ناسك و هەستە خاوێنەوە که هەتە چۆن لەگەڵ چەق و لووری سەگ هەڵئەکەی؟ راستە من و تۆلە بەر هەندێ شت لە یەك دووریـن و باش یەکتر ناناسین، «خودا سەبەبکارەکەمان بکا بە کۆی زووخاڵ»، که من و تۆی لەیەك کرد؛ بەڵام هەرچی بێ من و تۆلە سەر چوار پێ راوەستاوین و ئادەمیزادی تەژەی لەندەهۆر بە دوو پێ ئەڕوا بە رێوە. رەنگە نەتبیستبێ که ئادەمیزاد هەرکات بیانەوێ گاڵتە بە یەکێ لە خۆیان بکەن و بڵێن نەفامە، ئەڵێن: «ئەگەر ئەو دەستەی هەڵیهێناوە داینێتەوە سەر زەوی ئەبێتەوە بە چوار پێ.» تۆی زرنگی هۆشیار بێگومان بیرت لەمە کردۆتەوە که ئادەمیزاد شیرت ئەخوا و تەڕایی بۆبەرخۆڵەکانت ناهێڵێتەوە. بە راست چ روانگەیەك دڵتەزێنترە لە روانگەی بەرخ تێبەردان، کاتێ کە ژنانی بێری بە شیرمەشك و مەڕدۆشکەی پڕلە شیرەوە لە ناو ران دێنە دەرەوە و بەرخ و کارژەڵەی ساوای برسی بە کارەکاڕ و بالەبال بە شوێن دایکیانا ئەگەڕێن. بەڵام کاتێ ئەگەنە دایکیان هەر فنچکی یەکەم تێئەگەن پێش ئەوان تاڵانکراوە و هەڵچۆڕاوە. خۆیان ئەم دەردە بە سەر ئێوەی خانەدان دێنن، بەڵام کایەیەکیان هەیە بە ناوی «دایە مەمدە بە گورگێ». بێگومان دیوتە که منداڵانی ئادەمیزاد کۆئەبنەوە و یەکیان ئەکەن بە گورگ و یەکیان ئەبێ بە دایکی بەرخۆڵەکان، جا منداڵەکان بە دەوری دایکیانا هەڵئەسوورێن و ئەڵێن: «دایە مەمدە بە گورگێ، گورگە ددانی تیژە». بەڵێ، باشە گورگ ددانی تیژە، بەڵام بەم ددانە تیژانەوە

نیوەی ئێوەی ئادەمیزادی ئەوستی تیرنەخۆر، خوێنخۆر نییە. گورگ گۆشتخۆرە، مەڕ گیاخۆرە، بەڵام ئادەمیزاد گۆشت ئەخوا، گژ و گیا ئەخوا، میوە ئەخوا... تۆ هیچ درندەیەك ئەناسی کە قەسابی دانابێ؟

کاکی بەڕێز! کاتێ ئەوە هاتووە بیر بکەیەوە جگە لەمە کە ئادەمیزاد شیرت ئەخوا، گۆشتی بەرخۆڵەکانیشت ئەخوا. من کە نازانم، بەڵام لە ئادەمیزادم بیستووە ئەڵێن، کەبابی گۆشتی بەرخ زۆر بەتام و لەزەتە. ناڵێم گۆشتی بەرخم نەخواردووە، بەڵام ئەوەندەم برسی بووە کە بیرم لە تام نەکردۆتەوە. هەرچی خواردوومە بۆ ئەوەم خواردووە نەمرم. ئادەمیزاد لە ساڵی گرانییەکەدا یەکتریان ئەخوارد. بۆ من هەمیشە ساڵی گرانییە. ئادەمیزاد ساڵێ جارێك وەك تێسوو تاڵانت ئەکا و خوری لەشت بە برینگ هەڵەپاچێ و گوێ ناداتە ئەوەی کە لەشت بریندار ئەبێ یام نە. خوری و بەرگنت ئەکا بە بەرگی خۆی و هەزار شتی تری لێ دروست ئەکا. دەگەناڵی ئینگلیزی و پارچەی زەردی ئاڵمانی و مافوورەی ئێرانی. بڕوانە ئەمانە چەندە فڕوفێڵ ئەزانن. ناوی تۆ هەر لە کوولەکەی تەڕیشا نییە. بە خودا بە گوێما ناچێ، کام ئادەمیزاد لە هەموویان ڕاسترە لە گوریسی ناو هەمبانە پێچ و پلووچی زۆرترە. خۆیان ئەڵێن: «شتێ کە بۆ ماڵ پێویستە لە مزگەوت حەرامە.» کەچی تۆ ئەکەن بە سڵقی رووت تا خۆیان پۆشتە بنەوە. سەرەڕای ئەم هەموو درۆو ناپاکییە، بە من ئەڵێن «تۆبەی گورگ مەرگە». نازانی لەبەرچی مەرگی من بە ئاوات ئەخوازن؟ چونکە من وەك وشتری پێ پان بارێان بۆ هەڵناگرم. وەك سەگ کلکەسووتەیان لە بەر ناکەم و بیووره چەشنی تۆ شیریان نادەمێ و نابمە دەمدۆی خێزانیان. تکایە بۆ درێژەدانی وتووێژەکەمان و بۆ ئەوە ژەنگی دوژمنایەتی لە دڵمان پاك کەینەوە تەشریف بهێنە بۆ رەموەزی پشت ماڵان تا باشتر باسی دوژمنایەتی ئادەمیزاد روون کەینەوە.

خوات لەگەڵ، برات گورگی برسی.

ئەم نامەیە پۆستەچی هێنای و دای بە شوان و شوانیش ئەو رۆژە گوڵە بۆری نارده جێگای دیاریکراو.

تا حەوتەی داهاتوو خواتان لەگەڵ. ١٣٥١/٧/١٩

# ئەسکەندەر شاخی هەیە

پیاوێکی نزیك بە سی ساڵەی نە کورت و نە درێژ بوو. سمێڵێکی خورمایی و دەم و لێوێکی جوانی بوو. رانك و چۆغەیەکی کۆن بەڵام خاوێن، ئەندامی رێکی دائەپۆشی. سێ چوار گەز پشتێنی پەشمینەی گوڵوورد نێوقەدی بارێکی ئەبردە رێکی کەلەکەی. جامانەیەکی رەش و سپی لە سەر نەبەست و لکێکی بەرنەداوە سەر کەوای مرادخانی. هەتا دیبووم هەر بەم بەرگانەوە دیبووم، بەڵام هەمیشە لام وابوو هەرئێستە گۆڕیویەتی. خەڵك ئەیانکوت نەدوێنە، بەڵام ئەو رۆژە کە من چاوم پێی کەوت زۆر

گەرم و گوڕ چاك و خۆشی لەگەڵ کردم. زۆر ئادەمیزادی وا هەیە کە بە رواڵەت خۆبەزل‌زان و خۆلەلازۆر دێتە بەرچاو، بەڵام کاتێ لەگەڵی دووای پەشیمان ئەبیتەوە کە بۆچ لە هەوەڵەوە وات گومان بردووە. ناوی، کەم کەس ئەیزانی. راستیەکەی ئەمەیە کە خەڵکی ئاواییەکە لەو پەردەی رازە کە ئەو بە سەر خۆیا کێشابوو، ئەترسان. هەموو کەس باسی ئەکرد، بەڵام هەمیشە وەك باسی شتێکی نهێنی بکەن، بە چپە ئەدوان. هەموو شتێکی شاراوەی ئەناسراوە، لەگەڵ ئەوەشا کە پیاو ئەکێشێ و کەڵکەڵەی هان ئەدا ئەشیترسێنێ. چەشنی شەوێك کە لە بەرچاوی منداڵ پڕە لە جنۆکە و خێو.

ئەو رۆژە کە من قسەم لەگەڵیا کرد لەپەنا سێبەری مزگەوتا دانیشتبوو. بەربەیانێکی کەمێك ساردی پاییز بوو. بارانی دوێنێشەو گەڵای زەردی ریزە چنارەکەی نزیك مزگەوتی وەراندبوو. بایەکی نەرمی ئاماڵ سارد، گەڵای زەردی خەزەڵوەری ئەلەراندەوە، بەڵام نەیئەتوانی لە زەوی بەرزیان کاتەوە، چونکە بارانی دوێنێشەو تەڕی کردبوون و ملاسی زەوی ببوون. گەڵاکان خشە و خشپەیان نەدەهات، بەڵام بە فووی ساردی دەمی با نیوەنووزەیەکی بە هاستەمیان لێ هەڵدەستا. وەك ئەوە ئەچوو تۆ لە دەری دێوە لە سێیاری شەوا، گوێت لە دەنگی بەئاسپایی ئاوایی خەواڵوو گرتبێ و ناڵەی نێوان دار و پچڕپچڕی کچێکی تازەساڵت بێتە گوێ کە خەونێکی ناخۆش ئازاری ئەدا.

سڵاوم کرد و بێ ئەوە چاوەڕوانی وەڵامی بم لە سەر تاتەبەردی پەنایا دانیشتم و کوتم: «کوت‌وپڕ ساردی کرد.» سەری هەڵێنا و گەشەیەك کەوتە سەر چاوی. گەشەیەکی تیژتیەڕ و بێباوەڕ، وەك ئەستێرەیەك کە راخوشێ و بکوژێتەوە. وا دیار بوو هەستی کردووە لەم ئاواییەدا زۆر خۆشەویست نییە و بە لایەوە سەیر بوو کە من وا بێ ترس لە پەنایا دانیشتووم. کوتی: «هەمیشە هەروا بووە، هێرشی کوت‌وپڕ! بێ ئەوە ئاگامان لە دەرد و مەرگی خۆمان هەبێ، تاوێری زەمان بە سەرمانا دێ و ئەمانهارێ.»

سەیرم کرد دەسرەدەستەکەی لە ناو دەستی بە هێزیا وەها ئەکوشێ لەوانەیە دەسرەکە

بدرێ. ئەتگوت ئەیەوێ هەموو رقی خۆی بکا بە هێز و بیدا بە پەنجەی دەستی و بیرژێتە ناو دەسرەکەیەوە. نیگای وەك بازی برسی هەڵفڕی بۆ دوورەدەستێکی گوم و نادیار. ڕەنگێکی خۆڵەمێشی گلێنەی چاوی داگرت. ئەتگوت ساڵهایە ئەو گلێنانە بوون بە دوو شووشەی گردی بێبزووتنەوە. لە بەرخۆیەوە گوتی: «دە ساڵ!» دە ساڵ خەم کووری کردبوو. دەستی بە پشتیەوە گرت و کەمێك خۆی ڕاست کردەوە. ـ«دەردێکی گەورەیە، بەڵام دەرکی ئادەمیزاد شێوەی کەوڵێکی بچووکی هەیە و هەزار دەریا خەم ئەبا.» گوتم: «باسی خەم ئەکەی. لات وا نیە ئەگەر بیدرکێنی خەمەکەت لە سەر سووك بێ؟» گوتی: «ئەزیلەی ئەسکەندەر و شاخێی.» گوتم: «ئەمبیستووە» گوتی: «ئەڵێن ئەسکەندەر شاخی هەبوو. هەر سەرتاشێك سەری ئەتاشی بەم ڕازەی ئەزانی؛ بەڵام هەموویان بە دەستووری ئەسکەندەر ئەکوژران. تا یەکێك لەو سەرتاشانە کە خزمی سەربڕی ئەسکەندەر بوو بەرەڵا کرا. سەرتاش بە نهێنی ئەژیا و نەشیئەتوانی ڕازی ئەسکەندەر بدرکێنێ، تا تووشی نەخۆشی هات. حەکیمان پێیان گوت، تۆ ڕازێکت هەیە و لە دڵتا بۆتە گرێ. ئەگەر ڕازەکە دەرخەی ڕزگار ئەبی. سەرتاش ناچار چووە قامیشەڵانێکەوە و لەوێ چەند جار لە ژێر لێوەوە گوتی: «ئەسکەندەر شاخی هەیە». «با» ئەم دەنگەی کرد بە گەرووی زەل و قامیشەکانا. هەرکات «با» ئەهات یا هەرکات زەلێکی ئەو قامیشەڵانە ئەکرا بە بلوێر و بلوێرژەن فووی پیا ئەکرد، ئەم دەنگە لە گەرووی قامیشەکان هەڵئەستا: «ئەسکەندەر شاخی هەیە».

بێدەنگ بوو. دیسان چاوی بڕیەوە کەلی ئەوبەری ئاواییەکە. ڕۆژ تەواو گەرمی کردبوو. هەڵمی زەوی تەڕوەك دووکەڵی نێرگەلەی پیرەپیاوێکی دێهاتی بەرەو هەوا هەڵئەچوو. گوتم: «کابرای سەرتاش چی بە سەرهات؟ پاش درکاندنی ڕازەکە نەخۆشییەکەی لە کۆڵ بووە؟» گوتی: «ئەزانم ئەڵێی چی. ئەسکەندەر شاخی هەبێ یا نەبێ گرنگ نیە، گرنگ ئەمەیە گوێی نەبێ.» سەرم سوڕمابوو. نەمئەزانی ئەڵێ چی و

لە پڕ هەستم کرد منیش وەك هەموو خەڵكی ئاوایەکە لێی ئەترسم. ئەم کابرا گەنجە بەم ئەندامە ڕێك و جوانەوە، چی وەها لە لەش و گیانیا هەبوو کە بۆلێ ترسان بشێ؟

دیسانەوە دەنگی خەمبار و پیاوانەی کە زۆر لە تەمەنی پیرتر دیاری ئەدا هاتەوە بەر گوێم: «بەڵێ ئەکرێ ئەسکەندەر شاخی هەبێ، بەڵام ئەگەر گوێی لە حاند ناڵەی دەردەداران کەڕو نەبیست بێ....»

قسەکەی تەواو نەکرد، دەستی بە ئەژنۆیەوە گرت و هەستا. چاوی لە چاوم بڕی، وەك ئەمە بیەوێ سپاسم بکا کە بۆماوەیەك لە تەنیایی دەرمهێناوە؛ بەڵام بە زار هیچی نەکوت. سەری بەرداوە و ڕێگای گرتەبەر. لە پشتەوە لە پیاوێکی زورهانی لە کارکەوتوو ئەچوو. ئەتکوت سەری بە زۆر بۆ ڕانەگیرێ کە شۆڕ نەبێتەوە سەر سینەی. بێ ئەوە بزانم مەبەست چ بوو لە بەر خۆمەوە کوتم: «دە ساڵ! دە ساڵ خەم و دەرد! ماڵی ئادەمیزاد شێوەی کەوڵێکی بچووکی هەیە و دەریایەك خەم ئەبا».

تا حەوتەی داهاتوو خواتان لەگەڵ ـ ١٣٥١/٨/١٠

# شیعری باش کامەیە؟

سەلام لە گوێگری بە هەستی بەرنامەی تاپۆ. زۆرجار ئەم پرسیارەمان لێکراوە کە شیعری باش بە کامە شیعر ئەڵێن. هەڵبەت ئێمە وەڵامی ئەم پرسیارەمان زۆرجار داوەتەوە و بە چەشنێکی گشتی روونمان کردۆتەوە کە هونەری باش بە چ هونەرێک ئەکوترێ. ئەوەی وا ئێمە لەم بارەوە دەرمانبڕیوە بڕوای خۆمان بووە؛ بەڵام کۆتاییشمان نەکردووە لە بڵاوکردنەوە و نووسینی بڕوای جۆربەجۆر سەبارەت بە هونەر. هەندێک هەن کە ئەڵێن شێعر و وێژە کە بەشێکە لە هونەر، کەڵکی نییە و قازانجێک بە کۆمەڵ ناگەیەنێ

و تەنانەت بەرگری لە پێشکەوتنیشی ئەکا. ئێمە لە بەرنامە پێشەکانا کوتوومانە کە ئەم بڕوایە چۆن پەیدا بووە. تەنانەت تاقمێکی زۆریش لە زانایان هەن کە دژی شێعر و ویژەن، بەڵام ئەگونجێ هەموو ئەم دژایەتییانە لە مەوە پەیدا بووبێن کە زۆر بە وردی سەیری پێشینە و ئەرکی هونەر نەکراوە. میــــداق و مەفهوومی هونەر زۆرجار یەکتر ناگرنەوە. واتە سەرنج نەدراوەتە ئەم مەبەستە کە هونەر خوڵقاوی ویـــست و نیازی کۆمەڵی سەرەتایی ئادەمیزاد بووە و گەورەترین یارمەتی داوە بە بەرەی ئادەمیزاد و هەروەهاش کاتێ هەڵبەست و نووسراوێکی بێ کەڵك کە بە داخەوە لە ویژەدا نموونەیان زۆرە و رەنگە زۆربەش بن، بەرچاو کەوتووە بەم ئاکامە گەیشتوون کە شێعر و ویژە بێ کەڵکە. بە لێکدانەوەیەکی تر هەر کات میــداقی شێعر خراپ بووە، حوکم بە خراپ‌بوون و بێ کەڵکی مەفهوومی شێعر دراوە. کوتمان کە بە داخەوە شێعری بێ‌کەڵك زۆربەی شێعرە. ئەمەش هۆی تایبەتی هەیە. چونکە چینی هەڵبژاردە، واتە ئێلیت elite (هەڵبەت هەڵبژاردە لە باری زیادبەشی ئابووری و دەسەڵاتەوە) سوودیان لە مەدا نەبووە کە شێعر ئەرکی کۆمەڵایەتی لە سەرشان بێ و بۆ ئەوان باشتر بوو کە شێعر لە جیاتی هاندان و بزواندن، سـستی و وەستان بگەیەنێ. تاقمێکی تریش هەبوون کە لایان وابووە شێعر زیل و بەمە و ئاهەنگ و وشەی جوان جگە لە لاواندنەوەی پەردەی دڵ و گوێ بە کاری شتی تر نایە. ئەمانە چ سووررێئالیست بن، چ لایەنگری رۆمانتی نوێ، چ دادائیـــست و چ تاقمی «هونەر بۆ هونەر»، هەموویان ئەکرێ لە ژێر ئەم ناوەدا کۆ بکەینەوە؛ لایەنگرانی قالب و دیوی دەرەوە. ئێمە لەگەڵ ئەوەشا ئەزانین ئاهەنگ و وشەی جوان و رازاندنەوەی رواڵەتی وتار، بەشێکی گرنگ و هێژایە لە شێعرا؛ بەڵام وەسیلەیە نەك ئامانج. مەبەستی ئەسڵی لە شێعرا ناوەرۆك و کاکڵە نە رواڵەت و توێکڵ. شێعری فەننی و مامۆستایانە ئەمەیە کە ناوەرۆکێکی بە کەڵکی هەبێ لە ناو قالبێکی جوان و رازاوەدا و ئاهەنگی تایبەتی خۆیشی دۆزیبێتەوە. ئاهەنگی تایبەت شتێکی شیاوی

لێوردبوونەوەیە، چونکە هەر شێعرێك بە پێی موحتەوا و واتەی خۆی ئاهەنگێکی تایبەت ئەخوازێ و بۆ ئاهەنگی تایبەتیش وشەی تایبەتی گەرەکە. بۆ نموونە شێعرێکی نەتەوایەتی و هاندەر کە ئەیەوێ دەماری گەل‌پەرەستی بە هێز کا، ئەبێ ئاهەنگێکی حەماسی هەبێ و وشەی تایبەتی بۆ هەڵبژێری. وەك ئەم نیوە شێعرە کە ئەڵێ: «پێ و چەك زرمەیانە و خرمە». ئاهەنگی ئەم نیوە شێعرە نەرم و نیان و ئەویندارانە نییە و زۆرتر لە مارشێکی سپایی ئەچێ و وشەکانیش لاوێنەرەوە و نەرم نین. بەڵکو راپەڕێنەر و هاندەرن. باسەکە باسی پێیە و چەك کە زرمە و خرمەیان دێ. هەروەهاش ناوەرۆك و مەفهوومی غەرامی و ئەویندارانە یا واتەیەك کە لە بارەی تەبیعەت و جوانییەوە ئەدوێ پێویستی بە ئاهەنگێکی لاوێنەرەوە و نەرم و نیان هەیە و وشەکانیشی ئەبێ لەگەڵ ئاهەنگەکەدا یەك بگرێتەوە. وەك ئەم شێعرە:

بەڵێ وای ئەتۆ،
وەك زرێباری بێ خێوەتی مانگەشەو
بە مەندی شکۆدار و گەورە و گرانی
بەڵام پێکەنە، تۆ پەریزادی گوڵخەندەرانی.

لەم شێعرەدا وشەی زرێبار و خێوەتی مانگەشەو و پەریزادی گوڵخەندەران هاتوون کە هەموو وشەی نەرم و ئەوین بزوێنن. بەڵام کاکڵ لە شێعرا ـ کە بەلای ئێمەوە مەبەستی ئەسڵییە ـ ئەتوانێ دوو جۆر بێ: یەکەم کاکڵێکی ئەوتۆ کە کەڵکی کۆمەڵایەتی لێوەرناگیرێ. واتە باسێك لە شێعرا دێتە گۆڕ کە یا زیانی زۆربەی کۆمەڵی تێدایە یا مەبەستێکی شەخسی و تاکی تێدا هاتووە کە ناتەنێتەوە بۆ مەبەستێکی گشتی. وەك باسی ئەوینێکی ئەشرافی و هەڵدانی شەوێکی خۆش رابواردن، بێ ئەوە ئاوڕێك بۆ خەڵکی ئاسایی درابێتەوە. دووهەم کاکڵێك کە کەڵکی کۆمەڵایەتی تێدا هەیە. ئەم مەفهوومە شێعرییانە دوو چەشنن، یا چەشنێکن کە قالب و وشەیەکی ساکار و نزیك لە

دووالی ڕۆژانەی خەڵکیان هەیە، یا قالب و دیوی دەرەوەیان کەمێك ڕەق و دژوارە و وشە و تەعبیری ڕازاوە و فەننی و دوور لە وتوویژی خەڵکیان تێدا بەکار براوە. سەبارەت بەم دوو چەشنە، دوو بڕوای جیاواز هەیە: یەکەمیان ئەڵێ شیعر پێش هەموو شت و پێش ئەوە کە وتارێکی وێژەوانانە و جوان بێ، پێویستە کەرەسەیەك بێ بۆ بزواندن و تێگەیاندن. جا ئەگەر قاڵبی وتارەکە ئەوەندە ڕەق بێ و وشەی ئەوەندە تەریك و تەعبیر و لێکدانەوەی پڕپێچ وقەمچی تێدا هاتبێ کە زۆربەی کۆمەڵ نەتوانن کەڵکی لێوەرگرن، جیاوازی چییە لەگەڵ شیعرێکا کە ناوەرۆکێکی دژی کۆمەڵی هەیە. هەندێکی تریش ئەڵێن شیعر ئەگەر ئەوەندە ساکار بێ کە تا ڕادەی وتاری ئاسایی نێوان خەڵکی گەڕەك و کۆڵان نزم بێتەوە، نابێتە شیعر؛ چونکە شیعر ئەبێ ڕەنگی عاتیفەی لێبدرێ و لەگەڵ زانستا جیاوازی هەبێ. بۆنموونە باسی پیاوێکی برسی، یا ماڵێکی بێدایك، یا دیمەنی ڕێگاوبانێکی کاتی پاییز نابێ لە شیعرا وەها بکرێ کە لە زانستا ئەکرێ.

لێکدانەوەی خەڵکی ئاسایی و دووالی ڕۆژانەیان چەشنێکی ساکارە لە زانست و شیعر. شاعیر ئەم چەشنە ساکارە زانستییە لە کارگای عاتیفەی شاعیرانەیدا بە ڕەنگ و ڕواڵەتێکی تارا بەسەراکشاو ئەڕازێنێتەوە و ناچار کەم و زۆر لە وزەی دەسکورتی خەڵك دوور ئەکەوێتەوە. ئەو تاقمە ئەڵێن شاعیر نابێ ناچار بکرێ کە وەك خەڵك ببینێ و لە ڕوانگەی خەڵکەوە بڕوانێتە سەر مەبەست. شاعیر ناچارییەکەی هەر ئەبێ لەمەدا بێ کە بە سوودی ئەو خەڵکە بیر بکاتەوە و مەبەستەکانی وەها نەبن کە زیانی گەلیان تێدابێ. لایەنگرانی ئەم بڕوایە کە ئەڵێن شیعر ئەگەر ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی هەبوو، با دیوی دەرەوە و فۆرمی شیعرەکەش دوور بێ لە دووالی ڕۆژانەی خەڵك، هەر هونەرە و هونەرێکی کۆلێکتیڤیشە collective. ئەڵێن شاعیر هونەرێکی عاتیفی ئەخوڵقێنێ و عاتیفە، یانی ڕووبەڕووبوونی موحەرێکاتی خاریجی و لێکدانەوەی دەروونی، یانی ئاوێتەبوونی زانست کە شتێکی نەگۆڕاوە و بە لای هەموو کەسەوە هەر یەك چەشنە

لەگەڵ ریەکسیۆن و عەکسولعەمەلی عاتیفی کە لە هەر نیهاد و دەروونێکا جیاوازی هەیە لەگەڵ نیهاد و دەروونێکی تر؛ لەبەر ئەمەیە کە لە هەر کەس بپرسێ دوودوو ئەکا چەند ئەڵێ ئەکا چوار. بەڵام بڕوای دوو کەس سەبارەت بە جوانی، کە باسێکە لە هەرێمی هونەرا وەك یەك نییە. یەکێك چاوێکی گەش و رەشی پێ جوانە، ئەوی تر چاوێکی نیوەخەوی شینی خۆش ئەوێ.

تا بەرنامەیەکی تر بە خواتان ئەسپێرین. شەوتان باش.

٥١/٨/٢٧

# ئاوات ئاوێکی خۆشە

هەر کە فەرهاد هات و دانیشت زانیم شەوێکی خۆشمان لەپێشە. من ماوەی ساڵێک بوو لەو ئاوایە سپای زانست بووم، کەمتر کەس ناوی منیان ئەزانی. هەر پێیان ئەکوتم ئاغای سپا یا ئاغای مودیر. من لە سنەوە چووبووم بۆ موکریان و بەڕاستی لەو ماوەیەدا بیووم بە ئەوینداری لەو هەموو جوانییە دەس لێنەدراوە کە هیچ پەڵە و خەشی تێکەڵایەتی تێدا بەرچاو نەدەکەوت. خوسرەو کوڕی ئاغابوو کە لە تاران گەڕابۆوە و هەموو لێواران ئەمدی کە بە بەرگی ئەفەلدییەوە، پێچێکی کوردی لەسەر بەستبوو و

چەند کتێبی بەژێر باوەشەوە گرتبوو، لەچوو بۆ چنارستانەکەی ئەوبەری رووبارە بچووکەکەی ئاوایی. وەفا و مەحموودیش هەڤاڵی من بوون کە هاتبوون سەرم لێبدەن. کۆمەڵی ئاوایی ئەوەندە بچووکە کە تۆ نەتوانی هەناسەی دانیشتووانی هەست بکەی. هەرچی هەیە لەبەر چاوە. تەنانەت چاوداگرتنی گەنجانی و ژوانی پاش مانگ هەڵاتنی ئێوەشەوانی. دێ ئەوەندەت لەگەڵ ئەبێتە خۆماڵی کە زوو بە زوو پرێسکەی دڵێت بۆ ئەکاتەوە و لەتکا بە هاوبەشی بزە و خۆشی و خەم و پەرۆشی. لەبەر ئەمە لاتان سەیر نەبێ کە هەر ئەو رۆژە کە وەفا و مەحموود بە سەری رووت و بەرگی شاریەوە و هەرکام بە جانتایەکەوە لەو ئوتوومبێلە کە کاروانی نێوان دێهاتەکانی ئەکرد دابەزین و لەبەر دەرگای قوتابخانەکەدا کە ژوورێکی کرابوو بە هۆدەی حەسانەوە و خەوی من، تەپ و تۆزی رێگایان لە خۆیان تەکاند. خوسرەو ئەم هەواڵەی زانی و هێشتا من تایبەتیترین پرسیارم سەبارەت بە «بەهار»ی دەزگیرانم مابوو کە لە هەڤاڵەکانمی بکەم، کە خوسرەو پەیدابوو.

زۆر زوو، زۆر مەبەستمان دۆزییەوە کە هەر چوارمان ئەمانتوانی لە بارەیانەوە بدوێین. لە باسی سینەماوە دەستپێکرا و خوسرەو بە گورجی بڕوای هەموومانی هێنا سەر لەوە کە فیلمی باش لە شەری باش کەمترە. پاشان باسی ڤیەتنام و ئەفریقای جنووبی و رۆدزیا کرا و هەمو ئەمانزانی بازرە بووین و وەسەر خۆمانی ناهێنین. لام وایە وەفا بوو لەبەر خۆیەوە گوتی:

«مالا یدرك کله یترك کله». من ویستم بڵێم هەڵەت کرد، بەڵام بزەی سەر لێوی تێی گەیاندم کە هەڵەکەی بە ئەنقەست کردووە و ئەیەوێ بڵێ سەرێ کە نایەشێ لە پرێسکەی مەبەستە.

مەحموود گوتی: «یدرك» ریشەکەی کوردییە و لە مەسدەری درکاندنەوە هاتووە و ئیتر بۆم دەرکەوت کە باس ناچارە بەرەو هەرێمێکی تر ئێخوڕێ و چ هەرێمێك

جوانتر و هەر لەگەڵ جوانیدا بێئازارترە لە هەرتیمی بژوێن و سەوزی ئەوین. هەستم کرد منی خانەخوێ لە سەرمە سەرەتای باسەکان دامەزرێنم، بەڵام نەترسام نەکا لە لایەن ئەو سێ گەنجە رووناکبیرانەوە بکەومە بەر هێرشی توانج. راستییەکەی پێم خۆش نەبوو دیسانەوە بۆ هەزارەمین جار گوێم لە کاوێژی وشەی بورژکراسی و پێچومۆرەی دامەزرێنەر و ئەم باسە پڕوپووچانە بێ. هەر چۆنێك بوو لێبڕام بە چەشنێ کە هەستیان نەژاکێنێ، باسەکە بگۆڕم. لە خوسرەوم پرسی لەگەڵ کچانی زانستگەدا نێوانی چۆنە، وتی «بێرناردشاو، نووسەری ئینگلیزی ئەڵێ: کچ دوو تاقمن.» وەفا بۆی تەواو کرد: «یا جوانن، یا زانستگایین» و هەموومان پێکەنین. ئەم پێکەنینە ڕێگای بۆ من کردەوە کە زیاتر لەسەر باسەکە بڕۆم: «ڕاستی کوڕگەل سەبارەت بە ئەوین بڕواتان چییە؟» هەر سێکیان بە یەکەوە کوتیان: «ئەوین؟» و من ڕاچڵەکیم و خۆم ئامادە کرد بۆ هێرش: «بەڵێ ئەوین. مەگەر شتێکی سەیرم پرسیوە.» خوسرەو کە ئەمەی لە دەربەگی بۆمابۆوە زۆر قسە بکا و کەم گوێ بگرێ، کوتی: «ئەوین نەجیبزادەیەکی لێکەوتووە کە ئەمڕۆ کەس خەتی ناخوێنێتەوە؛ یا مەلێکی گەرمێن و کوێستانکەر بووە کە سەدها ساڵ لێرەوبەر بەرەو گەرمێن بوەتەوە و هێشتاش نەگەڕاوەتەوە. خوا عالم کام ڕەشەبای توند باڵی شکاندووە، یا کەوتۆتە بەر شالاوی کام شمقارێی کۆترخۆر؟»

مەحموود لەبەر خۆیەوە کوتی: «بەرەو ڕۆژهەڵات چووە و لەوێ هێلانەیەکی گەرم و نەرمتری دروست کردووە.»

وەفا پرسی: «مەبەست لە ئەوین چییە؟» و من بۆم شی‌کردەوە: «مەبەست خۆشەویستی نێوان کوڕو کچێکە، یا لانیکەم لێرەدا مەبەست ئەمەیە.» تووڕە بوو کوتی: «تۆلە کەیەوە بەم بێ‌دەربەستییە کوفر ئەکەی؟ چی بۆتە هۆی ئەمە کە بووی بە پووشی سەر ئاو؟»

بە سەر خۆم نەهێنا و کوتم: «ئەوین لەگەر ئەوینی ڕاستی بێ یەکجار جوانە و

لەو شتانەیە کە ئەم هەموو هەناسەکێشانە، ئەم ژیانە بێبار و بێئاکامە لەسەر پیاو سووك ئەکا.» خوسرەو کوتی: «باشتر بوو لە شارا بمێنیتەوە و دەفتەری بیرەوەری بۆ کچان بنووسی.» وەك ئەمە لە توانجەکەی تێنەگەیشتبم، کوتم: «مەبەستم ئەوینی رۆمانتیك نییە. ئەو ئەوینە ئەڵێم کە لەسەر راستەقینەی ژیان دامەزراوە.»

وەفا کە هێشتا رقەکەی دانەمرکابوو کوتی: «ژیان؟ کام ژیان؟ هی ئەو کەسانە کە بە قامکی دەست ئەکرێ بیانژمێری؟ تۆ لە کوێی کاکی مامۆستای منداڵان؟ من لەو کاتەوە کە هاتووم، بۆنی ناخۆشی گەرەك و کۆڵانی رێ نازارم ئەدا، تۆ خەریکی لەم هۆدەدا کە سێبەری ناڵی هەژار، وەك گیانی سەرگەرداں سەمای تێدا ئەکا، تەدارەکی باڵەی «دەریاچەی قوو»م بۆ ئەگری؟»

کوتم: «وەفا، شەو کڕو کەرە و نیوەنووزەی تۆ بە گوێیا ناچێ. کە وەهایە هەرا مەکە با لانیکەم دەنگت نەنووسێ.»

خوسرەو ئەمەشی هەر لە دەرەبەگایەتی بۆ مابۆوە کە لای وابێ کەیخودایی و بڕیاری دوایی مافی ئەوە. کوتی: «شەوگار درێژە و عەبداڵ بە تاڵ. باسێکی تر بکەین.» بەڵام وەفا وەك بیەوێ کەنار بگرێ، هەستا و خۆی بە سەیری دەرك و دیوارەکەوە سەرگەرم کرد. ماوەیەك لەبەر دیوارێکی هۆدەکەما وەستا و پاشان کوتی: «گوێ بگرن! من دایکم نەخۆشە. ناوم ئاواتە. ئاغای مودیر ئەڵێ ئاوات ناوێکی خۆشە. ئەڵێ تۆ بە ئاوات ئەگەی. ئاواتم ئەمەیە، باوکم ئەمرۆ کە گەڕاوە بۆ ماڵ، ئەوەندەی پارە هەبێ کە دایکم بەرێ بۆ لای دوختوور.»

ئەم چەند دێڕە قوتابیەکی من لەسەر دیوارەکەی نووسیوو.

پێڵەنگییەك باڵی بە سەر هۆدەکەما کێشا. شەو لە دەرەوە رەشتر دیاربوو و زۆر حەستەم بوو کەسێ لە ئێمە لەو کاتەدا بڕوا بکا مەلی ئەوین ئەگەرێتەوە و لە پەنا شەتاوێك ئەنیشێ و زەمزەمەی ئاوازێك پڕ بە گەرووی ئەماسێ.

١٣٥١/٨/٢٩

# «پیتڕۆس دووریان»ی نەمر

سڵاوێکی بە تین لە ناخی دڵەوە پێشکەش بە گوێگری هۆگری هونەر. بە هیوایین بەرنامەکەتان بە دڵ بێ. لەم بەرنامەی ئەمجارەماندا باسی شاعیرێکی هەرەگەورەی ئەرمەنیتان بۆ ئەکەین و لە سەرەتادا وەرگێڕاوی شیعرێکی ئەو شاعیرەتان بۆ ئەخوێنینەوە، تکایە گوێ بگرن:

ئەگەر دێوی دزێوی مردن،

بە پێکەنینی ناحەزی هەمیشەیەوە

به سەرما بدا
گیان و دڵی پڕ خەمم لە ناو بچێ
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم!
ئەگەر چرای ژینم لە سەر سەرینی سەرەمەرگم
پڕشنگی ساردی دوایی بدا و دوا تریفەی بێ
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم!
ئەگەر زەنگی کلیسا، بانگەوازی مەرگم بکا
عفریتی مردن بە قاقا بکەوێتە شوێن تەرمی سارد و سڕم
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم!
ئەگەر پیاوانی نزاکار و
ژنانی شینگێڕ و رووداپۆشیو
لە دوای دارە تەرمم پرمەی گریانیان بێ
و داری عوود بسووتێن
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم!
ئەگەر بە ئەسرین و فرمێسکی چاوی کەژاڵی دەزگیرانم
بە ئاوی چاوی کەس و کار و دۆست و هەڤاڵم
کێلی گۆڕم بخووسێ
وا مەزانن من مردووم، من زیندووم!
بەڵام ئەگەر گۆڕی من بێناونیشان
لە گۆشەیەکی ئەم جیهانە پانەدا داکەوێ
و بیرەوەریم لە یادی خەڵکا بێرەنگ بێ
ئاخ... ئەو کاتەیە کە من ئەمرم!

چەپکە شیعریك بوو لە گوڵزاری ھەستی پیترۆس دووریان کە سەد ساڵ لە مردنی تێپەڕێ و بە واتەی خۆی ھێشتا زیندووە، چونکە گۆری، رووگەی لاوانی دڵپاکی ئەرمەنییە و بیرەوەرییەکانی لە یادی خەڵکا رۆژ بۆ رۆژ گەشتر و بە رەنگتر ئەبێ.
دووریان ساڵی ١٨٥١ی میلادی لە گەڕەکی ئەسکیوتاری شاری «ئەستەمبوڵ»ا لە دایك بووە و ھێشتا گوڵێك لە ھەزار گوڵی ژیانی نەپشکووتبوو کە گژەبای مەرگ تێکیەوە پێچا و رایماڵی. دووریان ٢١ ساڵ پتر نەژیا و ساڵی ١٨٧٢ی میلادی بە نەخۆشی ئازارەباریکە چاوی مەینەتکێش و دووربینی لە جیھانی بێبەبەت پۆشی.
باوکی «پیترۆس دووریان» ئاسنگەرێکی ھەژار بوو. لەبەر ئەمە شاعیری ئەرمەنی لە منالییەوە، رواڵەتی ترسێنەر و دزێوی ھەژاری و برسییەتی ناسی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا کە یارمەتی باوکی نەدا و ناچار بوو بۆ پەیداکردنی بژێوی خێزانەکەی کار بکا، توانی لە ساڵی ١٨٦٧دا خوێندنی ناوەندی تەواو بکا. دووریان بۆبەڕێبردنی خێزانەکە کە بە نەخۆشی دایکی و پیربوونی باوکی ھەموو قورسایەکی کەوتبووە سەرشانی ئەو، دەستی دا کاری جۆر بە جۆر. ماوەیەك کرێکاری کرد. پاشان لە چاپخانەیەکا خەریك بوو. ماوەیەك بە شاگردی چووە لای پزشکێکی دەواساز، پاشان ھەر چەند مانگێك لە شوێنێکا خەریکی کار کردن بوو. حیسابداری، سەڕافی، مامۆستایی قوتابخانە، وەرگێڕی، نەقشگێڕی تاتر، برێك بوون لەو کارانە کە «پیترۆس دووریان» کردنی بە پیشە.

جۆششی ھەستی شاعیرانە لە نیھادی پیترۆس دووریانی تازە گەنجدا لە ھەڵقوڵینی کانییەکی ژێر گاشەبەردێکی زل ئەچوو کە بە ھیچ بارێك رێگای نەبوو بۆ زەریە و زێ و نەدەزاندرا کە ئەو ئاوە روونە پاکە لە وشکارۆی دەشتێکی قاقڕو لە ژێر لەشی قورس و رەقی ئەو گاشەبەردەدا چۆن ئەجۆشێ و بناوانی ئەگاتەوە کام رووباری خورۆشان! ژیانی منالی دووریان جگە لە دووپاتە کردنەوەی شەوان و رۆژانی رەش و

سارد و پڕ مەینەت هیچی تر نەبووە. ئەی ئەم هەموو جوانییە، ئەم هەموو گوڵزار و بەهارە لە دەروونی پیترۆس دووریاندا پشکوتووی کام هەناسەی مەسیحاییە؟!

دووریان لە سێزدەساڵیا دەستی کرد بە شێعرکوتن و چەند نومایشنامەی نووسی کە هاتنە سەر شانۆ و ناوبانگی بە وڵاتا بڵاو بۆوە، بەڵام کاربەدەستانی تاتر لە گەنجی و ناتاجی دووریان بە سوودی خۆیان کەڵك وەر ئەگرت و زۆریان بۆ نەهێنا. لەو سەردەمانەدا بوو کە نومایشنامە هەرە بە نرخەکانی خۆی نووسی، وەك: «ناردا شیسی سەرکەوتوو» و «رووخانی بنەماڵەی ئەشکانی» و «گوڵی سوور و سوێسنە» و «خاکی رەش». هەموو ئەم نومایشنامەیانە لە لایەن خەڵکەوە بە باشی وەرگیران و بوونە هۆی ناوبانگ و خۆشەویستی پیترۆس دووریان. بەڵام جەرگی زامار و هەستی بەکەمگیراو و دڵی شکاوی دووریان بەم سەرکەوتانە نەهاتەوە سەرخۆ. هەژاری و دەسکورتی لە لایەکەوە و لە لایەکی ترەوە ستەمی نەتەوایەتی کە لە سەر ئەرمەنییەکانی ئەو کاتەی سەردەمی عوسمانی هەبوو، بەرز و نزمی بێ برانەوەی ژیان، ئەوەندەیان شاعیری بە هەستی ئەرمەنی شەکەت کرد کە ساڵی ١٨٧١ ئازاری سیلی گرت و لە جێگا کەوت. ساڵێك لەگەڵ دێوی زاڵی مردن دەستەویەخە بوو، پاشان لە تەمەنی ٢١ ساڵیا و پاش تەمەنێکی کورت و پڕمەینەت، بەڵام بە پیت و بەرەکەت دوا هەناسەی هەڵکێشا و گیانی بوو بە پەپوولەی باڵ زێڕینی گوڵزاری ئەوین و جوانی.

سەرەڕای تەمەنی کورت و کەم خایەن، پیترۆس دووریان چەن شاکاری گەورەی لە ویژەی ئەرمەنیا خوڵقاندووە کە بریتین لە ٩ مەقالە، ١٥ نامە، شێعرێکی درێژی شیوەنی، ١٣ نومایشنامە و ٤١ پارچە شێعر. ئەم شوێنەوارانە وەك گوڵێکی هەمیشەبەهار لە گوڵستانی ویژەی ئەرمەنیا ئەمێننەوە و هەرگیز سیس بوون و ژاکانیان بە سەرا نایە. شوێنەواری ئەو شاعیرە چەن جار لە ئەستەمبوڵ، بەیرووت، ئێرەوان، ویەن، باکۆ، وێنیز، نیویۆرك و حەڵبا لە چاپ دراوە. «سەمبات پانۆسیان»

هەڵسەنگێنەری ئەرمەنی سەبارەت بە دووریانی شاعیر ئەنووسێ: «لە ناو ئاسمانی تەمگرتووی وێژەی کۆنی ئەرمەنییا، شێعرەکانی پێترۆس دووریان ئەڵێی پەلکە زێڕینەیەکی هەمیشەیین».

بەڵێ گوێگری بەڕێز، بەم چەشنە سەرپەنجەی هونەر، زەمان و کات ئەکا بە دیلی کۆششی زاڵی خۆی و مردنی لەش بە هۆی دەستی عیسای هونەرەوە ئەبێتە هەرمان و ژیانی هەمیشەیی بۆ گیان. لەگەڵ پێترۆس دووریان دووپاتەی ئەکەینەوە، ئەگەر ئەسرین و فرمێسکی چاوی کەژاڵی دەزگیرانم و ئاوی چاوی خزم و کەس و کار و مناڵانم کێلی گۆڕەکەم بخووسێنن وا مەزانن کە مردووم، کاتێ ئەمرم کە گۆڕم نەناسراو بێ و یادم لە دەروونی خەڵکا نەمێنێ.

پاش سەد ساڵ ئەمڕۆ ئەنترۆپۆلۆژیستێکی هەرە گەورەی ئەرمەنی لە ئێرەوان، خەریکی دارشتنی پەیکەری ئەو شاعیرەیە.

راستی مردن پارووی گەورەی پێ قووت نادرێ. پیاوانی مەزن بە گەرووی تەنگی مەرگدا ناچن. مەرگ بۆ ئەوان خەوێکی خۆشی ئەبەدییە و گەشتێکە لە ئەسیری لەشەوە بۆ ئازادی گیان.

تا حەوتەی داهاتوو خواتان لەگەڵ.

شەوتان خۆش.

# پرشنگی هەتاوی بیری غەزالی

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ.

کاک ئیسماعیلی عەلی بابایی، سپای زانست لە مەریەندەوە پرسیاری کردووە: «ئیمام محەممەدی غەزالی کێیە؟ ئاخۆ لە ریزی نووسەرانە یا فیلسووفان و یا ئەندامێکی کۆمەڵی عارفان و خواناسانە؟»

برای خۆشەویست. وادیارە خۆت لەبارەی غەزالییەوە گەلێک شت ئەزانی، چونکە پرسیارەکەت هەموو شتێکی لێ دەرئەکەوێ. غەزالی هەم نووسەرە، هەم

فیلسووف و هەم خواناس، بەڵام داستانی ژیانی ئەو زانایە لە دوو قۆناخی جیاواز پێکهاتووە. لە قۆناخی یەکەمی ژیانیا زانایەکی گەورەی ئایینی بوو و لە قۆناخی دووهەما واتە لە تەمەنی ٣٨ ساڵیا ڕێگای فەلسەفە و عیرفانی گرتە پێش، بەڵام فەلسەفەی غەزالی لە ئەخلاق و ڕەوشتی ئینسانیا کورت کرابۆوە و لە ڕاستیا فەلسەفەی عیرفان و خواناسی بوو. غەزالی لە ساڵی ٤٥٠ی کۆچیدا لەدایك بوو. باوکی جۆڵا بوو و خۆی بە منالی دەستی کرد بە خوێندنی زانستی و ئایینی و لە ماوەیەکی کورتا ناوبانگی بە هەموو وڵاتە ئیسلامیەکانا بڵاو بۆوە. لە ساڵی ٤٨٨دا لەپڕ گۆڕانێکی سەیری بەسەرا هات. دەرس و مەدرەسە و قیل و قاڵی بەجێهێشت و بەرگی مەلایانەی داکەند و ئاوارە و ڕەبەن دەستی کرد بە گەڕان. ماوەیەکی زۆر لە دوودڵی و گومانا مایەوە تا لە ئاکاما مرازی خۆی لە ڕێگای عیرفان و سەیر و سلووکا دۆزیەوە. ئەم چەشنە ژیانە لە ژیانی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی ئەچێ. سەعدی خوالێخۆشبوو دژی ئەم تەریکی و تاکیە بووە و ئەڵێ:

شیخی بـه سوی مـدرسـه آمـد ز خـانـقـاه
بشکـست عـهـد صـحبت اهل طـریق را
گـفـتـم میـان عـالـم و عـابـد چـه فـرق بـود
تـا اخـتـیـار کـردی ازآن ایـن فـریـق را
گفت: این گلیم خویش بەدر می‌برد ز موج
وان جـهـد مـی‌کـنـد کـه بـگیـرد غـریـق را

غەزالی پاش ئەم هەموو سەرگەردانییە، ڕێگایەکی ڕاستی بۆ گەیشتن بە بەختیاری ڕاستی دۆزیەوە و تا کاتێ مردن هەنگاوی ئەوی لە پیاسە خست، لە بڕینی ئەو ڕێگایە ماندوو نەبوو. «کیمیای سەعادەت» کە بە نەسرێکی جوان و ڕووح‌سووك و لەبەردڵان و بە شێوەیەکی ساکار نووسراوە و هێندێك کەس بە شاکارێکی وێژەیی ئەزانن،

دەسکەوتی ئەو سەیر و سەفەرەیە. کیمیای سەعادەت، دائیرەتولمەعارفی کامەرانی و رزگاری، گاهێ ئەوەندە لە هەرتیمی گیان و هەستی ئادەمیزاد نزیك ئەبیتەوە کە لێدانی دڵی مرۆڤایەتی لە ناو دێرەکانیا دێتە بەرگوێ. زۆر دەستووری ئەخلاقی ئەوتۆی تێدایە کە لە رەوانناسی و مەعرەفەتەلرووحی ئەمڕۆشا بە ئەسڵ و پایەیەکی نەگۆڕاو ناسراوە.

وەك ئەمە کە ئەڵێ: «دڵی پاکی منالّ وەك گەوهەرێکی هێژا وەهایە، وەك مێو نەخش هەڵگرە و هێشتا هیچ گەردێکی لێ‌نەنیشتووە. وەك زەوی بەیاری بەرپژە و هەر تۆوێکی لێ‌بچێنی دێتە بەر، هەر کارێکی کە بە دەس پیاوێکی گەورە جێ‌بەجێ ئەکرێ بە منالّی لە نیهادیا هەوێنی بەستووە.» غەزالی کردەوەی باش و بیرکردنەوەی باش و خۆبەختکردن لە ڕێگای مرۆڤایەتیا ئەکاتە سەرمەشق و تەنانەت گیاندارانی تریش ئەهاوێتە داڵڵەی بەزەیی خۆیەوە و ئەڵێ: «پیاوی گەورە بەم تایبەتییانە دەرئەکەوێ و ئەناسرێتەوە؛ خۆبەکەم‌گرتن، خۆهەڵنەکێشان بەسەرخەڵکی ترا، بیری باش کردنەوە، لێبووردن و خۆبەختکردن، درۆنەکردن، بەرگی ساکار و خواردەمەنی ساکار و جووڵانەوە بە پێی زانستێ کە هەیەتی.»

پاشان ئەڵێ: «کوڕم بێگومان‌بە کە زانستی ئەزەری یارمەتی مرۆڤ نادا. ئەگەر پیاوێك لە بیابانێکا دە شمشێری هیندی و چەکی تریشی هەبێ و خۆیشی زۆر پاڵەوان و شەڕکەر بێ و شێرێك هێرشی بۆ بێنێ، بە شەرتێ لە چەکەکانی کەڵك وەرنەگرێ، مەترسی لێ دوور ناکەوێتەوە و ئەگەر زانایەکیش هەزاران مەبەستی زانستی بخوێنێ و فێریان بێ بە شەرتێ لە کردەوەدا کەڵکیان لێ‌وەرنەگرێ، لە هەڵەکردن و سەرلێ‌شێوان ناپارێزن.»

غەزالی لە جێگایەکی ترا ئەڵێ: «کاری پیاوان دان‌بەجەرگاگرتن و بەشێبەیی‌بوون و سەرلێ‌نەشێوانە. لەگەڵ خەڵکا رووخۆش بە و هەموو کەس لە خۆت پێشتر بگرە، تا لە دڵی خەڵکا جێگات هەبێ. کۆمەڵ بانگ کە بۆ کاری باش و وریایان

بکەوە کە چەوت نەڕۆن. کەسێك کە ئەم دوو دەستوورە بەڕێوە نەبا بەرەبەرە دڵی ڕەش ئەبێ و جیاوازی نێوان باش و خراپ نازانێ. کەسێك کە نیازمەندە و ئاتاجە، چاکەی لەگەڵ بکە، ئەگەر لە دەستت ئەهات هاودەردی بە. هیچ کەس شیاوی ئەوە نییە کە بە برسییەتی سەربنێتە سەرسەرین.» ئەم وتەی غەزالی یەکجار بە کەڵکە. زۆر جار بیستراوە کە ئەڵێن ئەمە کاری خودایە، کەسێك هەژار و نەدار و نەخۆش و دەسکورت بێ. بەڵێ ڕاستە کە خودا شارەزایە کە ئادەمیزاد چی بەسەر دێ و چارەنووس ئەزانێ؛ بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگە کە خودا بیەوێ کەسێك لە کەسێکی تر بەختەوەرتر بێ.

غەزالی فیلسووف و زانایەکی بێوێنە بووە و تەمەنی لە لێکۆڵینەوە و نووسین و ئامۆژگاریکردنا، بەسەربردووە. شوێنەوارە بەرزەکانی بۆتە هۆی ئەمە کە ناوبانگی لە ئورووپای سەدەکانی ناوەڕاستا بڵاو بێتەوە و کار بکاتە سەر بیر و بڕوای فیلسووفانی ئورووپایی. دیکارت سەدها ساڵ پاش غەزالی ئەڵێ: «من بیر ئەکەمەوە، من هەر ئەوەم کە هەم» ئەمە هەر وتەکەی غەزالییە کە کوتوویە: «بیر کردنەوە بەڵگەی هەبوون و وجوودە.» کانت و بیلز پاسکاڵ دوو فیلسووفی تری ئورووپایین کە زۆریان کەڵك لە نووسراوەکانی غەزالی وەرگرتووە.

ئیمام محەممەدی غەزالی، فەلسەفەی هەر تا ئەو جێگای قوبووڵە کە یارمەتی بدا بە بەرزبوونەوەی گیانی مرۆڤایەتی و ڕەوشتی پەسندکراو. لەبەر ئەمە ئەتوانین بڵێین کە غەزالی فیلسووفێکی ئینساندۆست و ئەخلاقپەرستە. غەزالی هەموو توانای خۆی تەرخان کردووە بۆ نواندنی خۆی. باش وخراپ لە دەروونی ئادەمیزادا بە هەمو هێزێکەوە لایەنگری ڕەوشتی جوان ئەکا و هەڵمەت ئەباتە سەر خدەی خراپ و ناپەسند. بە زمانێکی ساکار خەڵك تێئەگەیەنێ کە ژیان لە ڕوانگەی مرۆڤایەتییەوە چییە و ئەڵێ:

«ئەگەر ئەتەوێ باری ژیانت لەسەر سووك بێ خۆت لە تەماع دوور بگرە و زۆر بە خەمی سامانەوە مەبە! چاوەڕوانی ڕاستی لە تەماعکار مەبە و لە نیهادی بێبنیچە و

بێ‌خانه‌دانا به شوێن ئه‌مه‌ك و وه‌فادا مه‌گه‌ڕێ.»

«... پیاو ئه‌و پیاوه‌یه كه له‌گه‌ڵ هه‌مو كه‌س باش بێ، بێ‌ئه‌وه‌ بیر له باشی و خراپیان بكاته‌وه. دڵ چه‌شنی ئاوێنه‌یه و خووی خراپ چه‌شنی دووكه‌ڵ ئه‌و ئاوێنه‌یه تاریك و لێڵ ئه‌كا. باشی له‌گه‌ڵ به‌نده‌ی خودا گه‌وره‌ترین خواپه‌رستییه.»

ئه‌مه چه‌ن وته‌یه‌كی كورتی غه‌زالی بوون، كه‌سێك كه‌ بیه‌وێ باشتر له فه‌لسه‌فه‌ی ئه‌و خواناسه تێبگا په‌ڕاوی كیمیای سه‌عاده‌ت بخوێنێته‌وه زۆر به كه‌ڵكه.

تا حه‌وته‌ی داهاتوو به خواتان ئه‌سپێرین. شه‌وتان باش.

# رووبەندی شار

چەن ساڵ تەریك بووم لە هەوای بژوێنی بنار و وردموردە خەریك بوو لە بیرم بچێتەوە ژیانی لادێ؛ بەرەبەرە بۆنی دووکەڵی شاری گەورە کە چەشنی تووتنی خاو گەرووگر بوو، جێگای بۆنی مێخەکی بەرۆکی کچی لادێ و هەناسەی زیندووکەرەوەی شنەی بەربەیانی دۆڵی پڕ گوڵی کێوی لەبەر لووتم نەگرتەوە. لە شاری بە زەنا زەنا ئاخنراوەوە رووم کردە لادێی بێدەنگ. نەتکوت لە چەقەخانەی مزگەوتی وەرزی زستانەوە چوومە ناو کۆڵانی دێ. بەیانی زوو بە جرووکە و جریوەی سێروو و چۆلەکە لە

خەو هەڵدەستام. سەرلکی دار هەر جمەی ئەهات. جار جار وەك پەڵە هەورێکی بچووکی رەش ئەرِەوین و دیسانەوە یەکتریان ئەگرتەوە. پەرەسێلکە وەك یادێك کە خۆی لە پەردەی بیرەوەریمدا بنوێنێ و ماوەیەك کورت بخایەنێ و پاشان لە سنووری تەمگرتووی خەیالا گوم بێ، بە بەردەمی پەنجەرەی ئاواڵەی ژوورەکەما هەڵئەفرِین و من تەنیا وشەی باڵیان و جریوەی تێکرِایانم بۆ هەست ئەکرا. هەموو شت لەم بیەنگییەدا کەڵکەڵەی بیر و خەیاڵی ئەخستە مێشکەوە. بیری هەبوون. بیری هەرمان و خودا. بیری ئەوین و ژین.

هێشتا کۆڵانەکانی دێ بزەی بوومەلێڵیان ئەکردبوو بە قاقای خۆرەتاو کە من ئەچوومە سەر تەپکەی بەردینی بەرامبەر بە ئاوایی. لە پەنا بەردێکا کە هێشتا زۆری مابوو تیشکی گەرمی خۆر فێنکایی سایەقەی شەوی لێوەرگرێتەوە پاڵم ئەداوە و ئەمروانییە ئاوایی کە چەشنی کۆترێکی خەوتوو سەری لە ژێر باڵی دەردەهێنا و چاوی بە هەر چوار لادا ئەگێرِا و تاسەی فرِین گەرووی پرِبەستەی ئەماساند و باڵی لێکئەدا. پۆلێکم ماڵ ئەدی کە هەرکام چەند بەرخۆڵەی بچووکیان وەپێش داوە و بەرەو دەری دێ ئەیانبەن. دەنگی مەشکەژاندن و لرکەی کابانی مەچەك خرِ ئەبوون بە مێلۆدی ئاوایی. لە پشت سەری منەوە، خۆر وەك تەشتێکی مسی پرِ ئاگر دەرئەکەوت و سێبەر و تارمایی لەبەری ئەرِەوین. کۆرپلکەی بەردی لە ژێر پرِشنگی هەتاوا وەك چاوی شینی کیژێکی تازە لە خەو هەستاو تروسکەی ئەهات. رەنگی تاراوی کانیاوێکی بچووك بە هەڵاتنی خۆر ئەگەرِایەوە بۆناو هەموو دڵۆپەکان و لە گەردەنی زەرد و زۆڵی جارِە گەنمێکی درووێنەکراو ئەبوو بە ملوێنکەی مرواری.

خەریکی بیرکردنەوە بووم و گەیشتبوومە سەر ئەو مەبەستە کە هەندێ لە ئادەمیزادان لە شاری گەورەدا لە ناو کۆشکی چەند نهۆما بە هەزار دەزگای وردەکاری سنعاتی، سامان و دارایی خۆیان بۆ ناژمێردرێ و هەندێکیش لە ئاواییە بچووکەکاندا بە

قامکی تاکه دەستێك سەروبەری ماڵ و سامانیان لێکدەدەنەوە.

دەستێکی میهرەبان کەوتە سەرشانم و دەنگێکی پیاوانە و کەمێك گڕ کوتی: «بەیانی باش!» لام سەیر بوو کە ئەم دەنگە هی ئەم گەنجە بێ کە بێگومان بە هەموو تەمەنی نەیدەکردە بیست بەهار. ئێمەی راهاتووی ترس و خۆگرتنی شار، بە هەڵکەوت نەبێ بەم ساکاریە مل دانەوێنین بۆ راستەقینەی برایەتی و بەرەی ئادەمیزاد. کەم کەس هەیە لە شاری گەورە، رووبەندێکی بە رووەوە نەگرتبێ بۆ ئەوە خۆی لە ژێرا بشارێتەوە. ئەو سڵاوە بە رواڵەت گەرم و گورانەی ناو داڵانی ئیدارەکان، کڵاو هەڵگرتنی ناو شەقام، خوڵك‌کردن و فەرموو کوتنی ناو کوڵان، کەمی وا هەیە هی ئەو کەسە بێ وا لە ژێر رووبەندەکەدایە. ئێمە تەواوی تەمەنمان نەخش ئەگێڕین و گاهێ لە بیرمان ئەچێتەوە کە خۆمان چین و کێین و چیمان ئەوێ. تەنانەت لەناو خاووخێزانیشا کەم وا هەیە رووبەندەکەمان دارنین و بیبینەوە ئادەمیزادێکی بەراستی کە ئەتوانێ بێ ترس بڵێ «خۆشم ئەوێی.» ناچارم بڵێم لە خەویشا رووبەندەیەك ــ کە لە پێشا ئەمانکوت ئەبێ هەمانبێ، چونکە «شار شاری کوێرانە» و رووبەندە دەستێکە بۆ گرتنی بەر چاومان ـ هەر بە رووەمانەوەیە، چونکە ئیتر رووبەندە نییە، ئەندامی خۆمانە. تەنها کاتێ کە ئەچینە لادێ و ئەم هەموو ساکاریە، ئەم هەموو رەفتارە سروشتییە ئەبینین، هەست ئەکەین کە رووبەندەی شار کەڵکی نەماوە.

گەنجەکە لەلام دانیشتبوو. چاوی لە پۆلێك کچ بڕیوو کە لە کانیاوەکەی خوار دێوە ئەگەڕانەوە. خۆرەتاو لە سەر کولۆنجەی مەخمەر و ئەتڵەس و کراسی زەرد و سووریان سەمای ئەکرد. لاوەکە کوتی: «ئەوەیانە وا گۆزەیەکی سووری بە سەر شانیەوەیە! بڕوانە بەژن و باڵای، ئەڵێی بەختی خودا پێداوانە، راست و هەڵچوو. هەموو ساڵێ کاتی دروێنەی گەنم ئەیەمە ناو گەنمەکان، ئەگەر گوڵی گەنمەکان بە ئەندازەی بەژنی نازەنینی بەرز بن، ئەو ساڵە داهاتمان باش ئەبێ. لەم دوورەوە بەر چاو ناکەوێ.

پرچی وەك تووی کاخڵی و ریشی گوڵە پێغەمبەرە زەردە. لار و لەنجەی لە کەرویشکەی گەنم و جۆ جوانترە. دەنگی لە قاسپەی کەو دڵڕفێنترە.» کەمێك روانی بۆم و کەمێك بە شەرم و دڵشکاریەوە گوتی: «نا، سوودی نیە. وا دیارە تێناگەی ئەڵێم چی.» پاشان بێ ئەوە هیچ بڵێ هەستا و گورج و گۆڵ رووی کردە هەورازی پشتی تەپکەکە. بیرم کردەوە، ئەمانە چەند دڵناسکن. چەند زوو هۆگر ئەبن و چەند زوو سڵ ئەکەن. ئاخۆ بۆ ئێمە زۆر سەخت و دژوار نیە پردێك هەڵبەستین بۆ هاتوچۆی دڵی ئێمە و ئەوان؟! ئاخۆ هەر قسەی زل نیە ئەوانە کە لە هۆدەی پڕ لە دووکەڵی چغارە و پڕ لە کتێبی کۆمەڵناسیدا ئەیانڵێین؟!

تا حەوتەی داهاتوو بە خوای گەورەتان ئەسپێرین.

رەزبەر

# ئادەمیزاد و ئەتیا و هونەر

سەلام لە گوێگری بە هەست و هونەرپەرەست. [illegible]

ئادەمیزاد تاقەدارێکی تەریك نییە لە دوورگەیەکی گەمارۆدراو بە حەوت دەریا. لە پایانی بێ سنووری هەبوونا. ئادەمیزاد بەشێکە لەو پەیکەرە کە پێی ئەکوترێ کەون و لەگەڵ بەشەکانی تری هەبوونا پەیوەندی راستەوخۆی هەیە. ئادەمیزاد تێکەڵ و ئاوێتەی کۆمەڵە کە لە جەمبوونەوەی ئادەمیزادانی تر پێکدێ. هەروەها تێکەڵە لەگەڵ شت؛ واتە ئەو شتانە کە زیندوون و زیندوو نین. با نەچینەوە سەر ئەو باسە فەلسەفییە کە برواڵێ

وایە ئادەمیزاد لە جیمادیەوە بوو بە نامی، پاشان بووە بە زیندوو و ئەمجار بوو بە ئینسان و لە ئینسانیەوە بەرزتر ئەبێتەوە بۆ پلەیەکی ئەوتۆ کە ئاوەزی بەشەری ناگاتێ! ئێمە لەم بەرنامەیەدا باسی ئادەمیزاد و ئەشیا ئەکەین بە لێکدانەوەیەکی ویژەیی و هونەری ئەڵێین ئادەمیزاد لەگەڵ ئادەمیزادی ترا ئەژی و لە ناو ئەو شتانەدا ئەژی کە دەوریان لێداوە.
ئاخۆ ئەو هەوایە کە ئادەمیزاد هەڵیئەمژێ، ئەو ئاوە کە ئەیخواتەوە، ئەو هەتاوە کە گەرمی ئەکاتەوە و گوڵی بۆ ئەپشکوێنێ و ئەو بارانە کە بە سەر کێڵگەیا ئەبارێ، هەموویان شت نین؟! تەنانەت ئەو درکە کە لەپێی رائەچێ و ئەو بەردە کە سەری ئەشکێنێ، بە کورتی هەموو ئەو شتانە کە خێر و خۆشی ئەدەنێ یا خەم و تاڵی بۆ پێکەهێنن، لە هەبوونی ئادەمیزاد کارێکیان بە دەستە و دەورێك ئەگێڕن!
ئاخۆ لەزەت و خۆشی ئایێتە مانای ژیان و خەم و پەژارە و دەرد و کەسەر و ئەخۆشی لەوپەری خۆیا، ئاگاتە مردن؟!
کە وەهایە ئایا مەرگ و ژیان دوو شت نین و ئێمە ناتوانین مانای شت ئەوەندە بڵاو بکەینەوە کە تەنانەت مەرگ و ژیانیش لە هەرێمی دەسەڵاتیا جێی بێتەوە؟!
تەنیا شت، واتە ئەشیا نین کە لە ئادەمیزادا تەئسیریان هەیە، ئادەمیزادیش کار ئەکاتە سەر شت. ئەیگۆڕێ، لێکی ئەداتەوە و شتی لوێتر پێکدێنێ. پێوەندییە کە لە نێوان ئینسان و شەیئدا هەیە، ژیانی بیر، واتە حەیاتی زیهنی ئادەمیزادە کە بە زمانی فەرەنگی پێی ئەکوترێ mind (مایند).
ئادەمیزاد کاتێ بە لەش و بە ئاوەز و تاقیکاری لەگەڵ شتا رووبەڕوو بێ، زانست لەو بەرەنگاریە پێکدێ. بۆ نموونە هەوا ساردە، لەشی ئادەمیزاد ئەتەزێ و ئازار ئەبینێ. جارێك و دووان و سیان، پاشان ئادەمیزاد کەوڵی حەیوانێك کە خۆی راوی کردووە بە خۆیا ئەپێچێ، هەست ئەکا گەرمی بۆتەوە. ئەوجار بۆ بەرگری لە سەرما کەوڵ بە خۆیدا ئەدا. بۆ ئەوە کە کەوڵەکە باش بە لەشیەوە بچەسپێ و لە کەلێنەکانیەوە «با»

لەشی ئازار نەدا، کەوڵەکە ئەدووڕێ و وردەوردە ئاوەز و تاقیکاری یارمەتی یەك ئەدەن و بەرگ بە چەشنێ کە ئەمڕۆ هەیە دروست ئەکرێ و ئەمڕۆ زانستی ئادەمیزاد کە لەو تاقیکاریە وردە وردانە پێکهاتووە، زۆر شت لەم بارەیەوە ئەزانێ. ئەزانێ کە بەرگی ڕەش گەرما زیاتر ئەگرێ؛ خوری لە لۆکە گەرمترە و بۆ هەموو ئەو زانستانەش بەڵگەی عیلمی بە دەستەوەیە. ئەمە بەرەنگاربوونی لەشی ئادەمیزاد بوو لەگەڵ تەبیعەت. هەر وەك کوتمان ئادەمیزاد کاتێ کۆسپێکی لە سەر ڕێگایا هەست کرد، هەوڵ ئەدا لای‌دا. ئەم هەوڵە ئەبێتە هۆی گۆڕانی تەبیعەت و تەبیعەت جگە لە کۆمەڵی ئەشیا شتێکی تر نیە. بەڵام ئادەمیزاد بە بارێکی تریش جگە لە لەش لەگەڵ ئەشیا واتە شتی سروشتیا ڕووبەڕوو ئەبێ. بە باری عاتیفی و زێهنی و لەم بەرەنگاربوونە ناسینی هونەری، واتە مەعرفەتی هونەری پەیدا ئەبێ. ناسینی هونەری بێگومان هەوێنی ئەسڵی خۆی لە ئەشیا و تەبیعەتی دەرەوە ئەگرێ. بەڵام لە زێهنی ئادەمیزادا ئەڕازێتەوە و بە چەشنێ دەردێ کە هونەرمەند ئەیەوێ. بە جۆرێکی تر بڵێین هونەرمەندیش هەروەك زانا، کاری بە شتەوە هەیە و لەگەڵ شت تێکەڵە و شت وەرئەگرێ و ئەیگۆڕێ و زۆرتر لە زانا خەریکە واقعیەت و حەقیقەت لە یەك نزیك بکاتەوە.

واقعیەت ئەو حاڵەتەیە کە ئەشیا لە دەرەوە هەیانە. وەك ساردی هەوای زستان و ژاکانی گوڵ و کزبوونی باری جوانی ڕەوشت لە کۆمەڵا. بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە ناشێ وەها بێ. واتە ئادەمیزاد باش نیە خۆی باشی وەلا نێ. هەروا باش نیە ئادەمیزاد ئازار بدا و ڕەوا نیە گوڵ سیس بێ و هەڵوەرێ. لە هەناوی هونەرمەندا حەقیقەت یانی جوانی. جان کیتس john.keats شاعیری ئینگلیزی ئەڵێ: «جوانی حەقیقەتە و حەقیقەت جوانییە. ئەوەیە ئەو شتە کە لە سەر زەوی ئەیزانی و ئەبێ بیزانی.»

زانا شت ئەبینێ. تایبەتیەکانی شت ئەناسێ و ئەیانباتە کارگایەکەوە کە پایەی لە سەر لێکدانەوەی ئاوەز و تاقیکاری دانراوە. مێشك هەر ئەوەندە یارمەتی زانا ئەدا کە

واقیعیەت هەڵبگرێ. لەوپەڕی واقیعیەتا جیهانی زانست جگە لە تاریکی هیچی تری بەرچاو ناکەوێ. زانا ئەروا بەرەوپێش، بەڵام پێ بەپێی واقیعیەت. بەرد رەقە و بێ ئەوەی بە فێڵێکی زانستی و بە ڕێگایەکی عیلمیا چارە نەکرێ، نەرم نابێ. زانا ناچارە راوەستێ و ئەو ڕێگایە بە هەڵسەنگاندنی ئەو دەسکەوتانە کە هەیەتی و ئەو تاقیکاریانە کە کراون بدۆزێتەوە. بێ دۆزینەوەی ئەو ڕێگایە زانا دەستی بەستراوە، بەڵام هونەرمەند وەها نییە. لە کارگای ئەوا کە برتییە لە هەرێمی بیر و زێهن، بەرد زوو نەرم ئەکرێ. ئەوندە بەسە کە کابرایەك زۆری خەو بێت تا بەرد لە ژێر سەریا نەرم بێ وەك پەڕی قوو. یا کێشەری ئەوین بیکێشێ تا بەرد لە ژێر پێیا بێتە مافوورەی نەرم. ئەمانە لە زانستا ناکرێن چونکوو زانست کاری بە لێکدانەوەی دەروون و ماتیفەوە نییە، بەڵام لە خەیاڵی شاعیرا و بە تەسویر و نەخشی زێهنی واتە ئیماژ (image) باش ئەکرێ؛ هەر وەك زانا تەجرەبە و تاقیکاری و دەسکەوتە زانستییەکانی پێشووی هەیە، یارمەتییان لێوەرئەگرێ؛ هونەرمەندیش کەڵەپووری زانیاری کۆمەڵی خۆی لە پشتە و یارمەتی ئەدەن. میراتی فەرهەنگی، رێ و شوێنە ئاینی و فەلسەفی و زانستی و هونەرییەکانن کە هونەرمەند زیاتر لە سونەتی دینی و هونەری کەڵك وەرئەگرێ.

شاعیرانی ئێرانی و ئیسلامی لە چارەنووس و بە سەرهاتی مەنسووری حەللاج کەڵك وەرئەگرن. هەر وەك حەللاج ئەڵێ: «انا الحق»، شاعیریش بۆی هەیە بڵێ: «انا الشیء». ئەزانین کە حەللاج خودا نەبوو و ئەشزانین خۆی لای وابوو درۆی نەدەکرد و بە راستی لای وابوو لە کاتی جەزبەدا خودایە. لە بەرچی ؟ چونکوو لەگەڵ خودا واتە ئەو وجوودە کە هەبوونی بە دەستە و هەر بووە و هەرماوە لەو سەری هەبوونەوە تا ئەوپەڕی هەبوون دەسەڵاتی بووە و ئەبێ؛ تێکەڵ ئەبوو؛ وەها تێکەڵ بوونێك کە خۆی نەئەناسییەوە. چەشنی دڵۆپێك کە ئەچێتە ناو دەریاوە و ئەبێتە دەریا و ئەشزانین کە شاعیر شت نییە و ئادەمیزادە. بەڵام شاعیری بەراستی کە ندای

«اناالشیء» ھەڵئەبڕێ و بانگەوازی «لافی‌جبة الآ الشیء» ئەدا بە راستی لە جبەی دەروونیا جگە لە شت واتە کەرەسەی سەرەتایی پێکھاتنی سروشت ھیچی‌تری نییە.
شاعیر ئەگەر توانی ببێتە بەرد، ببێتە گژوبا، ببێتە خاڵی سەر گۆنای کیژێك، تفەنگی دەستی لاوێك، شەونمی سەر پەڕەی گوڵێك، گریی گریانی سەر چاوێك، ئەگەر توانی ببێ بە ژیان و ببێ بە مردن، ئەتوانێ ببێ بە شاعیرێکی باش.

٥١/١٠/٦

# غەریبی

شەویان شوورەیی کردبوو بە قسەی پڕوپووچ. هەندێ کوتبوویان کە بەیانی ڕاوی قەل مراوی و پۆڕ خۆشە و هەندێك لایەنگری ڕاوی کەروێشك بوون. سەری شەو هەندێ لە ڕەشاییەکان یا لە سەرمای ماڵەکەیان ڕایانکردبوو یا لە بۆڵەی خێزانیان لە بەر نەکڕینی کەلوپەل و لێنەکردنی زمهەریی زستان و کەوتوویی ماڵەکەیان، لە ماڵ تاراندبوونی و ڕوویان کردبووە دیوەخانی ئاغا؛ یا گزیر دەنگی دابوون بەیانی بەفری سەربانی ئاغا بماڵن و هاتبوون بڵێن وەرەوەرەیان نییە یا پاڕێنەوە کە بەیانی نەچن بۆ شار

و ماڵەکەیان ئەبەن بۆدەرمانگا. بەڵام پاش ماوەیەك دێ دامرکابوو. دەنگی لوورەی گورگ و وەڕەی سەگ تێکەڵ لوورەی بای ساردی زستان ببوو کە بەفری لە کوڵانەکان راتەپێچا و تەیکرد بە گەردەلوول و چاڵ و قوولی تێکتەکردەوە. سەرما، وەك گیانی مردووی سەرگەردان خشکەی تەکرد بۆکەلێن و قوژبنی ناو ماڵەکانی ئاوایی، بەڵام لە دیوەخانی ئاغا کڵپەی سۆبە بە قەڵاشکاری وشك، لەشی پیاوی خاو ئەکردەوە و مزگێنی خەوێکی خۆشی پێوە بوو، بەڵام شەو درێژ و عەوداڵ و بەتاڵ.

ئاغا لە پەنا سۆبەی گەرموگوڕ دانیشتووە. دەست و پێوەندی هەندێ بە پێوە و هەندێ لە سەر ئەژنۆ دانیشتوون. شەویلکەش گاهێ بە شەوچەلە و گاهێ بە قسەی پڕوپووچ ئەبزوێ. بێدەنگی هی ئەو کەسانەیە کە خەمیان هەیە.

سەری شەو دیتم کابرایەك وەك سێبەری هەورێك کە بۆ ماوەیەکی کورت پەڵەیەکی بۆر بخاتە سەر زەوی و تیژ تێپەڕێ هاتە ناو دیوەخان، بەڵام کەس نە رووی تێکرد و نە تەنانەت زانی کە کەی هات و چەندە وێستا و چۆن چووە دەرەوە. من لە کۆڕی دیوەخانا وەك پینەیەکی ناحەز لە سەر بەرگێکی تازە وەها بووم. لە قەت تفەنگێکم لە کەوێك تەقاندبوو، نە هەرگیز راوی کەروێشکم دیتبوو و نە قسەی خۆشی وەهام ئەزانی ئاغای پێ بهێنمە گەشە. تەنیا ئەوەندەم لە دەس ئەهات لە گۆشەیەکا دانیشم و گوێ بدەمە ئەو قسانە کە هەموویان بە لامەوە بێ بایەخ بوون. لە دیوەخان هاتمە دەر و لە پێشخانەی نیوەتاریکی پێشخانەکەدا بە شوێن جێگایەکا چاوم گێڕا، چاوێکی لێ گەرم بکەم، کەچی چاوم بە هەیکەلێکی پەڕپووت کەوت کە هەر دوو ئەژنۆی لە باوەش گرتووە و سەری بە سەر باسکیا شۆڕ بۆتەوە. چرای گڕسۆزی پێشخانە ئەوەندە رووناکی نەبوو کە بیناسمەوە، بەڵام کاتێ منیش وەك ئەو لە تەنیشت سۆبەی دامرکاوی پێشخانەکە دانیشتم و باش سەرنجم‌دا زانیم ئەو کەسەیە وا سەری شەو هاتە دیوەخان و زوو گەڕاوە. لام سەیر بوو کە بۆچ نەچۆتەوە ناو خێزانەکەی خۆی. هەر لەو بیرانەدا

بووم که لیی پرسیم: «وا دیاره خەڵکی ئێره نیت؟»

لەو ماوەیەدا سەیلەیەکی تێکردبوو؛ مژی یەکەمی لێدابوو؛ لە ژێر نووری ئاوری سەیلەکەیا رواڵەتیم هاتە بەرچاو؛ لە پەیکەرەی خودایانی یۆنانی کۆن ئەچوو. دەم و چاوێکی زبری بە چین و گنجی ورد و درشت داپۆشراو، سەر گۆنای کەمێك قوت، گووپی تێکقوپاو، چەنەی پان و هەندێك هەڵتۆقیو.

کوتم: «نا من ئێرەیی نیم، بەڵام تۆ چی؟ تۆش غەریبەی؟»

مژێکی تری لە سەبیلەکەی‌دا و دووکەڵ وەك ئەژدیها بە جینگڵ‌دان بەرەو تاریکایی میچی هۆدەکە کشا.

ـ «نە، من خەڵکی هیچ شوێنێك نیم. لە هەموو لایەك غەریبم. تەنانەت لە ناو خێزانەکەی خۆشما غەریبەم. پیروز پێم ئەڵێ، تۆ دەستەوەستان و بێکارەی، هێشتا تێنەگەیشتووە چارەنووس یانی چی؟»

بیرم کردەوە ئەم چارەنووسە، ئەم ئاسمان تاوانبارکردنە، گاهێ چەندە تەسکین ئەدا بە دڵی خەمبار. پرسیم، پیروز خێزانتە؟

کوتی: «بەڵێ، پیاو بێ‌ژن ناحەوێتەوە، ئەگەر هاوسەرێکیش پەیدا نەکا ئەمەیە ناکامی. لای وایە من خوام، ئەخۆشی و ساغی منداڵەکەمان بە دەس منە. خوا ئەزانێ کاتێ ئەو کۆرپە ساوایە بە دەم تاوتێوە ئەناڵێنێ، من لەبم بە برینشکەی سەر سێڵ. ئاخر ئەو بەستەزمانە تەمەنی دوو ساڵە و بەرگەی نەخۆشی ناگرێ.»

پرسیم: «دەی جا بۆ هەڵناسی بچیەوە بۆ لای؟»

بە ناڵینەوە کوتی: «چیم لە دەس دێ. ئاغا کردوویەتە سەرم، بەیالی باراشی بۆ بەرمە ئاش. زمهەری زستانی ئاغا، تا لینەکرێ و تەواو ئەبێ دە رۆژی پێ‌دەچێ و من ئەبێ لەو ماوەیە لە لای باراشەکان بمێنمەوە. هاتم بە ئاغا بڵێم کەسێکی تر بنێرێ؛ بەڵام دیتم لە هۆدەی گەرما کە باسی راو و رابواردنە، چۆن ئەتوانم باسی سەرما و نەخۆشی

بکەم. بەڵێ من غەریبم. لە هەموو لایەك، تەنانەت لە ئاوایییەکەی خۆشما، لە ناو خێزانەکەما و لە ناو بەرگە شڕەکانیشما.»

قاقای کۆڕی دیوەخان، لوورەی گورگی بیابان و گڕەی بای زستان بە یەکەوە بەرز بوونەوە و تێکەڵ بوون. سەرم سووڕا. رق و توانج و تووك بە قووڵترین ناخی دڵما گەڕا. بەڵام...بەڵام، چیم لە دەس ئەهات؟ هەر وەك ئەو پیاوە چی لە دەس نەدەهات بۆ تیماری کۆرپەکەی. هەستم کرد ئەوەندە بێ‌هێزم، ئەوەندە هیوا بڕاوم کە هاکا بڕوا بە چارەنووس بە سەرما زاڵ بێ. هەر دوو ئەژنۆم گرتە باوەش. خەو لە چاوم تارا و خەم خۆی خزاندە ناو دڵمەوە. سەرم بە سەر ئەژنۆما شۆڕ کردەوە و چاوم نایە سەر یەك و وامزانی لە ماڵی ساردوسڕی کابرا دانیشتووم.

کۆرپەیەکی نەخۆش، لەشی شلك و بێ‌هێزی لە ئاوری یاوا ئەسووتا. تەنانەت هێزی گریانیشی نەمابوو، بەڵام ئەینالاند و هەر نالەیەکی ئایەتێکی خوایی بوو کە نوێژی ترسی هەڵئەگرت. دایکی وەك ئاسکێ کە لە دەس راوچی رایکردبێ، نیگای پڕ بوو لە ترس و دوودڵی. چاوێکی لە چەپەری شڕی ناو ماڵەکە بوو کە مێردەکەی لە دیوەخان بگەڕێتەوە و چاوەکەی تری پاسەوانی نەخۆشە بچووکە بێ تاوانەکەی ئەکرد. هەر نیگایەکی توانجێك بوو بۆ کۆمەڵی ئادمیزاد.

سەرم بەرز کردەوە. کابرا نەمابوو، هەر وەك بێ خشپە هاتبوو، بێ چرپەش رۆیشتبوو. راستی ئەکرد. ئەو لە هەموو شوێنێك غەریب بوو. بەڵام بەو چەن قسەیە منیشی کردبوو بە هاوسەفەری خۆی. سەفەری هەرێمی غەریبی. هەستم کرد کۆڕی دیوەخان بێدەنگە. خەوی بەربەیان لە هۆدەی گەرما کاری خۆی کردبوو. بەڵام من غەریب بووم. تەنانەت لە ناو بەرگەکانی خۆشما. ئەو بەیانەش کە خەریك بوو لە سنووری ئەو رۆژەوە دەرئەکەوت، غەریبی لێئەباری.

١٣٥١/١٠/٦

# رووناکبیر

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ. تکایە گوێ بگرن بۆ پارچە پەخشانێك. هەڵبەت پێویستە لە سەرمان کە دووپاتەی بکەینەوە ئەم بەرنامەیە هەمیشە بە راسپێری خۆی زانیوە لەگەڵ روونکردنەوەی قوتابخانە وێژەییەکانی کورد و ئێران و جیهان، نموونەی شێعر و نەسری کورد و نەتەوەکانی تریش بخاتە بەرچاو. ئێمە ئامادەین کە شوێنەواری گوێگرانی رووناکبیرمان لەم بەرنامەیەدا بڵاو بکەینەوە و سەبارەت بە پرسیارێك کە لە بارەی وێژە و هونەرەوە بۆ ئەوان پەیدا ئەبێ، وتووێژیان

لەگەڵ بکەین و بە هەر دوو لا تێکۆشین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گۆشە تاریکانە کە دێتە بەرچاو. ئەزانن کە ئەم بەرنامەیە هەوڵی داوە بە شێوەیەکی نوێ لە وێژە و هونەر بکۆڵێتەوە و هەرێمی باسەکەی پان و پۆڕ کاتەوە، بە چەشنێ کە هەموو ئەو شتانە کە تەئسیریان لە سەر هونەر هەیە بگرێتەوە، چونکە ئەزانین وێژە بە ناوی بەشێ لە هونەر، لە کۆمەڵ پەروەردە ئەبێ. بێگومان هەموو ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی، هەموو ئەو شتانە کە باری کۆمەڵیان هەیە، وەك مێژوو و ئابووری و زانیاری، تەئسیر ئەکەنە سەر وێژە و هەرێمی دەسەڵاتی باسەکەی ئێمە هەموو ئەوانە ئەگرێتەوە و لە ڕێبازی تەسك و تەنگی لێکدانەوی وێژەوانیدا ناوەستێ. چونکە ئێمە لامان وایە بە زانینی ئەم شتە بێبایەخانە کە فلان شاعیر کوری کێ بوو، تەمەنی چەند ساڵ بوو و یا فیسارە شێعر لە باری تەقتیعی عەرووزییەوە چەندە ڕێك کەوتووە و ئیهام و ئیستعارە و فەننی تری بەدیعی چەندە زۆرە، شتێکمان پێنابرێ و دەسکەوتێکی هێژامان دەس ناکەوێ. گرینگ ئەمەیە بزانین کە نووسەر و شاعیر و هەر هونەرمەندێکی تر بۆ جوان کردنی باری ژیان و بەرەوپێش بردنی کۆمەڵ چی کردووە و چی لە دەس هاتووە؟ ڕەنگە هەندێك بڵێن شاعیر خاوەن دەسەڵاتی ماددی نییە کە بتوانێ کۆمەڵ بەرەوپێش بەرێ؟ ئێمە لە بەرامبەر ئەم پرسیارە چاوەڕوانکراوەدا ئەڵێین: بەرەوپێش‌بردن و جوانکردنی ژیان، پێویست ناکا بە چەشنێکی بەرچاو و دیار لە هەرێمی ماددیاتا بێ. کەس ئێنتزاری لە هونەرمەند ئەوە نییە کە کاری کاربەدەستانی وڵات بگرێتە ئەستۆ. هونەرمەند کاری ئەوەیە کە ڕێگای خەڵك ڕووناك کاتەوە و لە ڕابردوو و داهاتوو و ئێستای تێگەیەنێ. ناحەزییەکان دەربخا و کۆمەڵ ئامادە بکا بۆ وەرگرتنی ژیانی بەرزتر و ئینسانی تر.

ئێستا پارچە پەخشانەکەتان پێشکەش ئەکەین، بە هیوای پەسندی ئێوە.

پەنجەرەکانم کردەوە. هەستم کرد هەوای فێنکی کۆڵان خۆی کرد بە ژوورەکەما

و چەشنی تەمی بەرەبەیان لە دەوری لەشم هاڵاو گەرمای لەشمی کرد بە هەڵم.
ئەتکوت لە ناوەوە ئەسووتێم و دووکەڵم لە سەر هەڵدەستێ. ناو کۆڵانەکە رووناك بوو،
وەك زەردەیەك کە نازانی هی شەرمە، هی توانجە یا هی خۆشەویستی. ناو هۆدەکەم گرژ
و مۆن بوو و لەسەر بەڕەیەکی خرسەکی کۆن کتێبەکەم لەیەك کرابۆوە. ئەتکوت لە بەر
شەکەتی سینگی رووت کردووە و هەر دووك دەستی راست راکێشاوە.

هەر کە زرەی زەنگی دەرگای حەوشەکە هەستا بە گورجی خۆم پۆشتە کردەوە و
بە دوو لۆقی درێژ خۆم گەیاندە بەر دەرگا. دەستێکی بچووکی سپی بۆ جاری دووهەم
درێژ کرابوو زەنگ لێبدا کە من دەرگاکەم کردەوە و دەستە بچووکەکە بە ئەسپایی
هاتەخوارەوە و خۆی خزاندە ناو دەستی گەرم و تاسەباری منەوە. پرسیم: «درەنگ
هاتی؛ لات وا نییە چاوەڕوانی لە وزەی مندا نییە؟»

لەسەرخۆ جانتایەکی پڕ لە کتێبی کە بە دەستیەوە بوو لە گۆشەیەکا دانا و پاڵی دا
بە دوو سەرینی کوردییەوە کە جێگای کاتی تەمەڵی من بوو. کوتی: «سەردەمی زوو بۆ
هەموو شت کاتیان هەبوو. بۆ یەکتر دیتن، بۆ حەسانەوە، بۆ کار و بۆ بەزم و ئاهەنگ و
راو و زەماوەند. بە تایبەت بۆ دڵداری.»

کوتم: «ئێستە چی، گوایە شەو و رۆژ کورتتر بوونەتەوە؟!»

بە کەمێك دڵڕەنجییەوە کوتی: «رووناکبیر دەرگای لە سەر خۆی پێوەداوە و
ئاگای لە ژیانی کۆڵان و گەڕەك بڕاوە. تۆ تا بە ئەسپایی مژێك لە سیغارەکەت ئەدەی نیو
سەعات ئەخایەنێ. لە کاتێکا لە ناو گەڕەك و کۆڵان هەموو کەس رائەکا؛ بەرەو کوێ،
خوا ئەزانێ. زەنازەنا و دەنگ و هەرا هەرگیز نابڕێتەوە. تۆ ئیتر نابینی کەس بۆ
لەدەسچوونی ئەوینێك، بۆ ژاکانی گوڵێك بگری. کەس چاوی لە هەڵفڕینی پەپوولەیەك
نییە. باڵداری کە جارجار سەرنج رائەکێشێ، واشەی ئاسنە کە مەلی گیان راو ئەکا. ئیتر
کەس بەمەوە ماندوو نییە کە مەلی گەرمێن لە بەهارا یێتەوە و لە پەنا شەتاوێکی سەوز و

مەندا بنیشنەوە و وتنەیان بکەوێتە ناو ئاوێنەی گۆلاوەوە.»

کەمێك پشووی هاتەوە سەرخۆو سەری هەڵێنا و دوو فرمێسکی روونم لە سەر گۆلاوی شینی چاوی بەدی کرد کە ئەهاتن ببن بە دوو دڵۆپی شەونم لە سەر پەڕەی گوڵی گۆناى.

کوتم: «ژیان ئەگۆڕێ و کەس ناتوانێ پێش بە گۆڕانی ژیان بگرێ.»

کوتی: «بەڵێ، ئەگۆڕێ، بەڵام پرسیار ئەمەیە، بۆچ بەرەو دزێوی ئەچێ؟ تۆ لات وایە چارەی هەموو دەردێك لەم پەڕاوانەدایە کە هۆدەکەت پێ پڕ کردوون! لە کاتێکا من بڕوایەکی ترم هەیە. ئەڵێم دانیشتن و دەرگا بەستن و تەنانەت لە سەرما و گەرمای ناو کۆڵانیش بێ خەبەر بوون خۆی دەردە. رووناکبیری تەریك خۆی سەربارە.»
پاشان وەك کەسێك کە لای وابێ هەرچی ئەیڵێ بۆ ئەو کەسە وا گوێی لێگرتووە وەك بەردێك وایە بە گومبەزێکیدا بدەی، کوتی: «قسەکە روونتر و دیارترە لەمە کە لە سەری بڕۆم. کۆمەڵ وەك داری «ئەلاقوچکێ» هەلەق مەلەق» وەهایە. کەمێك لەوسەری دانیشتوون و زۆرێك لەم سەرەی. لای زۆرەکان نیشتۆتە سەر زەوی، وەك سەری نیری جووتیاری بێ گاجووت و توو، لای کەمەکانیش پەڕیوەتە بەرزی. تۆ لات وایە چار چییە؟ وەك تۆ دانیشتن و سەر بە کتێبا گرتن و دووکەڵی خەفەت بە با کردن؟ یا هاندانی ئەو زۆرانە کە هەستن و سەر داری ئالاقووچێ سووك کەن؟ ئەو دەمەیە کە ئەبینی کەمەکان دێنە خوارەوە. ئەگەر جووتیار بۆ خۆی بچێنێ و بۆ خۆی بدروێتەوە، دەرەبەگ کوا کۆشکی چەند قاتی بۆ بەرز ئەبێتەوە؟

٥١/١٠/٢٠

# گەڕانەوە

هەر کە چاوی بە ڕووناکایی حەوشی نەخۆشخانە کەوت هەتاوێك لە دڵیا هەڵات. وەك فانووسێك کە هەڵیکەی و پرشنگی گڕەکەی بکەوێتە سەر شووشەکەی. هەتاوێك بە سەر حەوشی نەخۆشخانەکەدا پان بۆوە و شەونمی لە سەر چیمەنەکەی بە تامەزرۆیی هەڵئەمژی. لە بەرچاوی هۆمەر هەموو وڵات ئەتکوت دمێکە و بە زەردەیەك کراوەتەوە. لە حەوشی نەخۆشخانەکە تێپەڕی و پێی نا ناو شەقامەوە. پاش شەش مانگ بێدەنگی خەستەخانە و نیوەنووزەی نەخۆش و چریەی بەئەسپایی نەخۆشەوانەکان، هەرای ناو شەقام بۆ گوێی هۆمەر لاوێنەرەوە بوو، چونکە نیشانەی ژیان و کار و زیندووبوون بوو. ماوەیەك لەبەر دەرگا وێستا. چەن جار ئاوڕی داوە بۆ حەوشی

نەخۆشخانە و چەن نەخۆشی دی بە بەرگی سپی نەخۆشخانەوە خۆیان لە بەر هەتاو هەڵخستبوو. بە پێکەنینێك و دەس ڕاوەشاندنێك ماڵاوایی لێ کردن؛ پاشان لە ناو هات‌وچۆکەرانی شەقاما گوم بوو.

هۆمەر بێ ئەوە بزانێ بۆ کوێ ئەچێ لەم کۆڵانەوە بۆ ئەو کۆڵان، لەم شەقامەوە بۆ شەقامێکی تر پیاسەی کرد و هەموو دووکانێکی شار سەرنجی ڕاکێشا، چەند جار بێ ئەوە بڕوانێتە چرای سوور پێی نا ناو شەقامەوە و لێخوڕەکان قسەی سوکیان پێ کوت. هۆمەر لای سەیر بوو کە ئەمانە بۆچ جنێو ئەدەن. هەرچی ئەیکرد نەیئەتوانی هۆیەك بۆ ئەم هەموو پەلەیە بدۆزێتەوە. وەك شارەمێروو خەڵك ئەهات و ئەچوو و کەس کەسی نەدەناسی. لەپڕ تاسەی ئاواییەکەیان وەك تەڵخەك کەوتە سەر دڵی؛ پێی شل بوو و بازی بەهەڵپەی نیگای کە هەموو لایەکی ئەپشکنی، گەڕایەوە بۆ هێلانەی دەروونی. شانی لەشانی چەن کەس دا و چەن جار بە توڕەییەوە پێیان کوت: بەرپێت تماشا کە، مەگەر کوێری؟! بەڵام هۆمەر هەر بە لەش لە شارا مابوو، بە گیان و دڵ گەڕابۆوە دێ. لە کەناری مەیدانێکی گەورە کە لە ناوەڕاستەکەیا پەیکەرەی پیاوێکی مەزن لە بەرد دروست کرابوو، چاوی بە تاقمێك کەوت کە بە جل‌وبەرگەکەیانا لە خەڵکی دێهات ئەچوون. گەنج و پیر و منداڵ هەموو لە بەربەرۆچکا دانیشتبوون. یەك خەریکی قەنەکێشان بوو، یەك بە تاسەوە لەنجەولاری ئافرەتێکی گرتبووە بەر ڕوانین و یەکی تر خەونووچکە ئەیبردەوە و زەنگن و پێنەمەڕەکەی لەلای دەستیا دانابوو. هۆمەر هەستی کرد لەو تاقمە نزیکترە تا ئەو شاریانە کە جنێو ئەدەن، بێهوودە پەلەیانە و یەکتر ناناسن. هێندەی پێ نەچوو کە هۆمەریش یەکێك بوو لەو کۆڕە.

هۆمەر لە ژێر چاوەوە لە جل‌وبەرگی ئەو هەژارانە ورد بۆوە. کوردی نەبوو، بەڵام هێشتا لە بەرگی کوردی نزیکتر بوو تا بەرگی فەرەنگی. خەڵکی شار زمانیشیان کوردی نەبوو، بەڵام هۆمەر ئەیزانی ئەڵێن چی، چونکە زۆر وشەی کوردی لە زمانەکەیانا هەبوو.

ویستی لەگەڵ گەنجێکا کە لە پاڵ دەستیەوە دانیشتبوو و کۆتێکی کۆنی ئاتەگدرێژی لەسەر بەرگی دێهاتییەوە کردبوو بەری قسە بکا، بەڵام گەنجەکە هەر خەریکی روانینی ئافرەتەکانی شار بوو. تا یەکیان لە دوورەوە ئەهات نیگای ئەو گەنجە وەك هەنگ بە سەر سینگ و کەمەر و دەموچاویەوە ئەنیشت و تا لەبەر چاو گوم نەبوایە دەستی هەڵنەدەگرت. هۆمەر ناچار کوشمەی کرد و بێدەنگ بوو. لە خەیاڵا گەڕایەوە بۆ ئاوایەکەیان. هاتەوبیری کە شەش مانگ پێشتر لە کاتێکا خەریکی بەفرماڵینی سەر بانی خۆیان بوو کەوتە خوارەوە و رانی شکا. ئەو شەوە ساردانەی هاتەوە بیر کە تاوتێی برینداری برستی لێبڕیبوو، بە چەشنێ کە خێزانی ئەیکوت حەوتەیەك لەسەریەك شەو تا بەیان وڕێنەی کردبوو. خێزانی ئەیکوت کە وڕێنەکانی ئەوەندە کوفر بوون کە لەوانە بوو بەرد بباری! بەڵام خوا بەزەیی پێیاندا هاتبوو و تەنیا تەرزەی بە ئەندازەی سەرەچۆلەکەیەکی باراندبوو و سەری مناڵەکەیانی شکاندبوو!

هەموداى بیرکردنەوەی هۆمەر بە دەنگێکی تیژی وەك نووکی مقەست پچڕا و گەڕایەوە ناو هەرای شار. پیاوێکی چوارشانەی سمێڵ بابڕ چەن گەنجێکی لە هەژارە دێهاتیەکان بە پێوە راگرتبوو و چەشنی چێودارێکی پسپۆڕ ئەیڕوانییە بەژنوباڵا و دەستومەچەك و شانوباهۆیان. ئەتکوت خەریکە بیانکڕێ. گەنجەکانیش بێدەنگ هەرکام بە پاچێك، پێمەڕەیەك، یا زەنگن و قوڵینگێکەوە راوەستابوون و چاوەڕوان بوون بزانن کابرا کامیان هەڵەبژێرێ بۆ کار. کابرا هاتە سەر سەری هۆمەریش، ماوەیەك تماشای بەرگە کوردیەکەی کرد و بە پێکەنینەوە شتێکی کوت کە هۆمەر تێی نەگەیشت؛ پاشان چەن کەسی لەوانی تر هەڵاوارد و خۆی کەوتە پێشیان و رۆیشتن. هۆمەر لە پیرەپیاوێکی کە خەریکی تەکاندنی خۆڵەمێشی سەبیلەکەی بوو پرسی: «ئەمانە بۆ کوێ چوون؟»

وا دیار بوو هەژاری ئەو هێزەی هەیە کە ئەوان لە زمانی یەك تێبگەیەنێ. پیاوە

پیرەکە لە وەڵاما کوتی: «کارا» پاشان دەستی بە زگیەوە گرت. وا دەرلەکەوت برسیەتی. هۆمەر لە کیفە کۆنەکەی چەند ئەسکیناسی کۆنی دەرهێنا و کوتی: «من دراوم هەیە، بەڵام نازانم نان لەکوێ دەس ئەکەوێ.» کابرا پیرە بێ ئەوە لای واپێ پێویستە سپاسێک بکا، کەمێک لە دراوەکەی وەرگرت و پاش چەند وردەیەک هەر دەستی بە هەڵپە بوو ئەکشا بەرەو نانی گەرمەتەنوور.

هۆمەر لە ئوتوبووسێکی شەقوشڕا کە بەرەو موکریان ئەچوو سەری بەسەر سێنگیا شۆڕببۆوە. لەسەر خوانی شەکەتی بە خەوێکی خۆش میوانداری کرابوو. خەوێکی خۆش و پڕلە خەونی خۆش. خەونی ئەمە کە جارێکی تریش خەڵکی ئاوایەکەی ئەبینێتەوە، لەگەڵ خێزانیا لەسەر ئاوری نزیک لە دامرکان بە حەوجۆشی رەش و کتری تەنەکە چای تازەدەم ئەخۆنەوە، دیسانەوە خێزانی ئەڵێ، پیاوەکە ناشکوری مەکە خوا بۆئێمەش گەورەیە و ئەویش وەڵامی ئەم قسانە تەنیا بە بزەیەکی پڕمانا ئەداتەوە.

تا حەوتەی داهاتوو بە خواتان ئەسپێرین.

# ئاسۆ رووونە

هەر کە ئەبوو بە لای ئێوارە، یەك یەك لەماڵ و لە سەر دووکان و لە شوێنی کار ئەهاتینە دەرەوە و هەموو رووومان ئەکردە چایخانە و کەناری گۆلێکی گەورە کە جێگای ناولێهێنانی کچانی شارە خنجیلانەکەمان بوو. پۆل پۆل گەنجی تاسەداری دڵ پڕ لە هیوا بە پیاسەی لەرم و شۆخ لە شەقامەکەوە تێئەپەڕین و هەر کە ئەگەیشتنە نزیکی گۆلەکە هەنگاویان شل ئەبوو و بازی نیگایان لە سەر داری تازە ئەمامی بەژن و بارێکی بە کەشم و ئەشم ئەنیشت. ئیتر هەر روانینی گەرم و بێ پەردەی کوڕان و نیولیگای نیوەناشکرای

کچان بوو کە ئاڵوگۆڕ نەکرا. گاهێ دەستێکی پیاوانە بە سمێڵێکی خورمایـیا ئەهات و لەو لاشەوە پەنجەیەکی نەرم و سپی، لکی پووشـین و دەسماڵەکەی لا ئەدا و بۆ ماوەیەکی کـورت چەشـنی هەورێکی سپی بێباران، بەری رۆژی گەشی چـاوی ئەگـرت و تەزوویەکی خۆشەویـستی وەك شنەی دەم بەیان ئەکەوتە سـەر دوو لەشی گەرم و گەنج، چونکە هەردووك لا ئەیانزانی ئەم ئیشارە کورتانە، بانگهێشتن و میوانداریـیەکە بۆ سەرخوانی رازاوەی ئەوین لە نیوەشەوێکی لە بیر نەچووا کە بە پرشنگی نیومرەنگی مانگەشەو رووناك ئەبێ و بە کاتی شیرین و کورتی بەیەکگەیشـتنێکی پاکا لەگەڵ ئەبەدییەت و هەرمان تێکەڵ ئەکرێ.

فەرهاد بە پێچەوانەی هەموو هاوتەمەنەکانی زۆرتر لـەوە کە قـسە بکـا و بجووڵێتەوە، بیری ئەکردەوە و کش و مات ئەیروانی و لەم دوو چاوەوە کە ئەتکوت دوو شەوەی بێگەردن ئەتە توانی پێ بنێیتە ناو سەرای دەروونییەوە. ئەتکوت هۆدەیەکی تەریکە کە دوو پەردەی رەش دەرگای خۆرەتاوی لە سەر پێوە داوە. فـەرهاد هـەموو ژیانی لە ناو خۆیا بوو. ئەتکوت ئەو دەشت و کێوە کە بەهاران بە گەزیزە و نەورۆزە و هەزاران گوڵ و گیای رەنگاورەنگی تر خۆی ئەکرد بە بووك، ئەو هەموو زیل و بەمە کە لەسەر هەر لکی دارێکەوە دەنووکی بچووك و گەرووی ئەوینداری مەلی ئێسك سووك هەڵئەستا و لە پەنا هەموو جۆگە و رووبارێکدا «دارسیاس» خودای مووسیقا و شۆر و تاسە ئەبووژایەوە، لە دڵی فەرهادا هیچ هەستێکی لاوی نەدەلاواندەوە. ئێوارانە کە هەموو لاوانی شار دەستیان لە کار هەڵئەگرت و لە ناو شەقام و گەرەك و کۆڵانا بڵاو ئەبوونەوە و بە دڵی خۆیان ئەژیان و ژەنگ و ژاری شەکەتییان لە چاوەی پیرۆزی کەوسەری دڵداریا ئەشوت، فەرهاد بە باوەشێك کتێبەوە رووی ئەکردە چۆڵی و لەگەڵ جیهانی زانست و هونەرا تێکەڵ ئەبوو و رۆژپەڕی ئێوارێ ئەگەڕایەوە و ئەچۆوە ناو ماڵ. ئەگەر هەواڵێك تەوسی بدایە لە جیهانی تایبەتی ئەو، بیکوتایە لەم هەموو سەر بە

کتێبا گرتنە چی دەس ئەکەوێ، لەسەرخۆ ئەیکوت: «بەری داری باخچەی کتێب، بیرکردنەوەیە.» ئەیکوت: «جیهانی ئێوە هەرچی هەیەتی بە روانینی یەکەم دێتە بەرچاو. جیهانی ئێوە قاشێکی بچووکە لە زەمان، بەڵام من لە جیهانی کتێبا دوێنێ و ئەمڕۆ و بەیانی ئەبینم و هەست ئەکەم رووبارێکم کە خوڕو خوڕۆشان بە مێژوودا دێمە خوارەوە، نەك وەك ئێوە کە ئەبن بە گۆلاوێکی قەتیس ماوی بە خاکوخۆڵ گەمارۆدراو و تەنیا لە روانگەیەکی تەنگەوە ئاسمان ئەبینن.»

فەرهاد ئەوەندە لە ناو خۆیا ئەژیا کە منیش کە لە هەموو کەسێ لێی نزیکتر بووم تا ئەو رۆژە نەمئەزانی دەنگی ئەوەندە خۆشە. ئەو رۆژە من هەستێکی نەناسراوی سەرکێش هەڵیگرتم بۆ کەناری رووبارێك کە دەوروبەری بە دارەبی و گیای بەهاری شینی ئەکردەوە و لەژێر دارەکانا ئەکرا چاو بیڕیە شەپۆلی بێ هەدای رووبارەکە و ژیانی رابوردووت بێتەوە بیر. ئەشکرا لەگەڵ کچێکا ژێردارەکان بکەی بە جێژوان و گوێ بگری لە جریوەی مەل و شنەی شەماڵ کە لەشی شلکی گیاوگژی لەیەك ئەخشاند و لە جیهانی خەیاڵا یا سواری ئەسپی شەپۆل بیی کە باڵی شۆڕ کردبۆوە و پەلی ئەکوتا بەرەو ئاسمان، یا باڵی سپی هەوری بێباران کە وەك قوو بە دەریای بێسنووری ئاسمانا پۆل‌پۆل تێهەپەڕین بکەی بە قوتاخ. من سەرگەرمی ئەو خەیاڵانە بووم و ئەشکام بەرەو لێواری رووبارەکە کە دەنگێکی یەکجار بەکوڵ هاتە گوێم:

کچە بۆکانی کە بووکی نازن
قۆڵ بە بازن، مل و پێسیر وازن
زەردە مەم دیارە کە خاوەن نوستوون
بۆ پشوودان لە کراس دەرکەوتوون

.....................................

تا دەستم نەنا سەر شانی و نەمکوت دەمخۆش، نەیزانی. لە پەنایا دانیشتم و پرسیم: «تۆ کە دەنگت ئەوەندە خۆشە، ئەوەندە جوان چاك و پێکەوتووی، بۆ چ ناتەوێ لە کاتی لاویت کەڵك وەربگری؟» دیسانەوە چاوی هەر ئەو جووتە شەوە رەشە بوو کە بە ئەندێشەوە نەئتوانی تماشای کەی، بەڵام بە پێچەوانەی هەموو جارانی پێشوو کە لە بەرامبەر ئەم پرسیارە تەوساوییانەدا زەردەیەکی ئەخستە سەر لێو، وەڵامی منی بەم چەشنە دایەوە:

«من بۆ خۆم نازێم. من تەنیا نیم. ئەم خەڵکە هەموویان بەشێکن لە من؛ چۆن ئەتوانم تێر زگم بخۆم لە کاتێکا سەرم دێشێ. چۆن ئەتوانم پڕ بە دڵ پێکەنم لە حاڵێکا ئەندامێکم لە ئاگری دەردا خەریکی توانەوەیە؟ منیش ئەوین ئەناسم. جوانی ئەپەرەستم، بەڵام لە کاتێکا هەزار ئەوین لە دڵی هەژارانا ئەخنکێ، جوانی ئەسیری دەستی دێوی ناحەزییە، چۆن ئەتوانم ئەویندار بم و بە جوانی هەڵبڵێم؟»

ئەمە یەکەمین و دوامین قسەیەك بوو کە لەم بارەوە لە فەرهادم بیست.

تا بەرنامەیەکی تر بە خواتان ئەسپێرین.

١٣٥١/١١/١٨

# وەنەوزی بۆری شەوانی درنجاوی

بە سەرخۆشی لە باریکی شەوانە ئەگەڕایەوە. خۆی بەم جێگایانەی ئەکوت: «نایت کلاپ». ئەهاتە بەرچاوی کە تا ئەژنۆی لە ناو شەقامی بێ‌هات‌وچۆو پێدەنگا بە تەم و مژموە ئەبێ. وای ئەزانی پێی لە زەوی بڕاوەو خەریکی فڕینە. فڕینێکی بە ئەسپایی، چەشنی نیشتنی قورینگ لە پەنا شەتاوێک. لەو «نایت کلاپ»ە چەند جار قامکیان بۆلا راداشتبوو. ئەو وای زانیبوو تاقمی لایەنگرانین و شێعرەکانی ئەویان لە گۆوارە بەنرخەکانا خوێندۆتەوەو بێگومان هەر کامیان نوسخەیەکیان لە کۆمەڵەی

شیعری تازەی ئەو بە ناوی «وەنەوزی بۆری شەوانی درنجاوی» لە ماڵا هەیە. ویستبووی رواڵەتێکی شاعیرانەی هەبێ، هەستابوو بۆ تماشاکردنی دەموچاوی. رووی کردبووە ئەو شوێنە کە دەستی لێ نەشۆن. لەبەر ئاوێنە بە خۆیا روانیبوو و هەستی کردبوو مووی سەر و کاکوڵی رێك و پێکە. بە دەست کەمێکی شێواندبوو. بۆ ئەوە شیاوی ناوی «شاعیری شێواو» بێ. کاتێ گەڕابۆوە، ویستبووی بە بزەیەك تاقمی لایەنگرالی بە سەر کاتەوە و ئەوانیش وەڵامی بزەکەی ئەویان بە قاقایەکی تێکرایی دابۆوە، شاعیر وای دانابوو کە ئەم قاقایە زۆرترە لەوە کە کاری ئاوی تاڵی سەرخۆشکەر بێ، کاری بزەی لاوێنەرەوەی ئەوە. بە دڵنیایی لەسەر جێگای خۆی دانیشتبۆوە و ئەم بیرە بە مێشکیا هاتبوو: «ئەگەر ئێمەی هونەرمەند نەبین و پەژارەی هەموو ئەم خەڵکە ساکارە نەکەین بە هی خۆمان، بەستەزمانانە چەندە زوو پشتیان لەژێر باری خەما کۆم ئەبێتەوە.» هەستی کردبوو کە ئەوەندە بەرز بۆتەوە سەری لە میچی هۆدەکە ئەدا. تەنانەت لەو کەسەی بە لای دەستیەوە دانیشتبوو پرسیووی: «ئەم میچە یان بۆ چ وا نەوی دروست کردووە؟» بەڵام کابرا وەڵامی نەدابۆوە. بە بیریا هاتبوو شێعرێك بڵێ بۆ ئەو جیهانە کە هونەرمەندی تێدا نییە و لە دڵی خۆیا گەلالەی شێعرەکەشی گرتبوو «وڵات هەمیشە زستانە، مەڵێ بەهار تۆراوە و هەرگیز ناگەڕێتەوە، بزەیەك لەسەر گوێسوانەی لێوێك دیاری نادا، هەتاو کۆچی دوایی کردووە، ئەوین وەك کوانووی دامرکاوی پاش کۆچی خێڵ، سارد و سڕ هەڵگەڕاوە» و بە خۆی گوتبوو: «لەبیرم نەچێ ئەم شێعرە ئەبێ ئاهەنگێکی خەماوی هەبێ. بەڵام نەك تا رادەیەك کە ببێتە شێعری سەر شیوەن.»

سەرخۆشی ئارەق و دڵخۆشی کاتێ کە شێعرەکەی بە پیتی گەورە لە گۆواری وێژەیی ناسراو چاپ ئەکرێ، تێکەڵ ببوون و مەودای تەسکی هۆدەکەی لەبەر چاو تەنگتر بۆوە.

لە شەقاما تا ئەژنۆی بە تەم و مژی ئەفسانەوە ئەبوو، بەرەو کۆڕێك ئەفڕی کە

لەوێ چەن هونەرمەندی تر چاوەڕوانی بوون. کاك سـروشـت کە نەققاشـی گەل بوو تابلۆکەی چەند رۆژ پێشتر جایزەی گەورەی «بینـال»ی وەرگرتبوو. ئەو تابلۆیە کە نەققاش ناچار بوو بە ٣٧ هەزار تـمەن بیفـرۆشێ، بریتی بوو لە چەند کـونـی وەك گولۆنەی تەندوور، ئەگەر کەسێك چێشکەی هونەری نەبوایە لای وابوو نەققاشـی منالێکی قوتابیـیە کە پاش تەواوبوون بە دڵی نەبووەو خەتی خواروخێـچی بەسەرا هێناوە. نەققاشەکە ئەیگوت ناوی ئەو تابلۆیە «ویەتنام»ە.

کاك زیل و بەم کە مووسیقارێکی گەنج بوو، لووتی هەر لە «کلیلی سۆل» ئەچوو و خوشکە ئارایش کە تازە زانکۆی هونەرە جوانەکانی تەواو کردبوو. ئەومندە نوێگەر بوو کە لەسەر دێڕیکی چەڵەمەی بەستراوی بێ جەمـەر رۆیشتبوو و گەڕابۆوە سـەر هەوڵی شارستانیگەری ئادەمیزاد. لای وابوو، ـ سـوێنـدیشـی بە زیئووس و ڤێنووس ئەخوارد ـ درۆناکا کە ناحەزی و دزێوی بەرزترین نموونەی جوانییە. ئەیگوت پیاو بێزی هەڵـەستێ کاتێ ئەچێتە ناو هۆدەیەکەوە کە هەمـوو شـت لـەسـەر جێگـای خۆیەتی. کاك شێواوی شاعیریش ئەم قسـەیەی زۆر بە دڵ بوو و هەمیشـە ئەیگوت: «تۆو شێعرێك لەسەر من خوشکە ئارایش، سـەبارەت بە ئافرەتێك کە لەم وشکارۆی بێزەوقییەدا تێئەگا جوانی یانی چی.»

شاعیر هەروەها سەرخۆش بە ناو تەم و مژی ئەفسانەدا ئەفڕی. وای ئەزانی لە سەر چیای «ئەلەمپ» لە بارەگای خودایانا دانیشتووە. لەپڕ پشیلەیەك دەرپەڕی و شـاعیری ئێمە کە کۆڵەباری راسپێری گرانی مێژوویی بەسـەر شـانیەوە ئەتگوت پووشێکە، راچەنی و دڵی دەستی کرد بە لێدان. جێگای کاك زیل و بەم خاڵی بوو کە میلۆدیەك لە لێدانی دڵی شاعیر دروست بکا.

بیـری کردەوە. ترس دوژمنـی گەورەی ئادەمیزادە، بەڵام ئەیتـوانـی ناوەرۆکی شێعرێك بدۆزێتەوە کە توانجێك بێ بۆ ترس.

گێژ و خولی خوێنی گەرم ترسی لە سەری رەواند و هەستی کرد کە یەکجار بە تاسەوەیە خۆی بگەیێتە لای خوشکە ئارایش و باسی حەیوانی سەرەتایی بکەن. باسی ئەو پشیلانە کە ددانیان بە ئەندازەی شمشێرێك درێژ بوو.

شاعیری شێواو بە کۆڵانی تەمگرتووی رابردوودا گەڕاوە بەرەو دوا. هاتەوە بیری کە بە منالیش ئاوگۆشتی پێناخۆش بووە. هەڵبەت ئەو کاتە نەیدەزانی لەبەر چی، بەڵام ئێستە هۆی ئەو پێناخۆش بوونەی بۆ دەرکەوتبوو. شاعیری ئێمە دڵی وەك پەڕی گوڵ ناسك بوو. ئاشکرایە کە ئاوگۆشت پێویستی بە سەربڕینی گیاندارێك هەیە و ئەو لە فەلسەفەی هیندیەوە گۆشت نەخواردنی هەڵبژاردبوو. لە بیری مابوو کە تەنانەت جارێك لەگەڵ کاك «زیل وبەم»دا کە لووتی لە کلیلی سۆل ئەچوو لێیان بوو بە کێشە. چونکە کاك زیل و بەم گوتی: «هیندیەکان کارێکی باش ناکەن. لە برسا ئەمرن و ئەو هەموو گایەش لە هیندا بە شەقامەکانا ئەسووڕێنەوە.»

شاعیری شێواو ئەیزانی کە ئاوگۆشتی پێناخۆشە. ئەیزانی کە لایەنگری فەلسەفەی گۆشتنەخواردنی جووکیەکانە و لە بیریشی مابوو کە لەگەڵ کاك زیل و بەم دەمەقرەی لێ پەیدا بووە؛ بەڵام هەرچەند زۆری بۆ مێشکی ئەهێنا نەیدەزانی لەبەر چی کەبابی پێخۆشە؟ هاتەوە بیری کە چەند ساڵ لێرەوبەر مەلی باڵزێڕینی ئەوین لەسەر بەرزترین لقی داری دڵی هێلانەی کردبوو، دڵبەرەکەی کچێکی توولە ئەمامی قژ زەردی چاوکاڵ بوو، بەڵام بە داخەوە پاش ئەو هەمووە کە شاعیری شێواو هەوڵی لەگەڵدا و رەنجی کێشا و سەدها جار بە گوێچکەیا چپاند: «هەبوون یا نەبوون، مەسەلەکە ئەمەیە». هەر تێنەگەیشت «شکسپێر» شاعیرێکی گەورەی ئینگلیسییە و هەر وای ئەزانی «گۆران» جەردەیە و «هەژار» پیاوێکی فەقیر و دەسکورتە. لەمەش خراپتر تائەو رۆژە کە بێدەربەستانە شاعیری ئێمەی بە دڵی شکاوەوە جێهێشت هەر نەیسەلماند کە گوڵێکی سیس و ژاکاو لە دڵێکی شکاو ئەچێ.

هەر لەم بیرانەدا بوو کە گەیشتە بەردەرکی ماڵی کاك سروشت. ئەو شەوە بە شادیانەی فرۆشتنی تابلۆی ڕیەتام، لە ماڵەکەی خۆیا کۆڕێکی بەزمی پێکهێنابوو. شاعیر بیری کردەوە کاتێ گەیشتە ناو هۆدەکە چی بڵێ؟ ماوەیەك وەستا و لە قوژبنی مێشکیا شتێکی دۆزییەوە و چووە ژوورەوە. شەپۆلی مووسیقا وەك ئەژدەها بەرەولای کشا، کاك زیل‌وبەم خەریکی لێدانی سەمفۆنی ناتەواوی بتهۆڤن بوو، بەڵام هەر ئەچوەوە سەر هەوای شەمام شلکی. کاك شێواو ڕووی کردە سەرووی کۆڕەکە تا لەسەر سەندەڵییەك کە لە ژووری هۆدەکەوە بەتاڵ بوو دابنیشێ. لەپڕ مووسیقا و هەرا و بەزم بۆ ماوەیەکی کورت بڕایەوە و پاشان قاقایەکی تێکڕایی هۆدەکەی پڕ کرد. کاك شێواو ڕوانی کە هەموو بە سەیرەوە تەماشای ئەو ئەکەن. کەمێك بە خۆیا ڕوانی و دیتی پارچە کاغەزێك بە دەرزی لە پشتی کۆتەکەیەوە هەڵواسراوە. کاغەزەکەی لێ‌کردەوە و سەرنجی دا تیا نووسرابوو: «مکث کند.»[1] ئەوەدەمە بۆی دەرکەوت کە بۆچ لە نایت کلاپەکەش خەڵکی پێیەکەنین. جا ڕقی لە شیعر و هونەر و هونەرمەندی هەستا و چەشنی مەلێکی بەرزەفڕ کە تیری ڕاوچییەك بیپێکێ، کەوتە سەر زەوی و هەستی کرد ئیتر ناتوانێ هەڵفڕێ.

٥١/١١/١٩

---

١ - قسە نەکا. بوەستێ.

# تۆران

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ. لە بەرنامەی ئەم جارماندا پەخشانێکی کوردیتان بۆ ئەخوێنینەوە، هیواداریین پەسندی کەن.

دوو ڕۆژ بوو دایکی تۆرابوو. هەر لە بەیانییەوە تا کاتی برسییەتی، یا تا خەمو زۆری بۆلەهێنا لە بەر پەنجەرەی هۆدەکە دادەنیشت و چاوی ئەبڕییە پێچی کۆڵان و هەر ئافرەتێك لە دوورەوە دەرئەکەوت، پڕشنگێك بە چاوی کاڵیا ئەگەڕا، بەڵام لەگەڵ ئافرەتەکە لێزیك ئەبۆوە خەمێك وەك تانە سەر گۆمیلکەی ڕوون و شینی چاوی ئەگرت.

ئەمڕۆ دوو ڕۆژ بوو کە تەلانەت یەك وشەش لە سەر لێوی سوور و ناسکی ئەپشکووتبوو. وێنەی دایکی بە زەردەخەندەیەکی مات و بێرەنگەوە لە سەر تاقەی هۆدەکە دانرابوو و لە تێگوت هەموو خۆشەویستی دایکانە لەو زەردەیەدا کۆ بۆتەوە. سەری هەڵبڕی و بۆماوەیەکی کورت چاوی بە وێنەی دایکیدا گێڕا... کوڵی گریانێکی بێگوناە بە دڵیا گەڕا و دڵۆپێك فرمێسکی خاوێن کە لە کاسەی پەلی چاوییا شینی

ئەلواند، بە سەر گۆناى ئاسك و تورتیدا هاتەخوار، پرسیاری کرد: «بابە تۆران یانی چی؟» وەڵامێکم نەبوو کە پیدەمەوە و نەیڕەنجێنم؛ لە بەر ئەمە گوتم: «کوڕم چیت ئەوێ بۆت بکرم؟!»

نازانم لەبەرچی بەم قسەیە رقم لە خۆم هەستا و لام وابوو خەریکم بە شت بۆکڕین تاسەی دایکی لە بیر بەرمەوە!؟ گوتی:

«تۆران یانی مردن، ئا بابە؟!»

بە شەرمەوە!؟ گوتم: «نە بابە، نە!!»

لە بەر پەنجەرەکە لاچوو و هات لە باوەشما کوروشمەی کرد، وەك بێچووە کۆترێك کە هێلانەکەی رووخابێ. دوو دەستە بچکۆلەکەی لە دەوری لەستۆم ئاڵاند و رووەتی داغ و نەرمی بە سینگمەوە گوشی؛ هەستم کرد بووم بە دوان: منێکی منداڵ و ترساو و خەفەتبار و منێکی گەورە و شەرمەزار و تاوانبار. لە بەر خۆیەوە گوتی: «بابە، حکایەتی دێوەکەم بۆ بڵێ!»

...هێشتا لە «یەکێك بوو یەکێك نەبوو»دا بووم کە حەوسەڵەی بە سەر چوو، بە چەشنێ کە دیار بوو هەوڵ ئەدا نەمڕەنجێنێ، گوتی: «دایکم باشتری ئەزانی.» گوتم: «بەڵێ ئەو باشتری ئەزانی.» هەر بەو چەشنە کە خۆی بە سینەمەوە ئەگوشی، گوتی: «تۆش داستانی دێوەکەت پێ خۆشە، نە بابە!؟»

گوتم: «ئەرێ کوڕی من پێم خۆشە، بەڵام ئەو داستانانە ئەفسانەن!»

سەری لە سەر سینگم هەڵگرت و بە چاوی پڕپرسیارەوە بۆی روانیم و گوتی: «چی بابە؟» گوتم: «ئەفسانە کوڕم!»؛ بەڵام خێرا تێگەیشتم کە ئەو لە ئەفسانە ئاگا.

ـ «ئەفسانە بە داستانێك ئەڵێن کە درۆبێ، کوڕی من.»

ئەم قسەی زۆر بە لاوە ناخۆش بوو، باسکی بێ هێز و منداڵانەی لە لەستۆم کردەوە و گوتی: «نە، درۆنییە، دایکم درۆناکا، ئەو ئەڵێ دێو هەیە، دێو پیاوێکی

چەپەڵ و خراپە، منالی خۆش ناوێ، دایکم ئەڵێ دێوزکلکی هەیە.»

دڵم ئەهات دونیا خەیاڵاویەکەی لێ تێکدەم لە بەر ئەمە هیچ دەنگم نەکرد؛ کورتەیەك بێدەنگ بوو، پاشان گوتی: «دایکم هەموو رۆژێ منی ئەبرد بۆ گەڕان.» تێگەیشتم کە ئەم هۆدەیە کە لەپێشا بە هۆی دایکییەوە بۆی ئاشنا بوو، ئێستە ئازاری ئەدا و ئەیەوێ لێی دوور کەوێتەوە.

لە باغچەیەکی گشتیدا لە سەر نیمکەتێکی دارین کە ریزێك شۆرەبی ساوا سێبەریان لێ ئەکرد دانیشتبووین. باغچە پڕبوو لە ژیانی کرچ و کاڵ، جریوەی مەل ومناڵ میلۆدی بووژانەوەی سروشت بوو. دایك و باوك بە شوێن مناڵەکانیانا ئەچوون بۆ ئەملاوئەولا. ژن و پیاوی پیر سەیری کایەی منالی جوانکیلەیان ئەکرد، بەڵام ئەو چاوی بڕیوە ئاسۆیەکی دوور، ئەتگوت لە ناو هەوری سپی و ئەزۆکی لێوارەی هاوینا کە بایەکی نەرم ئەیبزواندن و کۆشك و باڵاخانەی لێ دروست ئەکردن، بە شوێن گومبووەکەیا ئەگەڕێ.

پیرێژنێکی سەرسپی کە ئەمزانی لە کەیەوە بە پاڵ دەستمەوە دانیشتووە، پرسیاری کرد: «کوڕی تۆیە؟» گوتم: «بەڵێ!»

گوتی: «خوا بۆت بهێڵێ، جوانکیلە و روحسووکە، بەڵام وادیارە خەمبارە!

هەستم کرد کە توانجم تێئەگرێ و من بە هۆی خەمباری ئەو دائەنێ. ئەڵێن ئاوانبار لە خۆی بە شکە! ئەبوو بزانم کە ئەو ئافرەتە بێئەوە بەسەرهاتی من بزانێ ئەو قسەی کردووە. پیرێژن دەسهەڵگر نەبوو، گوتی:

«رەنگە نەخۆش بێ!»

گوتم: «نە!»

زانی کە من پێم خۆش نیە باسەکە درێژە بدا، لەبەر ئەمە بێدەنگ بوو. کوڕەکەم پرسی: «بابە تۆماندوو نەبووی؟ لەمەوێ بچم لەگەڵ ئەو مناڵانە کایە بکەم.»

لە خوام ئەویست لەم تەنیاییە خۆی رزگار بکا و جریوەی شادی ئەویش تێکەڵ بێ لەگەڵ مێلۆدی تەبیعەت. لەو مێلۆدییە کە بە لای منەوە یەدەنگی ئەو کەمایەتی تێدا هەبوو.

لە پێشا بە چەن هەنگاوی وردی دوودڵانە و پاشان گورج و توند لە کۆری منداڵەکان نزیك بۆوە و دەستی بچووکی لە هەوادا بۆ گرتنەوەی تۆپی رەنگاورەنگ کەوتە سەما. هەستم کرد بارێکی قورس لەسەر شانم سووك بوو و بیرم کردەوە چەندە ئەخایەنێ و چەندەی رەنج و مەینەت ئەوێ تا گوڵێك ئەخەملێ، تا جووجەڵەیەك باڵ و پەڕ دەرئەهێنێ و فێری فڕین ئەبێ؟!

هەتاو وردەوردە بە زەردەیەکی دایکانەوە دار و گوڵی باخچەی گشتی بەجێ ئەهێشت و بە لالایی شنەیەکی نەرم و نیان، چاوی کۆرپەی سروشتی لە خەو ئەکرد. خۆم ئەدی کە منداڵم و بە گۆنای سوور هەڵگەڕاو و خوێنی گەشەوە لە ناو هەواڵەکانما کەوتوومە شوێن تۆپی رەنگاورەنگ. لەلایەکی ترەوە خۆم ئەدی کە بە کۆڵێك بیرەوەری تاڵ و شیرینی سی و چەند ساڵ ژیانەوە لە ژێر شۆڕەبی خەواڵوا دانیشتووم؛ دەنگی خۆم بوو کە هاتە بەر گوێم: «بابە من ماندوو بووم با بچینەوە بۆ ماڵ.» دیسانەوە دەنگی خۆم بوو کە گوتم: «زۆر باشە کوڕم من ئامادەم.»

کاتێ کە گەیشتینەوە ماڵ چرای هۆدەکەمان ئەگرا، دایکی گەڕابۆوە و کوڕەکەم وەك خەونێکی فەرامۆش کراو ئەهاتەوە بیری کە دوو رۆژی تەواو چاوی لە پێچی کۆڵانەکە بووە.

ئەگەر ئادەمیزاد جادووی لەبیرچوونەوەی نەبوایە، چۆن ئەیتوانی لە ژێر باری خەما خۆی راگرێ؟!

کاتێ دانیشتن بۆ نانی شەو، وەك ئەمە ئەچوو کە هەرسێکمان دڵخۆشین.

# بژی ! بژی !

خێوەتی سپاتی مانگەشەو بە سەر دەشتی پێدەنگا هەڵدراوە، هەزارها خێوەتی شینکی بچووك لەم پەڕی دەشتەوە تا ئەوپەڕ نەتکوت مۆڵی وشتری ماندوون و بۆ پشوودان یخ دراون. لە ژێر هەر خێوەتێکا چەند ئادەمیزاد ئەژین و لە دڵی هەرکامیاندا پەنگاوی بیرەوەرییەك شەپۆل ئەدا؛ شەپۆلی رق، تۆڵە، ترس و بێزاری و لە گوێیاندا دەنگی باڵی باشووی ئاسن و قاقای شێتانەی شەست تیر و رەشاش ئەزرینگێتەوە. بۆنی هەناسەی منالی تازەساڵ و ئاخی پیری خەوڵێ تاراو وەك سروەی شەوبا ئەچێ کە دووکەڵی چغارەیەك لەیەك بدا.

لێرە هیچ سنوورێك بۆ جیاوازی نەماوەتەوە، تەنانەت گەڕەك و کۆڵان و ماڵ؛ دەردی هاوبەش هەموویانی کردووە بە یەك گیان، تەنانەت بە یەك لەش. روانینی نیگەران و ترساوی منداڵێك کە تەرمی دایکی لە ژێر خانووی رووخاوا دێتە بەرچاو، لە گەرمەی یاری منالانەدا ئەوەستێ و چاوی ئەبڕێتە ئەوپەڕی زاگرۆس و چیای

سەربەرز و نەبەزی بەمۆ و دایکی داوێن پاك و شەهیدی دێتە بەر چاو کە گەورە ئەبێتەوە، گەورەتر ئەبێتەوە و هەموو روانگەی بەرچاوی دائەگرێ. بزەیەکی میهرەبان و دایکانە وەك شەبەقی خۆرهەڵات لە ئاسۆی دەمی دایکییەوە، کە هەموو شەوێ بە ئەفسوونی ئەفسانە خەوی ئەکرد بە میوانی دوو چاوی کاڵی ئەو، سەر هەڵئەدا؛ بەڵام لە پڕ بەرگی سپی پەری ئەفسانە شەڵاڵی خوێن ئەبێ و دێتەوە بیری کە دایکی دوو جار بەرگی سووری کردووەتە بەر. جارێك کە ئەبوو بە بووك و ئەهات بۆ کۆشکی رەنگاورەنگی بەخت و ئەوین؛ ئەو جارەی لە زمان دایکییەوە بیستبوو. بەڵام جاری دووهەم خۆی دیبووی کە دایکی جلی سووری کردە بەر و بوو بە بووکی مردن!

فڕۆکەی دوژمن وەك کۆلارەی رەش، وشەی باڵی هات و پاسارە و سەردەرانی رووخاند و هێلانەی هەزاران جووجەڵەی تێکڕووخاند. پیری ژێر خێوەت ئارەقی سەرگۆنای ئەوەکەی بە لکی سۆزانی سپی سڕی و لە ژێر لێوەوە گوتی:

فڕۆکەی دوژمن دێی بۆمباران کرد

بە شەوێ هەزار پیر و جوان مرد

بەیانی نە دێ، نە ژن، نە کانی

هیچی نەما بوو!

بەڵام لە چۆڵێ، لە شیو و دۆڵێ

لە ناو دوو کێوان

وەك گردی «سەیوان»

گۆڕستانێ بوو پڕ حوزن و ماتەم

خودای تەم و خەم

ئەهات و پڕ مشت

کلۆڵی ئەرشت...!

شەوی دوور و درێژ دوایی ئەهات و تۆزی ئاڵتوون بە سەر دەشتی خوڵەمێشیدا ئەکرا؛ وەك هیوایەك پاش هیوا بڕانێك؛ وەك بزەیەك پاش گریانێك، خوێنی سووری خۆرەتاو بە دەماری سروشتا گەڕا؛ قاپی زێوینی گزنگ ئەکرا سەر هەزاران خێوەت کە لەشیان لە ژێر باری گرانی شەوێکی قورس و تەڵخەکا کۆم بۆتەوە. مێردەزمەی شەو لە ترسی رمی ئاگرینی رۆژ هەڵدێ، هەر وەك سپای زۆردار و داگیرکەر کە لە بەر هێرشی گەلی ئازادیخواز رائەکا و ئەرەوێ!

گەنجێك خەریکە بۆ چەن کەسێك قسە ئەکا، ئەڵێ: «ئەگەر بیابانی نۆگرەسەلمان و چیای جەبەل حەمرین وەك یەك بن، ئەگەر درووی وشتر خۆرکە و گوڵی شلێرە یەك رەنگ بن، ئێمە و ئەوانیش یەکین.

بیر ئەکەمەوە کە زۆر و ستەم وەك داری ژەقنەمووت بەری تاڵی رەگەزپەرستی ئەدا و فرۆکەوان لەگەڵ هەر بۆمبایەکا جگە لە وێرانی و رووخان، تۆوی ژاراوی جیاوازی و بێزاریش بە سەرزەوی دڵی خەڵکا ئەپژێنێ.

کوڕێکی گەنج پەراوەکەی لێکەئەنێ و ئەڵێ: «عەزیایەك هەیە کە بە گفت و لفت پیاو ئەخڵەتێنێ و رۆژی کردەوە خۆی بێدەنگ ئەکا. ئێستە بۆم دەرکەوتووە کە شاعیرەکەمان بە هەڵە نەچوو بوو کە ئەیکوت:

«کوڕگەل وەگوێزن چەك بە کۆ
کڵاشینکۆ و خورۆشینکۆ
خوێن و مەرگ و وێرانکردن
تاڵان، گرتن، بە دیل بردن
دیاریەك بوو لە کرێکاران
بۆ ماڵ و مەزرای هەژاران»

لە ناو خێوەتێکا دەنگی نەرم و خەماوی ئافرەتێك کە بێشکەی کۆرپەکەی رائەژێنێ،

هەستی من بەرەو خۆی ئەکێشێ. خوای گەورە هۆزێکی لە مێژینە و خانەدان، هەموو پیاوی مەردی مەیدان، هەموو ژنی پاك داوێن، سەرچاوەی ئەوین و ژیان، هەموو هەستیار و دەروون جوان، ئەمڕۆ ئاوارەن؛ بەڵام نە، بۆچی ئەڵێم ئاوارە؟! چون بە گەلێك کە هەستاوە، لێبڕاوە، لە ماڵ و زەوی تاراوە، ئەکرێ بگوترێ بێچارە یا ناوی بنێن ئاوارە!؟

دەنگی لای‌لایەی دایك دێتە بەر گوێم و ئەڕۆم بۆ گەشتێك لە جیهانی جوانی و شێعر و مووسیقادا. شەپۆلی نەرمی دەنگی بەسۆز ئەمبا و ئەمبا و ئەمگەیێنێتە جێگایەك کە ئیتر شەڕ نەبێ! کۆلارەی فڕۆکە گەرووی کەوباری چیا و کەڵەشێری بەیانی ئاوایی نەبەستێ.

«کۆرپەی ئێسك سووك، خونچەی نەپشکووت

بەهاری باخم، گوڵی سووری رووت

باوکی تۆ رۆڵەی «کاوە»ی دلێرە

«زوحاك» رێوییە، باوکی تۆ شێرە

هەر چەندە ماری سەر شانی «زوحاك»

پەل ئەکوتن بخوا مێشکی روون و پاك

بەڵام تۆ بنوو بە دڵنیایی

خۆر سەر ئەکەوێ، نەك تاریکایی»

تەلی هەست و شعوورم بە شەپۆلی نەرمی لای‌لایە ئەلەرایەوە، لە دڵما جیهانێك راخرابوو، بە هەزار رەنگی برایەتی رازابۆوە؛ بەڵام لە جیهانی راستەقینەدا روانگەیەك بوو کە پڕبە گەروو هاواری ئەکرد: «تەنانەت ئەمڕۆش ئەژدەهاکی مێشکخۆر هەر ماوە.» بەڵام تیشکێك لەوپەڕی سنووری شعوورمەوە برووسکەی ئەدا، ئەتکوت لێوی بەیانێکی تازە پشکووتووە و بە موژدەیێکی خۆش کراوەتەوە تا پێم بڵێ: ئەگەر ئەژدەهاك ماوە، کاوەش ماوە؛ ئەگەر هەستی برایەتی لە هەرێمێك کوژراوە، لە گۆشەیەکی ترا، لە

هەرێمێکا کە ئەمڕۆ هەزاران خێوەتی لە سەر سینەی میهرەبانی بۆ هەزاران ڕۆڵەی ئاوارە هەڵداوە، برایەتی لەمێژینە گەشە ئەکا؛ برایەتی مێژوویی ئەبووژێتەوە!!

نازانم لە بەرچی لە پڕ دڵم پڕ ئەبێ لە سرووودێکی نەکوتراو و ئەمەوێ پڕ بە هەموو ئەو دەشتە بەرینە هەرا بکەم:

ـ «بژی! بژی!»

# شەڕگە

خۆشەویستەکەم!

سێ شەو و ڕۆژە کە سووری ئیسرافیلی شەڕلێدراوە، ئەمڕۆ ئاگر لە هەموو ڕۆژێك بەتینتر بوو. وەك بڵێسەیەك کە بەر بێتە پووش و پەڵاش ئەیتەنییەوە و ئەهاتە پێشەوە. ئەتکوت ماری سوجەی سوورە و گەرمای هاوین وروووژاندوویەتی. لوورەی مەرگ بێ وچان ئەهات، گەرووی تینووی تۆپ و ڕەشاش خوێنی گەشی لاوەکانی قومقوم ئەخواردەوە، بەڵام سوکنایی نەدەهات، لەو سەنگەرەدا کە منی تێدا بووم. دوو

لەشی بێگیان درێژ بوون. یەکیان دەستی گرتبوو بە زامی سەر سینەیەوە و بە دەرد و ئێشەوە گیانی دەرچووبوو. ئەوی تریان کە تازە مووی ریش و سمێڵی بۆر کردبوو، بە دەم بزەیەکەوە هەناسەی دوایی هەڵکێشابوو. من چاوێکم بڕیبووە ناو تەم و مژ و دووکەڵ و تۆزێ کە رووبەرووبمان وەستا بوو و هەر چەند وردەیەك لە ناو ئەو تەم و مژەوە سەنگەرەکەی منیان ئەگرتە بەر رەحێڵەی گوللە و ناچاریان ئەکردم سەرم لە پەنا بەردێکا کە دوو شەوی تەواو لە جیاتی سەرین لە ژێر سەرما بوو، بشارمەوە، بەڵام کاتێ چاوم بە لەشی سارد و سڕی شەرکەرە لاوەکە ئەکەوت، لەشم ئەلەرزی. بەتایبەت بزەی سەر لێوی ئەیترساندم و پڕبەزار هەرام ئەکرد، بە چی پێئەکەنی ئەی دوژمنی مردوو! بەڵام دوژمنی مردوو هەر بزەی ئەهات و وەڵامی نەدەدایەوە.

دیسانەوە سەرم لە سەنگەرەکەم بەرز ئەکردەوە و قاقای شێتانەی شەست تیرەکەم پڕبە دەشتی شەرگە بەرزئەبۆوە. ویزەی گوللەیەکی وێڵ بە لای گوێما تێئەپەڕی و لە سەنگەرێکی تری خۆییدا ئاخێکی ئەچزاند بە دوو لێوی تینووی هەواڵێکی منەوە. مردن وەك دەوارێکی زل، سپای ئێمە و ئەوانی دائەپۆشی. مردن تەنیا شتێك بوو کە لە نێوانمانا جیاوازی نەبوو. هەردووك لامان لێی ئەترساین و هەردووك لاشمان بۆی ئەچووین. لەپڕ بیرم کردەوە ئەگەر وەك لەسەر مردن پێکهاتووین و بڕوامان بۆتە یەك، بۆ ژیان وەها بوایەین، ئێستە ئەم لاوە دوژمنە کە لە سەنگەرەکەی منا کوژراوە و ئەم هەواڵەی من کە وردەیەك لێرەوبەر گیانی دەرچوو، زیندوو بوون و ئێستە لە جیاتی شەڕو کوشتار، من باسی تۆم بۆ ئەم لاوە ئەکرد کە ئەکرا دۆست بێ و دوژمن نەبێ و ئەویش بێگومان باسێکی هەبوو کە بۆمنی بگێڕێتەوە سەبارەت بە دایکی چاوەڕوانی، سەبارەت بە نیگای سڵ و رەوەکی چاوێکی کارمامزی.

ماوەیەکە دوژمن کشاوەتەوە. فڕۆکەکانی هێرش ناهێنن. دەشتی بێدەنگ بۆتە گۆڕستانی هەزاران گیانی بە هیوا و ئەگەر باش گوێ رابگری، پرمەی گریانی خاك

ئەبیـــتی. ئیتر ترسـان نیە هاتـوچۆی سـەنگەرەکان بکەین، هیچکەس قـسـەیەکی نییە بیکا. دووکەڵی بارووت و تۆزی دەشتی گڵەسووره، رواڵەتی شـەڕکەرەکانی رەنگاندووە. بۆنی خـوێن لە هەوای بێ‌سـروەی شـەڕگەدا مـەند راوەستاوە. هـەموو کـەس خـەریکی دۆزینەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەیە، کە بۆچ شـەڕ ئەکا؟ بۆچی ئەکووژێ و ئەکوژرێ؟ بەڵام هیچکەس دەرینـاخا. شەڕکەرێکی پیر لە بەر خۆیەوە ئەڵێ: «شـەڕ بۆ ئازادی، مردن بۆ ژیان!» من کە خەریکم سـوێنم ئەبیتەوە بۆ ئەوە کەسێك قـسـەیەکم لەگەڵ بکا و دڵنـیام کا هێشتا هەر زیندووم، لە لای دائەنیشم. شەڕکەری پیر تێئەگا چیم ئەوێ. لەسەرخۆ ئەپرسێ: «چەند کەست کوشت؟» گیانم پڕ ئەبێ لە بێزاری، بەڵام ئەو لە سـەر قـسـەی ئەڕوا: «ئەگەر رۆژێك دوژمن بتوانێ گیانیـشـمان وەك لەشمان زنجیر بکا، ئەو رۆژە شکـستی دوایـمانە، قڕانی نەتەوایەتیمانە، شەڕ ناخۆشە، ئەم هەموو لێو وشك بوون و ترسانە، ئەم سام و لەرزینە ناخۆشە.» لەو کاتەدا قومقومەی ئاوەکەی کە لەبەر گەرما بۆتە ژەك، بە سەرەوە ئەنێ و چەند دڵۆپ ئاو بە سـەر سمێڵی زلیەوە تروسکەی دێ و بە دەم هەناسەیەکەوە کە نازانی بۆ پشوودانە یا لەبەر پەرۆشی ئەڵێ: «بەڵام لە شەڕ ناخۆشتر ئەمەیە کە تەسلیم بوون و سـەر شۆڕکردنمان پێ ناخۆش نەبێ.»

ئێستە کە من ئەم نامەیە بۆ تۆ ئەنووسم، بەربەیانێکی زووە. چاوەڕوانین کە لەگەڵ دەرکەوتنی خۆرەتاو، باشووی ئاسنین، سێبەری ترسێـەری لە ئاسمانا پەیدا بێ و مەرگ باڵ بە سـەر زەوی شـەڕگەدا بکێشێ، بەڵام من بیرم بە لای تۆوەیە. دێتەوە بیرم کە باسی داهاتوویەکی پڕ ئەوین و دڵداریمان ئەکرد و لەسەر ناوی منداڵەکانمان ئەمانکرد بە کێشە. بیری ئەو رۆژە ئەکەمەوە کە رێ‌ئەکەوتم بۆ شەڕ و تۆ ئەگریای و من بە گریانەکەی تۆ پێکەنینم ئەهات و بەڵێنم ئەدا زوو بگەڕێمەوە بۆ لات. ئەمڕۆ شـەڕ دوایی دێ. ئەگەر ئەکوژرێم، ئەگەر سـەرکەوین، دێمەوە و چاوی لێڵم لە گوڵاوی روونی نیگاتا ئەشۆمەوە. راستیـەکەی ئەمەیە کە مردن تا ئەو کاتە کە زۆری لێ دووری ترسێـەرە. ناچارم نامەکەم

بیرمەوە، چونکە هەر ئێستە گرمەی فڕۆکە و قرمەی گوللە بێدەنگی دەشتی لەناو برد.

دیسانەوە بەرەو سەنگەرەکە ئەڕۆم.

کاتێ شەڕ تەواو بوو، ئەم نامەیە لە پەنا لەشی بێگیانی شەڕکەرێکی گەنجا دۆزرایەوە کە لە خوێن هەڵکشابوو!

ڕەزبەر

# «سەججادی»، «گۆران» ناناسێ

سەلام لە گوێگری بە هەست و هونەرپەرەستی بەرنامەی تاپۆ.

مامۆستا عەلائەددین سەججادی لە سەرەتایەکا کە لە سەر کۆمەڵە شێعرێکی گۆران بە ناوی فرمێسك و هونەر نووسیویە ئەڵێ: «شێعر نەغمەیەکی خەیاڵ یا پەردەیەکی نازکی جەماڵە کە لە کوورەی دەروونێکی بە جۆشەوە سەر هەڵئەدا، لەو دەروونەوە سەر هەڵئەدا کە ئاوێنەی بێ گەردە بۆ وێنەی بارەگای تەبیعەت. شێعر گەلێ کەلێن و قوژبن و گەلێ یاسای جوان جوانی هەیە، ئەمە بێجگە لەوە کە خۆی خەیاڵە،

باوەشیش نەکا بە ئاسۆی تەبیعەت و عالەمدا. هەر کەسە ویستوویەتی ئەو عالەمە و ئەو تەبیعەتە بە جۆرێك و بە شێوەیەك پیشان بدا، بە تایبەتی کە لە رۆژهەڵاتا رێچکەی شیعر تا ئێستە با زۆریش بوویێت هەر لە سەر چەند پەلێکی تایبەتی هاتۆتە کایەوە. شاعیر با زۆریش بوویێتن لەو چەند پەلە زیاتر هیچی تریان نەگرتووە بە دەستەوە. ئەگەر شاعیرێك ویستبێتی تۆزێ ئەو نەغمەیە بگۆڕێ لە بەر ئەوەی‌کە نەغمەکە زۆر ئاشنای گوێگران نەبووە، خێرا گوێچکەیان لێی زرنگاوەتەوە و حەزیان کردووە با بدەنەوە بەلای ئەو رێچکە و شێوانەوە کە دەمێ ساڵە لەگەڵی راهاتوون. بەم بۆنەیەوە رەمەکی مەردمەکە ـ مەگەر هێندێکی تایبەتی نەبێ ـ شیعرێ کە دیلی قافیە یا خەیاڵێکی کۆن نەبێ زۆر بۆی ئاشنا نییەوە. دیارە ئەمەش پێچەوانەی ئەو گۆڕانەیە کە بە سەر هەموو ورد و درشتێکی کەوندا دێت.»

مامۆستا عەلائەددین سەججادی پاشان گۆران بە دەسپێکەری شێوەی نوێ لە شیعری کوردیدا ئەناسێنێ و ئەڵێ: «گۆران لە رەخنە و ئیراد نەترسا و شیعری لە کۆت و زنجیری قافیە رزگار کرد.» مامۆستای هەڵسەنگێنەر و نووسەر عەلائەددین سەججادی هەر لەو سەرەتایەدا ئەنووسێ: «گۆران لە شیعردا شێوەیەکی رۆژئاوایی گرتووە. تاقە ئامانجی دەربڕینی خەیاڵ و دروستکردنی مەعنای شیعرە، نە وەك تەنیا وشەی شیعر.»

ئەمە بڕوای مامۆستا عەلائەددین سەججادییە؛ بەڵام من لام وایە مامۆستا هەڵەی کردووە، چەن هەڵەی زۆر بەرچاو. یەکیان ئەمە کە لای وایە شاعیری بەرز گۆرانی ئەمر شیعری بێ‌قافیە کوتووە، من لە سەرانسەری دیوانەکەیا بۆنموونەش پارچە شیعرێکی بێ قافیەم بەرچاو نەکەوتووە، تەنیا جیاوازی مامۆستا لەگەڵ شاعیرەکانی ترا ئەمەیە کە گۆران زۆرتر پەرژاوەتە سەر کاکڵی شیعر، واتە مەفهووم و مەعنا؛ قالب و توێکڵ واتە دیوی دەرەوەی شیعری ئەوەندە لا بەرز نەبووە کە بایەخی زیاتری لە مەفهووم و مەعنا بۆ دابنێ، بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگە کە دیوی دەرەوەی شیعرەکانیش نارێك

و نالەبار بن. مەعنایەکی جوان لە قالبێکی دزێودا لە مەیەکی نەشەبزوێن ئەچێ کە کرایتە ناو سوالەتە شکاوێکەوە و مەعنایەکی دزێویش لە قالب و توێکلێکی جواندا لە ناوێکی لیخن و لێڵ ئەچێ کە کرایتە زەرفێکی زێڕینەوە. شێعرێکی جوان کە ماناکەی گەشە بدا بە دەروون، هەر کام لەم دوانەی نەبێ، واتە کاکڵ و توێکڵ، هەرکام ناحەز و دزێو بن لە جوانی شێعرەکە کەم ئەکەنەوە. زۆر کەسی وا هەن کە پەیڕەوی شێوەی سووررێئالیستین و لایان وایە تەنیا وشەی شێعر ئەبێ جوان و بە ئاهەنگ بێ. «ژۆرژساند» ئەڵێ: «شێعرێکی وشەجوان و بەئاهەنگ هەر چەند بێ مەعناش بێ جوانترە لە شێعری بە روالەت ناقۆڵا و بە مانا بەرز.»

مامۆستا عەلائەددین سەججادی ئەنووسێ کە مامۆستا گۆران ئەو شێوە شێعرییەی داهێنا و شێوەکە شێوەیەکی رۆژئاواییە. ئەگەر قسەکەی مامۆستا سەججادی راست بێ، بەواتەی خۆیان مەردمەکە مافیان هەیە لێی بسڵەمێتەوە و گوێی بۆ شل نەکەن. لە وەڵامی مامۆستا سەججادیدا ئەڵێم کە شێوەی نوێ ئەگەر بە تێکشکاندنی ئوسوولی عەرووزی بڵێن، واتە نیوە شێعرەکان لە باری کورتی و درێژییەوە وەك یەك نەبن و قافیە وەك ئەسڵێکی نەگۆڕاو لە شێعرا نەبێ، ئێمەی کورد لە پێش شێوەی عەرووزییا کە هی عارەبەکانە «بەیت»مان هەبووە کە نە نیوە شێعرەکانی بە تەرازووی «ف ـ ع ـ ل» بەرامبەرن، نە دوو نیوە شێعرەکان وەك یەك و بەئەندازەی یەك کورت و درێژن. من ئێستاش بۆم دەرنەکەوتووە بۆچ نووسەران و هەڵسەنگێنەرانی کوردی عێراق بە قوتابخانەیەکی هەرە بە نرخ و هەرە خۆماڵی ئەڵێن: «فۆلکلۆر»؟! بەیتەکان شاعیرەکانیان ناسراون. خەیاڵاوی و رازاوەن. گاهێ تراژێدییەکی ئەوەندە گەورەیان تێدایە کە تەنانەت لە تراژێدییەکانی ئورووپاییش بەرزترن. «زەماوەندی خوێناوی» گارسیا لۆرکا لە چاو بەیتی سەیدەوان ئەوەندە بچووکە کە پیاو ناتوانێ بەرامبەر یەکیان دابنێ و بە یەك هەڵیانسەنگێنێ.

پرسیارێکم لە مامۆستا سەججادی هەیە؛ ئەم مەردمە کە شێعر ئەخوێننەوە و لێی تێئەگەن، ئاخۆ لە گەشتی قەرەداغ و هەورامان باشتر حاڵی ئەبن یا لە «شیرین تەشی دەرێسێ»ی «وەفایی». بەڵێ تەشی رستن لە ناو ئافرەتانی کوردا باوە. بەڵام وەفایی کە بە شێوەی عەرووزی شێعری کوتووە، ئەوەندەی باسی ئەستێرەناسی و مەبەستی قووڵتر تێهەڵکێشاوە کە تەنانەت خوێندەوارانیش ئەبێ لە مامۆستایەکی گەورەی شێعرناسی بپرسنەوە تا سەرەندەری لێبکەن: «سەمای بە ذوذنب دا کف الخضیبی شیرین» کەی بۆ مەردمە؟

شێعرێك کە لە ژیانی خەڵك ئەدوێ و بە زمانی خەڵك ئەدوێ ئەم چەند شێعرەیە لە گەشتی قەرەداغ:

شەو دانیشتبووین گشتمان لە سەربان،
پیاوێك پەیدا بوو خەڵقی دێی دووکان؛
بۆ سەر زەماوەند خوڵقی ئەکردین،
کەوتینە راوێژ: «بچین یا نەچین».
من لە بەر ئەوەی بێ وڵاغ مابووم،
لە ئاستی «بچین» ترشم ئەکرد رووم.
پاش لێکدانەوەی زۆر و یەك و دوو
کە دیم وڵاغم بۆ جێبەجێ بوو،
ئەمجار دەستم کرد بە کۆمەڵ هاندان،
بۆ رۆیشتنی سەر شایی دووکان،
لەوێوە بووك تا «سەیوسێتان» بردن
بینینی هەر دوو پەردەی ژن بە ژن!

⁂

بەیانی سەعات دەوری هەشت، کۆمەڵ
ڕێکەوت چەن سوارێك، ئەهالیش لەگەڵ
هەموو جل گۆڕیو، سەر و ڕیش تاشیو
لە ئەسب درابوو ڕەخت و ڕەشوەی زیو
ئێستا و تاوێ‌تر حیلەی ئەسپی شێ،
غار و ڕمبازێ تەختایی لاڕێ،
وای خەریك کردم بە خەیاڵەوە
کاتێکم زانی، بە قەدپاڵەوە
«دووکان» دیاری‌دا لە بناری شاخ،
ژووری ئاش وبی، خواری شیو و باخ...

ئەم شێعرانە کامیان شێوە ڕۆژ ئاواییین؟ ئاخۆ لەمە جوانتر ئەکرێ دیمەنێك بخرێتە بەرچاوی کوردێك کە لەگەڵ ژن بە ژن و هەڵپەڕکێ و سواری و میوانداری گەورە بووە؟

دووی ڕێبەندان

# «گۆران» و سیحری بەیان

سەلام لە گوێگری بە هەست و هونەرپەرەستی بەرنامەی تاپۆ.

هونەرمەند دوو ژیانی هەیە. ژیانێك لەو كاتەدا كە زیندووە و وەك خەڵكی تر هەناسە ئەكێشێ، ئەبزوێ و لە ناو كۆمەڵا دێت و دەچێت. بە كورتی ژیانێك كە ژیانی لەشە و ژیانی لەش سنوورێكی هەیە و پاش ئەوە گەیشتە سنوور ئەبڕێتەوە و بە رواڵەت مەرگی بە سەرا دێت. بەڵام لێرەدا هونەرمەند و هەموو ئەوكەسانە كە بە چەشنێ كاریان كردۆتە سەر كۆمەڵ و شوێنەواری باشیان لە پاش بە جێ ماوە لە خەڵكی ئاسایی

و عادەتی جیا ئەبنەوە. مەرگ تەنیا دەستی تاڵانی ئەگاتە لەشیان و گیانیان لە دەسدرێژی مردن بەرزترە. ژیانی پاش مردنی لەش ژیانێکی هەتا هەتاییە و هونەرمەند تا کۆمەڵ هەیە و تا شوێنەواری جوان و باش رێزی هەیە، ئەژی.

بەڵام لە دڵی خەڵکا، لە ناو وتار و شێعر و نەخش و نیگار و لە ناو شەپۆلی سیحراوی مووسیقادا. کێ ئەتوانی بڵێ «بیتهۆڤین» و «باخ» و «فردەوسی» و «عەلی بەردەشانی» و «بووعەلی‌سینا» و «ئێدیسۆن» مردوون؟!

گۆران شاعیری پایەبەرزی کورد، یەکێکە لەو گیانە ئەبەدییانە کە هەتاهەتایە زیندووە. تا جوانی هەیە. تا هەورامان و قەرەداغ بەهارانە بە گوڵ و گیا ئەخەملێن، تا تووترکی سوور ئەبێتە کۆشی بەخت بۆ بووکی شەرمن و نازداری وەنەوشە؛ گۆران هەر ئەمێنێ و بە واتەی خۆی تاجی شکۆ بە ئوستادێکی وەك ئەو ئەدرێ لە توێی شێعری تەلیسماویا.

سەبارەت بە بەسەرهاتی گۆران ئەوەندە بەسە کە بڵێم ناوی سولەیمان بەگی کاتبی فارسی بوو. لە شاری هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٠٤ی میلادییا لە دایك بوو و لە رۆژی ١٨ی مانگی ١١ی ساڵی ١٩٦٢ لە سولەیمانی مۆمی ژیانی توایەوە و تەواو بوو و بەوە کۆڕی هەستیاران لە پرشنگی گەشترین ئەستێرەی ئاسمانی ئەدەب بێبەش بوو و رەش داگەڕا.

گۆران جگە لە دەسەڵاتی هەرە زۆر و هەستی هەرە ناسکی لە شێعرا خاوەنی پلە و پایەیەکی تایبەتە کە لە شاعیرانی تری جیا ئەکاتەوە. گۆران دەسپێکەر و دامەزرێنەری شێوەیەکی نوێیە کە پاش خۆی بۆتە رێبازی شاعیران و ئەتوانین بڵێین قافڵەسالاری کاروانی شێعری نوێی کوردی مامۆستا «گۆران»ە، بەڵام کاتێ «گۆران» بوو بە رێبواری ئەو رێگایە، رێگاکە شوێنی پێی کەسێکی تری بە سەرەوە دیار نەبوو. گۆران لە سەرەتای کاری شێعری خۆیا شێوەی کۆنی عەرووزی بەکار ئەهێنا، بەڵام زوو

تێگەیشت کە بەرگی خوازراوەوەی لاوەیی بۆ ئەندامی شل و ملی نۆبووکی وێژەی کوردی نابار و ناکولێوکارە. لەو پەلەوەرانەی هەستی کە لە ناو هێلانەی گیان و دڵیا جریوەیان ئەهات، لە چوارچێوەیەکی هەرووزی تەنگ و تیواردا نارامیان نەدەگرت. شابازی خەیاڵی گۆران ئەوەندە بەرزەفڕ بوو کە عاستەم ئەکرا لە چوارچێوەی هەڵبەستا قەتیس بکرێ. خۆی ئەفەرموێ:

هەرچەن ئەکەم، ئەو خەیاڵەی پێی مەستم،
بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم!
لێکدانەوەی دەروون، قسەی زمانم
بۆچی وەها دوورن لە یەك؟ نازانم!
ئەمویست دەروون بکرایەوە وەك تۆمار
دەرکەوتایە دونیای جوانتر لە بەهار،
دەرکەوتایە: ئاوات، هیوا، خەوبینین
پڕشنگدارتر لە ئەستێرەی قوبەی شین!

گۆران باش شارەزای گۆڕانی هەل و مەرج و هەڵوێستی نوێی کۆمەڵ بوو. ئەیزانی باوی نەماوە زولف وێچوێندرێ بە زرێ و مژۆڵ و برژانگ بە تیر و کەمەر بە موو، بەژن و باڵا بە سەوڵ و چنار. ئەیزانی کە ئیماژ و ئیستعارە و تشبیە لە شیعرا دەور و نەخشی چییە و هەروەها ئەشیزانی بە کوردی شیعروتن و بۆ کورد وتن، بە جوانی کوردەواریدا هەڵکوتن، ئەبێ بە لێکدانەوەی تایبەتی کوردانە بێ. سەرەڕای هەموو ئەمانە گۆران ئەیزانی کە گوڵزاری وێژەی کوردی گژ و گیای دزێوی دەشتی زیخەڵان و درووی موغیلان دایگرتووە و باغەوانێکی وریای گەرەکە ئەم دڕكوداڵ و گژوگیایە بژار کا تا گەشە و نەشەی گوڵی ئاڵ و واڵای باخچەی کزی کوردی دەرکەوێ و لە سەر هەر پەڕەی گوڵێکی ئەو گوڵجارە بولبولێك بە نەغمەی وردەوە هەوایەك بڵێ. هەوایەك کە خورۆشی

رۆحی بێگانەی تێدا نەبێ و سکاڵایەك بێ بە لاوك و حەیران و نای نای لەگەڵ گیانی تامەزرۆی هەستیاران. گۆران لە باری تەشبیهەوە وردترین و گەورەترین و ئەگەر باشتر بڵێم جادووکارترین شاعیری سەدەی بیستەمە. نەك هەر لە ناو کوردا، بەڵکو لە ناو گشت جیهانی وێژەدا:

شنەی سێبەری داری گوێز و توو
ئەسڕێ ئارەقی ڕێبواری ماندوو

● ● ●

ئەکشێتە ناو باخ توولە ماری ڕێ

● ● ●

چەن پیرێك ئەبن بە خڵتەی لاقاو

● ● ●

گوڵە بەرۆژەی قژ زەردی چاوکاڵ
مل کەچ وەستاوە سەرگەرمی خەیاڵ

● ● ●

پەلکەزێڕینەی پاش بارانی زۆر
چەماوەتەوە بەرامبەر بە خۆر

● ● ●

روو لە عەرشی پاك ئەلەرایەوە
بۆ گیانی مردوو ئەپاڕایەوە

● ● ●

گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە،
کە لە ژێر سێبەری تووتڕکا خامۆشە!

ئەوانە و هەزارها تەشبیهی تریش هەرکامیان بگرن خۆیان پەراوێکن کە ئەکرێ هەزارها لاپەڕەیان لە سەر بنووسرێ و جوانی و هونەری شاراوەیان بخرێتە بەرچاو. گۆران نەك هەر لە باری سەنعەت و فەننانییەوە، بەڵکوو لە باری کۆمەڵایەتیشەوە، شاعیرێکی تاقانەی کۆمەڵیەتی کە ئەڵێ:

پڕ ئەشکەوتێك سام و گومان
ئەخاتە دڵ بۆ داخورپان
هەوای قەفەس گەرووگیرە
قەنارەم قووڵایی بیرە

کام بیر؟ ئاخۆ مامۆستای بەهەشتی سکاڵای لە دەست کام بیر و کام هەوای گەرووگیرە؟

بێگومان دیتی دزێوی لە ناو کۆمەڵا خموش وخاڵی ئاڵۆزی ئەخاتە سەر لاپەڕەی سپی و بێگەردی هەناوی شاعیرێکی وەها ناسك خەیاڵ و خاوەن هەست کە تووڕەی ئەکا لە گیان، وەڕەزی ئەکا و ئاگر بەرئەداتە دەروونی و ئەو ئاگرە ئەبێتە بڵێسەیەك کە ناوی زمان و پێنووسە.

پلووسکی پێنووس ڕەهێڵەی بارانی خەم و خەفەت هەڵئەلووشێ و بە تەوژمێکی هەستیارانە دەریئەداتەوە و ئەبێتە شێعرێك کە مووەمان ئەکاتە ئەشتەر و ئەمانخاتە ناخی ئەو جیهانەوە کە گۆرانی تێدا بووە. ئەمەیە ئەوپەڕی هونەرمەندی کە بتوانێ خەڵك لەگەڵ خۆیا بەرێ و پەردەی ئەو جیهانەیان بۆ هەڵداتەوە کە چاو و هەستی وردی دیویەتی و ناسیویەتی؛ ئەو جیهانە کە ئێمە بێ دەربەست بەلایا تێپەڕین و هۆیەکانی ناتوانین شی بکەینەوە. گۆران ئەگەر لە وتارێکا بکرایە بیناسین ئیتر گۆران نەبوو. کە وەهایە ئەیهێڵینەوە بۆ وتارێکی تر و هەلکەوت و هەلێکی تر.

تائەو کاتە خواتان لەگەڵ.

١٣٥٢/١/١٥

# «گۆران» و جوانی

سەلام لە گوێگری بە هەست و بەرێز و هونەرپارێزی بەرنامەی تاپۆ.

مامۆستا گۆران و شوێنەوارە بەنرخەکانی لەوانە نییە کە لە چەن وتارێکی چوار یەکە سەعاتیا بناسێنرێ. بەڵام ئەگەر هەموو جوانییەکانی هەست و چێشکەی مامۆستای ئەمرمان بۆ هەڵنادرێ و کاتی تەسک و تیواری بەرنامەکە رێگەمان نادا. خۆ ناشکرێ لەم هەموو جوانییە چاو پۆشین و بە لای گوڵزارێکی بۆن خۆشا تێپەڕین و پڕ بە دەروون سینەی لێ پڕ نەکەین. جا کە وایە ناچارین کارێك کە لە بەرنامەیەکا نالوێ، لە

بەرنامەدا بیکەین. هەڵبەت دیسانەوەش ناتوانین بەڵێن بدەین کە هەموو جوانییەکانی شێعری گۆرانمان باس کردووە.

مەولانا جەلالەددینی رۆمی، شاعیری هەرە گەورەی فارس لێرەدا ئەگاتە فریامان و بە جوانترین شێوە دەسکورتیمان ئەشارێتەوە. مەولانا ئەڵێ:

آب دریـا گـر کـنـی در کـوزەای　　چـنـد گـنـجـد قـسـمـت یـك روزەای

آب دریـا را اگـر نـتـوان چـشـیـد　　هم بـه قـدر تـشـنـگـی بـایـد چـشـیـد

مانای ئەم دوو شێعرە بە کوردی ئەبێتە ئەمە: ئەگەر بتەوێ ناوی دەریا بڕێژییە ناو گۆزەیەکەوە هەر بەشی رۆژێك ئەبا، بەڵام ئەگەر چی ناتوانین هەموو ئاوی دەریا هەڵمژین، لانی کەم بە ئەندازەی تینوویەتی ئەبێ بخۆینەوە.

گۆران نزیکەی ٢٣ ساڵ لێرەوبەر واتە لە بەرواری ١٩٥٠/٦/٢٥دا لە هەولێر سەرەتایەکی کورتی بۆ کۆمەڵە شێعرێك بە ناوی «بەهەشت و یادگار» نووسیوە و لەو سەرەتایەدا ئەڵێ: «بەهەشت و یادگار کۆمەڵە شێعرێکە لە دیوانەکەم. سەرانسەر لەگەڵ بابەتەکانی جوانی و دڵداری خەریکە. هەڵبەستی وای تیایە کە بیست وپێنج ساڵ، بەڵکوو زیاتر، لەمەو پێش دانراوە. هەروەکوو هی چەند مانگ لەمەوبەریشی تیایە. بەشی زۆری کۆنەکان بە وەزنی عەرووزی و کوردییەکی کۆنی تێکەڵاو بە زمانی بێگانە نووسراون. ئوسلووبیشیان کۆنە. یان وەك هی سالم و نالی لە سەر پێ‌وشوێنی غەزەل هەڵبەستراون، یان ئەو جۆرە ئوسلووبەیان تێدا کراوە بە سەرمەشق کە مامۆستا «م ـ نووری» و هاورێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی ئوسمانییان وەرگرتووە و لە سەردەمێکی سنووردارا(١٩٢٠ـ ١٩٣٠) شێعری کوردی ناوچەی سلێمانییان پێ تازە کردەوە. ئەم کۆنانە زۆربەیان بە ناوی «یادگاری کۆن»ەوە کراون بە بەشێکی جیاواز.» پاشان مامۆستا گۆران لە سەرەتایەکدا بۆ ناسینەوەی تازە و کۆنەکان مقیاس و تەرازوویەك ئەداتە دەست و ئەنووسێ: «رێگای هەرە چاك بۆ جوێ‌کردنەوەی تازە و کۆنیان چەند

وردبوونەوە لە زمان و لۆغەتی پێنووسیان راسپێری ئەکەم، هەچ هەڵبەستێك وشە و تەرکیبی عەرەبی و فارسی زۆر تیا بێ بە ئەندازەی ئەو زۆریە، کۆنە؛ پێچەوانەی ئەوەش دیارە پێچەوانەیە!»

وا دەرئەکەوێ کە مامۆستا لە شێوەی غەزەلدا پەیرەوی لە نالی شاعیری هەرە بەزر و ناسك خەیاڵی کورد کردووە و پاشان ماوەیەك چۆتە سەر ئەو شێوە تازەیە کە مامۆستا نووری و هاوکارەکانی لە شێوەی تازەی تورکەکانی عوسمانییان وەرگرتووە. ئەو شێوەیە لە ناوچەی سلێمانیا لە ١٩٢٠ەوە تا ١٩٣٠ واتە ماوەی دەساڵ لە گەشەکردنا بوو.

لە وێژەدا شاعیرە گەنجەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی یانی ئەو ئیمپراتۆریە کە ئاخر و ئۆخری ژیانی بوو، شێوەیەکی نوێیان دامەزراند کە لە چاو شێوە کۆنەکان کە لە سەر شێوەی عەرووزی عەرەبی بوو، شێوەیەکی تازە بوو. ئەو شێوەیە بە پێی پێویستی کات و بەگوێرەی گۆڕان و تەحەوولی بیروبڕوای گەلی تورك پەیدا بوو. شێوەیەك بوو شۆڕشگێڕانە و نەتەوایەتی. بەڵام هەرچی بوو لەگەڵ باری گەلی کورد نەدەهاتەوە و مامۆستا نووری و هاوڕێکانی بە هەموو کۆششیانەوە نەیانتوانی بەرگی کوردانەی لەبەر کەن و بیکەن بە خۆماڵی. چونکە لەگەڵ قۆناخێکا کە کورد ئەو کاتە پێیا تێئەپەڕی، جیاوازی هەبوو و یەکتریان نەدەگرتەوە. مامۆستا گۆران یەکەم شاعیری کوردە کە تا ئەو رادەیە ئەوینداری جوانی بووە. جوانی هەڵاتنی خۆر، ئاوابوونی خۆر، رەوتی جوان، روانینی جوان و بە کورتی هەر شتێ کە ئەکرێ سفەتی جوانی بۆ بهێنرێ. بە تایبەت جوانی ئافرەت. لە کۆمەڵە شیعری بەهەشت و یادگارا چاومان بەم سەردێڕانە ئەکەوێ:

ئافرەت و جوانی، رەوتێکی جوان، ئاواتی دووری، گوڵی خوێناوی، خۆزگەم بە پار، سکاڵا، بۆ جوانی سەرەڕێ، بەستەی دڵدار، جوانی لە لادێ.

هەموو ئەم شیعرانە سەبارەت بە جوانی ئافرەتن و ئێمە لە دوایی ئەم بەرنامەدا لە کۆمەڵە شیعری بەهەشت و یادگار، پارچە شیعریکتان بۆ ئەخوێنینەوە.

شیعرەکە ناوی سکاڵایە و لام وایە پێویست ئەکا کەمێك لە کاکڵەکەی بدوێم.

کوڕێکی گەنجی ئاسایی کە نە زۆر جوانچاکە و نە لە هیچ بارێکی ترەوە زیادەبەشێکی هەیە، تووشی کچێکی هەرەجوان ئەبێ. کچێك کە لە هەموو بارێکەوە لە کوڕەکە لەپێشترە. لەبەر ئەمە کورە هەست ئەکا سوودی نیە قسەی لەگەڵ بکا و رازی دڵی لا بدرکێنێ، یا تەنانەت سەیری بەژن و باڵای کچەکە بکات. لەولاشەوە کیژۆڵەی جوانی بەلەنجەولار، لەبەر خۆیەوە بیر ئەکاتەوە کە ئەم کورە گەنجە بۆچ وەك گەنجانی تر سەری بۆ دانانەوێنێ و پرێسکەی دڵی بۆناکاتەوە. لەناکاو وا تێئەگا کە ئەو گەنجە خۆبە گەورەزان و خۆپارێزە و ئەبێ بە سەدان دڵبەری جوانکیلەی هەبێ و ناپەرژێتە سەر ئەو. هەر ئەم خۆگرتن و پێنەمنگییەی کوڕەکە کارێك ئەکا کە کیژەکە بیەوێ ئەم قەڵا پۆڵایینە برووخێنێ و سەر بەم گەنجە خۆبەزلزانە داچەمێنێ. لەپێشدا بە زەردەخەنەی نادیاری، پاشان بە ئیشارەی چاو و برۆ پەیغامی دڵداری بۆ کورە رەوانە ئەکا. کوڕیش لەخودا لەخوازێ کە سەر و گیانی بخاتە پێتاوی ئەو کیژە جوانە و ئێستە کە کچەکە خۆی ئەوینی خۆی دەربڕیوە،بە هەڵیکی باشی ئەزانێ و وەڵامی پەیغامی ئەداتەوە و وێڵی ئەبێ. کەنیشکەکە لە پڕ تێئەگا شتێ کە ئەوی بۆ لای کوڕەکە ئەکێشا، غروور و قسەنەکردنەکەی بوو، ئێستە کە ئەویش چەشنی گەنجەکانی تر وێڵ و ئاوارە و ئەویندار و دڵبریندار بووە، هیچ جەزبە و کێشەرێکی نەماوە، لەبەر ئەمە رووی لێوەرئەگێرێ و نامیهرەبانی لەگەڵ ئەکا. کوڕەکەش تیری ئەوین لە دڵی سمیوە و بەم ساکارییە ناتوانێ دەس هەڵگرێ و ناچار شین ئەگێڕێ بۆ دڵی لە دەس چووی....

جا ئەمەش شیعرەکە:

لە سەمای بەرزی ئاوبانگی حوسنا

ئاقەستارە،

دەبووی لە وزەی دەسکورتی منا
ئاشکرا و دیارە!
هەر لەبەر ئەوە رووم لێوەرگێڕای
یەکەم ئەسادوف
دڵەی حەسساس تا، بەردم پیشان دای
بەڵام ئەئەسوف:
واتزانی کە من موستەغنی و غەیرام
حەریسی تۆ بووی لێم
تێهەڵچووی: بەدەم، ئیشارەت، پەیغام
پەیمانت دا پێم!
هەیهات! مەلی دڵ، خوێن گەرمی شەباب
ئەفرەی ئاسان بوو،
کەوتە شوێن قسەت، فڕی بە شیتاب،
وێڵی ئاسمان بوو...
کەچی نەیشتهێشت، پێ لە سەر سینەت
بنیشێتەوە!
لاتبرد لە رێگای هەوای مەحەببەت
دوورت خستەوە!

●●●

مەلی ناو فەزای ئەموتەناهیم!
دڵی لاوم رۆ!
مانووی ئینتیزار رێی وەعدی واهیم:
نووری چاوم رۆ!

# «گۆران»ی رچەشکێن

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ. هیوادارین بەختیار و سەرکەوتوو بن و ئەگەر رەخنە یاخود پرسیارێکتان سەبارەت بە مەبەستە هونەرییەکان هەیە، بۆمانی بنووسن، هەروەها ئێمە ئامادەین ئەگەر پارچە هەڵبەستێکی جوانتان هەبێ یا پەخشانێکی ئەدەبی و بۆمانی بنێرن بە ناوی خۆتانەوە بڵاوی کەینەوە بەشەرتێ بتوانین بڕوای خۆمان سەبارەت بە نووسراوە و شێعرەکانتان دەربڕین و ماوەی ئەمەمان هەبێ کە هەڵە بەرچاو و دیارییەکانی نووسراوەکان راست کەینەوە.

مامۆستای نەمر گۆران سەرەتا دامەزرێنەری شیعری نوێی کوردی بوو و یەکەم کەسێك بوو کە رچەی شکاند و کەوتە پێش شاعیرانی دوای خۆی. رێگایەك کە مامۆستای بەرزی کورد لە هونەری شیعرا گرتیە بەر، تا ئەو رۆژە کەس پێیا نەرۆیشتبوو. بەڵام دۆزینەوە و ئیبداع و خوڵقاندنی هونەری وەك هەموو شتێکی نوێ و بگرە پتر لە هەموو شتێکی نوێ پێویستی بە ئازادی بیر و بڕوا و سەربەخۆیی و بەهێزی مێشك و هەڵاوی ئەو کەسە هەیە وا یەکەم دەسپێکەر و دۆزەرەوە و خوڵقێنەرە. مامۆستا گۆران لە ناو خەڵکا ژیابوو، لە حوجرەی فەقێیان، لە دیوەخان و خانەقا، لە شار و لە دێ، لە ناو هێل و شاریا وەك یەك شارەزا بوو. هەروەها تێراوی سەرچاوەی ئەدەبی کۆنی کوردی و ئەو ئەدەبانەی تر بوو کە کاریان کردبووە سەر ئەدەبی کوردی. جا بە هۆی ئاینەوە بێ یا تێکەڵایەتی مێژوویی و هەرێمی و شتی ترەوە. لەبەر ئەمە گۆرانی نەمر لە پێشا شیعری عەرووزی کوت و لەم شێوەیەشدا هێز و دەسەڵات و مامۆستایی خۆی تەواو دەرخستووە. زۆر مەزموونی وا هەیە کە مامۆستا هەم بە شێوەی عەرووز و هەم بە شێوەی نوێ کردوویەتی بە شیعر. وەك ئەم مەزموونەی چوونە کانی و ئاوهێنانی ئافرەتان لە کوردستان، کە سووژە و هەوێنێکی خۆماڵی و ناسراوە لە ناو کورد و ئەدەبەکەیا.

«رێی کالی قوربان موتەزیری جیلوەیی نازە» یەکێکە لە شێعرە هەرە جوانەکانی مامۆستا. لەگەڵ ئەوەشا بە گوێرەی ناچارییەك کە شێوەی عەرووزی بۆ شاعیری ئەهێنێتە پێشەوە زۆر وشەی عارەبی و لێکدانەوە و تەعبیری ئەدەبەکانی هاوسێی تێدا بەرچاو ئەکەوێ و شاعیری ناچار کردووە لە باتی قوربان بۆ هاتنەوەی شێعرەکە بڵێ «قوبان»! هەروەها مامۆستا ئەم مەزموونەی لە جێگایەکی ترا بە قالبی عەرووزی و ناوەرۆکی نوێوە کردووە بە شێعر و ئەڵێ:

هەموو بە حەسرەتەوە گوڵ ئەکەن نساری رێت

بزانین ئاخۆ گوڵی کێ بە دڵتەوە ئەلکێت.

گوڵ بە دڵەوەلکان بە مانای ئەمە کە گوڵی کام گەنج کار ئەکاتە سەر هەستی کچانەت. تەعبیرێکی تەواو نوێیە و وێنەی لە وێژەی کوردیا نییە. مامۆستا بە شێوەی نوێ، نوێ چ لە باری کاکڵ و چ لە باری توێکڵەوە ئەم مەبەستەی کردووە بە شێعر. گۆران هەست ئەکا بۆ شاعیرێکی پێشکەوتوو تەنیا شارەزایی بە ئەدەبی کۆن و تەنیا ئەدەبی نەتەوەکەی و هەرێمەکەی بەس نییە. هەست ئەکا بەر لەوە هەرێمی رامیاری یا یەکیەتی گشت مرۆڤ پێ دی پێویستە لە وێژەدا بە تایبەت لە شێعرا کە لە هەموو هونەرێکی تر لە عاتیفە نزیکترە ئەم مەبەستە ئەبێ پێکبێ و مرۆڤ بێ ئەوە چاو لە زمان و زانیاری و نەتەوە و هەرێمەکەی بگرێ، ئەبێ بێتە یەك خێزان و بۆ ئەم مەبەستە شاعیر پێویستی بە روانین و شارەزابوون بە سەر وێژەی بێگانەدا هەیە. باشتر وایە کە شاعیر خۆی زمانی بێگانە بزانێ و بێ ئەوە ناچار بێ وەرگێڕاوی نووسراوەکانی لاوەیی بخوێنێتەوە بتوانێ راستەوخۆ لەگەڵ بیر و هەست و عاتیفەی شاعیری لاوەیی تێکەڵ بێ تا دیوانەکەی برانس و شیلی و شکسپیر بخوێنێتەوە و پاش خوێندنەوەی دیوانی برانس، بەم جۆرە شاعیرانە بچێ بە تانی جوالییەکانیا و بڵێ: دیوانەکەی برانس کە نەغمەی شێعری ئەڵێی کچە پێنەکەنێ یان ئەگری. راستی جوانتر لە گریان و پێکەنینی ئافرەت چی هەیە؟ هەردوو ئەم دوو حاڵەتە، واتە ئەمپەڕ و ئەوپەڕی تێندرانی عاتیفە ئەبنە هۆی دەرکەوتنی گەوهەری بە ورشەی هەناوی ئافرەت، یانی ئەو ئادەمیزادە کە تانوپۆی لە هەست و نەرمی و خۆشەویستی پێکهاتووە.

گۆران، گەورەترین شاعیری کوردە کە کەلێن و قوژبنی گیانی ئادەمیزاد ئەپشکنێ و رووناکی شێعری ئەخاتە سەر تاریکایی هەست و عاتیفەی مرۆڤ. گۆران هەر ئەو شتانە ئەڵێ کە هەموو ئادەمیزادێك لە دڵیا هەستیان ئەکا. بەڵام ناتوانێ دەریانبڕێ. گەورەترین جیاوازی شاعیر لەگەڵ خەڵکی ئاساییا ئەمەیە کە پەریزادی خنجیلانەی ناو پەردەی خەیاڵ بە تەلیسمی وشە ئەخاتە بەرچاو و ئەیهێنێتە سەر

شانۆی دیدار. هەموو کەس جاری وا هەیە هەست ئەکا ئەوەی لە دلّیا ئەجوّشیّ، لە لایەکەوە گەورەترە لەوە کە لە پەیمانەی میّشك و دەروونیا بحەویّتەوە. بەلّام کاتیّ ئەیەویّ لە پلوسکی زمانەوە هەلّیرِژیّ و بیخاتە ناو دەفری وشەوە ئەبینیّ کە لە وزەدا نییە ئاوی دەریا لە گوّزەیەکا جیّ بکریّتەوە.

تکایە گوّی بگرن بوّ چەند شیعریّك لە پارچە شیعریّکی ماموّستای بەرز و نەمر:

هەر چەند ئەکەم، ئەو خەیالّەی پیّی مەستم،

بوّم ناخریّتە ناو چوار چیّوەی هەلّبەستم!

لیّکدانەوەی دەروون، قسەی زمانم

بوّچی وەها دوورن لە یەك؟ نازانم!

ئەمویست دەروون بکرایەوە وەك تۆمار

دەرکەوتایە دونیای جوانتر لە بەهار

دەرکەوتایە ئاوات، هیوا، خەوبینین

پرشنگدارتر لە ئەستێرەی قوبەی شین!

تا بەرنامەی داهاتوو بە خواتان ئەسپێرین و بەڵێتان ئەدەین کە لە بەرنامەکانی ترا باسی ئەو شاعیرانەتان بۆ ئەکەین کە شوێنی گۆرانیان گرتووە و هەروەها پلەی ئەمڕۆی شێوەی نوێ لە شیعری کوردیا باس ئەکەین. تا ئەوکاتە بەختیار و سەرکەوتوو بیتان ئاواتەخوازین.

# «شێرکۆ بێکەس» و گروگاڵ دوای «گۆران»

سەلام لە گوێگری بەهەست وهونەرپەرەستی بەرنامەی تاپۆ. لە بەرنامەی رابردوودا باسی مامۆستا گۆران و شێوە شیعرییەکانی ئەو شاعیرە بەرزمان کرد و گوتمان کە مامۆستای ئەمری کورد لە پێشا لەسەر ڕێگا و شوێنی دامەزراوی وێژەی رۆژگارەکەی واتە شێوەی عەرووزی ئەڕۆیشت و چەن پارچە شیعرێکی هەرەجوانی لەو شێوەدا هەیە، بەڵام تەنانەت لە شیعرە کۆنەکانی مامۆستاشا کە بەرهەمی سەرەتای شاعیری ئەون، تەعبیر و لێکدانەوەی نوێ بەرچاو ئەکەوێ. مامۆستا گۆران هەستی

کردبوو کە بە پێی گۆڕانی ڕۆژگار و پەیدابوونی نیاز و پێتەویستی تازە لە ناو کۆمەڵەکەیا شێعری عەرووزی ناتوانێ و نابێ لەمە زۆرتر بخایەنێ و بمێنێتەوە. ئەم پێتەویستییە لە چەند لاوە هەست ئەکرا؛ یەکەم ئەمە کە ئیتر وەك پێشوو شێعر مەزەی مەی ناو کۆڕی دەسەڵاتدارانی گیرفانپڕی مێشك بەتاڵ نەبوو و تەنها بۆ لاواندنەوەی گوێچکەی پارەدار نەدەکوترا کە هەرچی بە شکڵ و ڕووالەت ڕازاوەتر بێ، باشتر بێ؛ شێعر هەروەك سەرەتای پێکهاتنی، هەروەك فەلسەفە و هۆی هەبوونی ئەیکوت و ئەیویست. دیسانەوە بوو بە چەك. چەکی تیژ و گورچك بڕ، خەوتارێن و ترسهێن، دووهەم ئەمە کە هەر لە پێشیشا شێوەی عەرووزی، خۆماڵی نەبوو، سەرچاوەی لە زانیاری کوردەوە نەدەهاتە خوارەوە و لەگەڵ تایبەتییەکانی زمانی کوردیش باش ڕێك نەدەهات، سێهەم ئەمە کە کورد لە پێشا خۆی شێوەیەکی لە شێعرا هەبوو و بە پێی پێ ئەکوترا و لە زۆر بارەوە نزیکە لە شێوەی نوێ، هەم لەبەر کورت‌ودرێژی نیوە شێعرەکان و هەم لە باری ئاهەنگەوە و شێعری کوردی بێ‌ئەوە لە تاقیکردنەوە بترسێ، ئەتوانێ شێوەیەکی نوێ بگرێتە بەر.

بە داخەوە مامۆستا لە کاتێکا گوڵستانی زەوقی ڕوو لە گەشە و پشکووتنی پتر بوو و شاگردانی هێشتا لەم سەرچاوە ڕووناکە تێراو نەبوون کە چاوی لە ژیان پۆشی و وێژە و وێژەویستانی کوردی بە داغ و مەینەتەوە بەجێ‌هێشت. بەڵام چرایەك کە مامۆستا هەڵیکردبوو پاش مەرگی ئەویش نەکوژایەوە و بەرێی پیاسەکارانی ڕێگای وێژەی نوێی ڕووناك کردەوە و شاگردانی مامۆستا لەم دیو و لەو دیو بە ڕچەی خۆش کراوی مامۆستادا ڕۆیشتن. هەندێك لە گەنجانی شوێنگری گۆران توانییان خۆیان بێن بە خاوەنی شێوەیەکی تایبەت و هەندێکی تر هەر بە لاساکردنەوە قنیاتیان کرد و نەیانتوانی ڕێگایەکی سەربەخۆ و لێکدانەوەیەکی شەخسی بدۆزنەوە؛ بەداخەوە لە گەنجانی شاعیری ئەم سەردەمە کەمتریان چەشنی مامۆستا گۆران لەناو کۆمەڵەی

کوردا ژیاون و تاڵ و سوێرییان به درێژایی ژیانێك چێشتووه و کهمیان شارهزای زانیاری کوردن، زانیاری به ههموو لك و پۆپهکییهوه. کاتێ شێرکۆ بێکهس له شوێنهواره نوێیهکهیدا باسی تفهنگ و کاروان و شوکاك و ناوزهنگی ئهکات، ئهڵێی منالێکی ئامهزرۆی سواری و غارکردنه که ههرگیز له شار دهرنهکهوتووه و باسی شوکاك و دهرۆژه ساردهکهی ئهوی له دهمی خهڵکی تر بیستووه. مهبهست ئهمه نییه که ئهم گهنجانه سهرنهکهوتوون و یا شوێنهوارهکانیان بێکهڵکه، بهڵام ئهگهر بتوانن زمانی شیعری خۆیان له زمانی خهڵکی ئاسایی نزیکتر بکهنهوه و زیاتر له لێکدانهوهی بێگانه دوور بکهونهوه و روو بکهنهوه تهعبیره تهواو کوردییهکان، باشتر سهر ئهکهون. من ناڵێم که گهنجه شاعیرهکان خزمهتیان بێنرخه، بهڵام لام وایه که شاعیر دوو راسپێری ویکرا له سهرشانه؛ یهکهمیان راسپێرییهکه که بهرامبهر به کۆمهڵ ههیهتی و ئهبێ به زمانی ئهوان بدوێ تا بتوانێ واته و مهبهستی ناو شیعرهکانی بهوان حاڵی بکا، دووههم راسپێرییهکه که سهبارهت به هونهر ههیهتی و نابێ تهواو خۆی تهسلیمی نزمییهك بکا که له قسهو باسی وتووێژیدا ههیه، چونکه ئهگهر جوانی و بهرزی هونهری له شیعرا نهبێ، قسهی شاعیر ئهبێ به ئامۆژگاری رووت یا گێڕانهوهی داستان. شاعیر له لایهکهوه ئهبێ خۆی لهگهڵ کۆمهڵ رێك بخا له لایهکی ترهوه ئهبێ له کۆمهڵ پێش کهوێ، بهڵام ئهم پێشکهوتنه نابێ چهشنێك بێ که شاعیر ئهوهنده له خهڵك و زمانی خهڵك دوور کهوێتهوه که لهبهر چاو گوم بێ و تێکهڵیشی لهگهڵ خهڵك نابێ ئهوهنده بێ که لهگهڵ ئهوان نهناسرێتهوه. ئێسته تکایه گوێ بگرن بۆ سهرهتای شوێنهوارێکی نوێی شێرکۆ بێکهس.

به هۆرهی تفهنگی کاروانی بنبنار، لووتکهکان

ئهستێرهی پشکۆیان رژانه ناوچاوی بهیانی بهفرموه

چەمەکان بەرزەوبێ هەڵسان و هەڵگیرسان

ئەسپەکان لە پێشەی ئاگرا ئاو دران

هۆرەیە وا «شوکاك» رەشەبا زین ئەکات

بە قاچی گەردەلوول، ئاوزەنگی لاقاوی باڵگرتوو... لێ ئەدات

هۆرەیە... هۆرەیە... .

ئەشکەوتی گوێی شاخی بە مسی تاریکی ئاخنراو

وا بەربوو کەوتە بەر تەوژمی رووباری خۆرەتاو

هۆرەیە وا «شوکاك» رەشەبا زین ئەکات

بە قاچی گەردەلوول... ئاوزەنگی

لاقاوی باڵگرتوو لێ ئەدات

رەگ ئەبێ چۆغەی ژان لەبەر کات

بۆ ئەوەی لەبەردا گوڵ بڕوێ

ئاو ئەبێ خۆی تاڵ کات، بۆئەوەی

پەل و پۆی تینوێتی... خۆر بگرێ!

لەم شیعرەدا کە تەواو لە سەر شێوەی نوێیە، ئاهەنگ هەیە، بەڵام وەزنی عەرووزی و قافیە بەرچاو ناکەون. کایە بە ئەلفاز و تەشبیهی تا ئەمڕۆنەکراو لە ناویا زۆرە. ئەوەندە زۆرە کە خوێنەرەوە پێش ئەوە کاکڵەکەی هەست بکا ناچارە بپەڕژێتە سەر توێکوڵەکەی! قاچی گەردەلوول، ئاوزەنگی لاقاوی باڵگرتوو، ئەشکەوتی گوێی شاخی بە مسی تاریکی ئاخنراو و زۆر تەشبیهی تر کە شیعرەکە لە بەرچاو ئەکەن بە تەلەسم و جادوو. ئەگەر کاك شێرکۆ ئەم هەموو زۆرەی بۆ خۆی لەهێنابایە باشتر ئەبوو.

تا بەرنامەی داهاتوو بە خوای گەورەتان ئەسپێرین.

# محەممەد سەدیقی مەحموودی، بە شوێن ماموستا گۆرانەوە

گۆران هەڵکەوتەی شێعری کوردی، لە عێراقا چاوی کردەوە، لەوێ ژیا، لەوێ هەڵی دا و لەوێ چاوی لە جیهان پۆشی. شێعری شێوەی نوێ ئەگەر بە گۆرانیش دەس پێ نەکرابێ، لانی‌کەم ئەوە قسەی تێدا نییە کە بەهۆی گۆرانەوە پتەو بوو، رازاوە و جێگای خۆی کردەوە. گۆران ئەوینداری راستی و رەوانی جوانی بوو؛ چ لە سروشتا و چ لە ئافرەتا. بۆیێرانە گوتی: جوانی لە خواوە بەهرەیەکە پڕ بەپێست بۆ ئافرەت و گوتی:

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاوهەرگیز

بێ ڕووناکییە بێ بزەی نازیز

خورەی قەڵپەزەی کەف چەرێنی چەم، شنەی سێبەری داری گوێز و توو، تووڵەماری ڕێیە کە دەخوشێتە ناو دارستان، گاشەبەردێ کە گەردوون تەلی پێنەداوە، کۆلکەزێڕینەی پاش بارانی زۆر، گوڵەبەڕۆژەی قژزەردی چاوکاڵ، هەمووی ئەمانە و گش جوانییەکی تری سروشت بۆ ئافرەت، هۆی لێکدانەوە و هەستی ئاینی بوون. گیانی شادبێ کە بە ساکاری و دڵپاکی لادێییەکەوە کوتی: خوای یەکەمین جوانییە لە باری ئاینەوە.

گۆران ئەوتۆ بوو، ئەویندارێ دڵ پڕ لە هەستی جوانی و ئەو خەیاڵەی وا پێی مەست بوو، باش توانی بیخاتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستی. شێعرەکانی نە ڕمبەڕمبی بێهوودەی ناسیۆنالیزمی تەواو ویشکی تیژیك بە فاشیزمی لێوە دێ، نە بێدەربەستی شێعری ئیندیویدوالیستی (Individoalism) لە کۆمەڵ تەریك‌بوونی پێوە دیارە. ئەم دوو نموونەیەم بۆیە هەڵدا کە بەداخەوە لە هەر دوو بارا تاقمی وەهامان هەن، کە یا هەر خۆیان ئەبینن، یا هەر گەلی خۆیان و لایان وایە شەڕ، شەڕی نێوان دوو ڕەگەزە، یا دوو هۆز، یا دوو گەل و تەواو لە چلۆنی چینایەتی و ئابووری دوور و....

گۆران وەها نەبوو. ئادەمیزادێکی تێگەیشتووی شاعیر بوو؛ بەڵام شێوەی لە عێراقدا پاش خۆی پەیڕەوی زۆر بۆ پەیدا نەبوو. لەبەرچی وەهابوو؟ خۆتان لێکیدەنەوە. چونکە باسێکی ترە و لێرەدا جێگای نابێتەوە.

بەداخەوەم کە ناچارم ئەوە بڵێم کە شاعیری کورد لە عێراقا نەیانتوانیوە ڕێبەر بن؛ زیاتر چاولێکەر بوون. شوێنکەوتووی کۆمەڵ بوون، بێ‌ئەوە هەوڵێك بدەن بۆ گۆڕینی بەرەوپێش‌بردن. لەبەر ئەوە شێعرەکانیان زمانزەنای بێهوودەیە و ڕمبەڕمبی ساکار. مەبەستم شاعیرانی گەنجە، نەك ئەو برایانەی رابردوو. یەکێك لەو ئیستەدادە

بەفیرۆچوووانە بە لای منەوە «هەژار»ە، کە بەڕاستی خەسارە. کەس نییە پێی بڵێ مامۆستا! خوێن، ئەویش خوێنی ئادەمیزاد، ئەویش بەم شێوە گشتییە کە تۆ کوتوووتە چۆن پیس ئەبێ؟ و ئایا گورو فیچقەی خوێن لە بان تیغی دەبان لە شێعرا هێنانەوە، خووی سادیسمی و پیاوکوژی لە گەلا هاندان، لە کاتێکا کابرا هات و گوتی: «براله، ئادەمیزاد یەکن و ئەوەی تۆ بە ڕواڵەت ئەیبینی شەڕی نێوان دوو نەتەوەیە، لە ڕاستیدا شەڕی نێوان دوو ئابووریەیە» سوودی چییە؟ لێرەدا مەبەستم رەخنەگرتن نییە و زیاتر لەسەر ئەم باسە ناڕۆم؛ بەڵام ئەمەوێ بڵێم کە شێوەی مامۆستا گۆران پاش نەمانی خۆی لە عێراقا پەرەی نەگرت و لە ئێرانا زیاتر هۆگری بۆ پەیدا بوو. یەکێك لەو پەیڕەوانەی شێعری گۆران، مامۆستایەکی گەنجە، بەناوی مامۆستا محەممەد سەددیقی مەحموودی موکریانی.

هەڵبەت ئەو مامۆستایە هێشتا نەیتوانیوە شێوەیەکی تایبەتی و سەربەخۆ بدۆزێتەوە و نە وەك قالب و دیوی دەرەوەی شێعرەکانی لە هی گۆران دەچێ، بەڵکوو هەر ناوەرۆکی شێعرەکانیشی هەمان ناوەرۆکی شێعری گۆرانە. ئەمەش شێعرەکانی مامۆستا محەممەد سەددیقی مەحموودی:

خورەی هەڵدێر، شەشاڵی شوان
کە بۆ هەڵبەست ئیلهامی خوان
چەند بە سۆزن، چەند سیحراوین
لای لایەن بۆ کۆرپەی ئەوین
دەمی بەیان شنەی شەماڵ
دڵی بێ تین دینێتە حاڵ
وەنەوشەی کز لە نێو تەما
ئەخاتە ناو کۆڕی سەما

بە پشت پشتی قامکی سروشت

وەختێ کە خۆر پرشنگی رشت

گیتی هەمووی دەشت و کێو

بزەی زنویستی دێتە لێو

بە ئاهەنگی هەوری بەهار

فرمێسکی شادی دێتە خوار

لە چاوی ئاسمانەوە

بە مژدەیی ژیانەوە

لە کێو و تەل، دەشت و چیا

لەسەر پەڕی گوڵ یا گیا

چەند نەخشینە، چەند جوان ئاونگ

کاتێ کە لێی ئەدا پرشنگ

ورشە و تریفەی مانگەشەو

لە سووچی دڵ ئەدا پەرتەو

ئەخاتە ناو ئاگری سوور

تاسە، مەیل، هەست و شعوور

ئەوانە گشت ئەدەن بە گیان

ژیان، بەڵام کامیان

وەک ئێوینیگای هی دڵداریین

ئاوا لە ناخی دڵ کاریین؟

مامۆستا گۆران ئەڵێ:

چەند بەناهەنگ، چەند سێحراوین

ئەگەرێن پۆزن یا مراوین

و کاك محەممەد سەددیق ئەڵێ: «چەند بەسۆزن، چەند سێحراوین». «وەنەوشەی خامۆش لەژێر تووترکا» هی مامۆستا «گۆران»ە، کاك سەددیقیش «وەنەوشەی کز»ی هێناوە. جگەلەمانە تەواوی شێعرەکە ناوەرۆکی هەر ئەمەیە کە مامۆستا گۆران کوتوویە:

کام تاسە، کام مەیل، کام چاوەنواری

تەماسماویە وەك هی دڵداری

من لام وایە کە ئەم شاعیرە هەوێنی شاعیرانە لە هەستیا زۆرە و چاوەڕوانی ئەکرێ بە زوویی ڕێگای تایبەتی سەربەخۆی، خۆی بدۆزێتەوە.[1]

---

١ - بۆ ئاشنایەتی پتر لەگەڵ خوالێخۆشبوو «مەلا محەممەد سەددیقی مەحموودی» (١٣١٦ـ١٣٦٥)، بڕوانە دیوانەکەی بە ناوی «وەنەوشە»، کە لە ساڵی ١٣٦٧ی هەتاویدا لە لایەن «ئینتیشاراتی سەلاحەددینی ئەیووبی»یەوە چاپکراوە.

# زاراوەکانی زمانی کوردی

سەلام لە گوێگری بەرنامەی تاپۆ. لە چەند بەرنامە لەمەوپێشەوە دەستمان کردووە بە لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆ کە هەموو لان و بارێکی ژیانی کوردەواری بگرێتەوە. ئەمڕۆ گەیشتووینە سەر زمانی کوردی. هەڵبەت سەبارەت بە زمانی کوردی لە پێشا باسێکمان لە بەرنامەی رابردووا هەبوو و لەودا بەشکردنەکەی «مەککەنزی» و «تۆفیق وەهبی»مان باس کرد و هەر وەها باسی چەن جۆرە بەشکردنی تریشمان کرد. ئەمڕۆ ئەو بەشکردنەتان بۆ باس ئەکەم کە بە لای منەوە لە هەموان باشترە، بەم چەشنە:

زاراوەی کرمانجی ژوورو یا شیمال، یەکەم. زاراوەی کرمانجی خواروو یا جنووب، دووهەم. زاراوەی گۆرانی، سێهەم. زاراوەی کرماشانی، چوارەم.

هەڵبەت لە ناو لکی ئەو زاراوە ئەسڵیانەشا جیاوازی هەیە، واتە فەرعی موکری لەگەڵ فەرعی سولەیمانیا کە هەردووکیان لکی زاراوەی کرمانجی خواروون، جیاوازە. شێوەی دووان و مەخرەجی پیتەکان و پاڵ بە پیتەکانەوەدان، واتە تەکیە لە سەر

حەرفەکان و چەشنی ئەدای پیتێکی تایبەت لە سولەیمانییا لەگەڵ مەهاباد و بەشەکانی تری موکریان جیایە. بۆنموونە، پیتی دال لە سولەیمانییا دالی کلۆرە بەتایبەت لە دوایی وشەکانەوە، ئەڵێن: سەوپەنجا. بەڵام لە موکریان بە تایبەت لە دەوروپشتی مەهاباد ئەڵێن: سەدوپەنجا. دالەکە باش دەرئەبڕن. جار جار لە سولەیمانی و دەوروپشتی سولەیمانی دال چەشنی گاف تەلەففوز ئەکرێ، بەتایبەت ئەگەر پاش دالەکە پیتی دوایی وشەیەکە، وشەیەك بێ کە پیتی یەکەمی لەگەڵ دالی کلۆرا بۆ کوتن قورس بێ، وەك ئەم شێعرەی مامۆستا گۆران: «هەرچەن ئەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم»... وەها دێتە بەرگوێ کە بڵێن: هەرچەنگەکەم!

... جیاوازی زۆرە، ئەمەش یەکێیانە کە لە سولەیمانی زۆرتر ئەو «ئەلف»انە کە لە پێش «نوون»وە هەڵکەوتوون هەر وەك خۆیان بە «ئەلف» تەلەففوز ئەکرێن، بەڵام لە موکریان بە تایبەت لە ناو عێلی دێبۆکری و مامش و پیران و مەنگوڕ و گەورکی بەشی «مەهاباد» و «ئەڵێن» ئەو «ئەلف»انە ئەکەن بە «ی»، وەك نێو. ئەم جیاوازییە واتە گۆڕانی «ئەلف» بە «ی» لەنێوان شێوەدوانی «مەهاباد» و «سنە»شا هەیە. لە «سنە» ئەڵێن: «پا»، لە «مەهاباد» ئەڵێن: «پێ». ئیلاتی دەوروبەری مەهاباد ئەڵێن: لە شاری بووم. لە جێگاکانی تر ئەڵێن: لە شار بووم. یا بۆنموونە مەهابادی ئەڵێن: «دەستم دا تفەنگێ» و سنەیی و سەقزی و سولەیمانەیی ئەڵێن: «دەستم دا تفەنگ» یا «دەسم»، لێرەدا مەبەست «ی»ی دوایی تفەنگە، نەك دەس و دەست؛ کە ئەویش خۆی جۆرێکە لە جیاوازی وەك «دەس و دەست»، «ماس و ماست»، «راس و راست»، ئەمانە هەموویان جیاوازین لە شێوەی دووانا و لە وشەشدا جیاوازی هەیە. وەك «قاچ و لاق»، «خاس و باش و چاك» و زۆر وشەی تریش. بەڵام ئەم جیاوازییە بچووکانە وەها نین کە بۆنموونە شێوەی دووانی سولەیمانی و سنەیی و مەهابادی ئەوەندە لە یەك دوور بکەنەوە کە نەکرێ بە تێکڕایان بگوترێ زاراوەی کرمانجی خواروو.

مەبەستێکی تریش کە لێرەدا ئەشێ بکوترێ ئەمەیە کە بە پێی نزیکی هەرێمی زاراوەکان لە یەکتر، جیاوازی لە نێوان لکی زاراوەکانا پەیدا ئەبێ، وەك ئەمە «مەهاباد» هاو سنوورە لەگەڵ «رمزاییە» و کوردەکانی دەوروبەری ئەو شارە، وەك: «شکاك»، «هەرکی» و نزیکە لە کوردەکانی دەوروبەری «خۆ» و «شاپوور». وەك «جەلالی» و «میلانی»یەکان. لە بەر ئەمە زۆر وشەی زاراوەی کوردی کرمانجی ژووروری لەوان وەرگرتووە، وەك ئەمە لە مەهاباد و لە ناو دانیشتووانی دەوروپشتی مەهاباد زەربولمەسەلێك هەیە، ئەڵێ: «ئەگەر زانییان ئەزم، ئەگەر نەیانزانی دزم!». لە کاتێکا ئەکوترێ کە کەسێك بۆ کارێکی خراپ چووبێ و سوود وەرگرێ لە ناسیاوی خۆی لای ئەو کەسانە کە کارە خراپەکەیان لەگەڵ ئەکرێ. ئەز لەم زەربولمەسەلەدا وشەیەکی کرمانجی ژووروروە و بە مانای «من»ە، ئەگەر زانییان ئەڵێم منم، ئەگەر نەیانزانی دزییەکەیان لێ ئەکەم. یا ئەڵێن: «رۆنیشە!» وەك «رۆنە»ی کرمانجی ژووروو. بە «سەگ» ئەڵێن «کۆك»، هەڵبەت «سپلۆت» و «سەگ» و «سە»شی پێ ئەڵێن، کە «کۆك» و «سە» لە کرمانجی ژووروو وەرگیراون. سنە لە بەر ئەمە کە لە زاراوەی گۆرانی نزیکترە وشەی ئەو زاراوەی زۆر وەرگرتووە. بۆکان و سەقز کە لە نێوان مەهاباد و سنەدا هەڵکەوتوون شێوەی دووانیان کە هەندێکی لە مەهابادی ئەکا و هەندێکی لە سنەیی ئەچێ، ئەمە بۆ زاراوەی کرمانجی ژوورووش هەر دروستە. شێوەی دووانی بارزانی کە ناوبارەترە و نزیکترە لە زاراوەی کرمانجی خواروو؛ وشەی ئەم زاراوەی زۆرتر تێدایە، بەڵام «ستراکتۆر structure» و ئەساس و پایەی زمان لە هەموو زاراوەکانا یەکە.

با بچینەوە سەر باسەکەی پێشوومان؛ کوتمان کە «کوردی» ٤ زاراوەی گەورەی هەیە، کرمانجی ژووروو، کرمانجی خواروو، گۆرانی، کرماشانی.

١ــ کرمانجی ژووروو، زاراوەی کوردەکانی تورکیە و ئەرمەنستانی

شوورەوی و کوردەکانی سووریەیە، شیمالی کوردستانی عێراق و کوردەکانی غەربی زریەی بچووکی رەزاییە و کوردەکانی قووچان و کوردەکانی دەماوەندیش بە کرمانجی ژووروو ئەدوێن.

٢ـ کرمانجی خواروو، زاراوەی کوردەکانی جنووبی کوردستانی عێراق و کوردەکانی غەرب و شیمالی غەربی ئێرانە، هەڵبەت لە غەرب، کرماشان و دەوروبەری لێ جیا ئەبێتەوە کە ئەوان خۆیان ئەکەونە سەر زاراوەیەکی تر بە ناوی کرماشانی و لە «شیمالی غەرب»یش دەوروپشتی رەزاییەی لێ جیا ئەبێتەوە کە ئەوانیش کوتمان بە زاراوەی کرمانجی ژووروو، یا شیمال قسە ئەکەن.

٣ـ کرماشانی، کە خەڵکی کرماشان و سەرپێڵ زەهاو و قەسری شیرین و ئیلات و خێڵاتی دەوروپشتی ئەو شارانە بەم زاراوە قسە ئەکەن.

٤ـ گۆرانی، ئەم زاراوە زۆر لە فارسی کۆن نزیکە و گۆرانی زۆر بە سەرا ئەهاتووە. لە بەر ئەمە هەندێ ئەڵێن کە رەنگە ئەو زاراوە کوردی نەبێ. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە و گۆرانی بێ گومان کوردیە، بەڵام کوردییەکی کۆن و نزیك لە کوردی مادی. تۆفیق وەهبی لە بەشکردنەکەی خۆیا ناوێکی لە زاراوەی گۆرانی نەبردووە و بۆمن دەرنەکەوتووە کە چۆن لێکۆڵەر و کوردناسێکی وەك وەهبی بەم بێدەربەستییە بەسەر ئەم مەبەستەدا تێپەریوە؟

زاراوەی گۆرانی بە زاراوەی «هەورامی»ش ئەناسرێ، واتە زۆر کەس لە باتی زاراوەی گۆرانی ئەڵێن زاراوەی هەورامی. لە کاتێکا هەورامی لکێکە لە گۆرانی، بەڵام لە بەر ئەمە لە ئێران و عێراقا ئەو کەسانە کە بە گۆرانی ئەدوێن، زیاتریان لکی هەورامین. ئەم ناونانە باو بووە. کەمایەتی وەك: سیامە سووری و رۆژبەیانی و زەنگەنەش هەر لە سەر هەورامی ناو ئەبرێن، هەڵبەت ئەمە لە باری زانستی زمانناسی و تەنانەت کۆمەڵناسی کوردیشەوە هەڵەیە؛ بەشێکی زۆر لە «سیامەسوور»یەکان ئێستە

لە ئەفغانســتان ئەژین و بە گۆرانی ئەدوێن.

بەرنامەی ئەم حەوتەیەمان دوایی هات و لە بەرنامەیەکی ترا ئەچینە سەر باسی وێژەی کوردی و بەشەکانی ئەو وێژەیە، تا ئەوکاتە خواتان لەگەڵ.

# سەرەتایەك لەسەر ویژەی كوردی

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ. ڕێزەوتارێكمان سەبارەت بە ژیانی كۆمەڵایەتی كورد دەس پێكردبوو و لە چەند بەرنامەیەكا باسی پێشینەی مێژوویی كورد و ئەوەی كە كەی و لە كوێوە هاتوون بۆ ئەم گۆڕەپانی ئێرانە، بە كورتی كرا. هەڵبەت پێم باشە لە پێش هەموو شتێكا بۆ چەندەمین جار دووپاتەی كەمەوە كە من لە هەرێمی مێژوودا دەسەڵاتم ئەوەندە نییە كە گومانێك بۆ گوێگری بەهەست نەمێنێتەوە لەوەدا كە ئەوەی وا ئەینووسم تەواو دروستە یا هەموو ئەو ڕاستەقینەیە كە مێژوونووسان قامكیان بۆ ڕاداشتووە و نیشانیان كردووە.

بۆباسی مێژوویی من خۆم گوێ ئەگرم بۆ نووسراوە هێژاكانی مامۆستای بەرزی كورد جەمیل ڕۆژبەیانی و لە ڕاستی لانادەم كە زۆر كەلكیان لێوەر ئەگرم. مامۆستای دڵسۆز لە مێژووی ئێرانا دەستی داوەتە لێكۆڵینەوەیەكی هەرە بە نرخ كە لە پێشا نە مێژوونووسێكی ئێرانی و نە مێژوونووسە بێگانەكان و نە تەنانەت مێژوونووسێكی

کورد بەم چەشنە زانستیە نووسراوێکیان نیە.

مامۆستا لەناو مێژووی ئێرانا گەڕاوە و هەموو ئەو ڕووداوانە کە بە چەشنێ پەیوەندی لەگەڵ کوردا هەبووبێ، کۆی کردۆتەوە و خستوویەتەوە سەر یەك. ئەم کارەی مامۆستا هەم خزمەتێکی گەورەیە بە مێژووی ئێران و هەم تێکۆشانێکی هێژایە لە پێناوی کورددا.

مامۆستا بە ڕێکخستن و کۆکردنەوە و بردنەوەسەر یەکی ئەو بنەماڵە کوردانە یا ئەو عێلە کوردانە کە چەن لاپەڕەی پڕ خەبات و کۆڵنەدانیان لە مێژووی ئێرانا پڕ کردۆتەوە، بۆ هەموومانی دەرخستووە کە هێزی کورد تا چ ڕادەیەك تەئسیری لە مێژووی ئێرانا هەبووە و چۆن بۆ پاراستنی ناو و خاکەکەی بەرامبەر بە زۆردار و داگیرکەر وەستاوە.

بنەماڵەی حەسنەویە و شوانکارە و عەیاریە ڕاپەڕین و خزمەت و کۆششیان لە مێژووی ئێرانا دیار و بەرچاوە. بەڵام کەم کەس هەبوو بزانێ ئەمانە کورد بوون و ئێستەش کەم کەس هەیە تەواو شارەزای خەبات و شۆڕشیان بێ؛ چونکە مێژوونووسەکان کە باغەی کاریان لەسەر لێکۆڵینەوەی گشتی مێژووی ئێران داناوە، بەشێکی زۆر کورتیان بۆ ئەم بنەماڵانە تەرخان کردووە.

هێژایی کاری مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی لەمەدایە کە ئەم هەموو کتێبە مێژوویيە لە ئەژمار بە دەرەی ئێرانی پشکنیوە. ئەو پەڕاوانە کە بە عەرەبیش سەبارەت بە مێژووی ئیسلام و ئێران نووسراون لە چاوی تیژبین و بیری وردی شاراوە نەبوون، تەنانەت بە کۆششێکی زاڵ و ماندوونەبوون و عیشقێکی ئەوتۆوە، کە هەر لە پیاوانی زانست ئەوەشێتەوە، پەڕاوە ئینگلیزێکانیشی خوێندۆتەوە و زۆر جار مانای وشەیەکی ئینگلیزی لە خۆم پرسیوە و بە خۆکەمزانینێکی عالمانەوە سەرەڕۆی شوێن هەموو زانستێك بووە لەم هەرێمی مێژووەدا، جا ناکامی زانست و ماندوونەبوون و ئیرادەی

مامۆستا بۆته چەند پەڕاو کە ئەکرێ لە مێژووی کورددا ناوی بنرێ: «هەنگاوی بەرزی سەرکەوتوو و کاری هێژای کەس نەکردوو.»

هیوادارم مامۆستا بتوانێ ئەم چەند پەڕاوەی لە چاپ بدا و خوێندکارە کوردەکانمان شارەزا بن کە هۆزەکەیان چ خزمەتێکی بە ئیرانی خۆشەویست کردووە. هیوادارم کۆسپی پارە و چەوتی پیتی قەڵایی چاپ، بەردی سارد و گەرمی نەخاتە سەر ڕێگا و من بە ناوی شاگردێکی مامۆستا هەر ئەزام لە دەمی دێ و سپاس.

پاش ئەم باسە کە پێویست بوو بکرێ، ئەگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆم. لە لێکۆڵینەوەکەماندا گەیشتینە سەر باسی ئەدەبی کوردی. بیوورن کە من جار جار ناچارم چەند هەنگاوێك لا بدەم و باسێکی ناپۆرەنوێن بهێنمە گۆڕێ. بێگومان ئەم باسە بە ڕواڵەت ناپۆرانە بۆ ڕوونکردنەوەی دەور و بەری باسەکەمان بەکەڵکن.

وێژە هەروەك ئەزانن باسێکی عەدەدی و ڕیازی نییە و دابڕاوی و نەگۆڕی و قەتعییەتی زانست لە هونەرا بەرچاو ناکەوێ و ڕەنگە لە هیچ لکێکی زانستی مرۆڤایەتی، واتە علوومی ئینسانی وەك فەلسەفە و سۆسیۆلۆژی (سایکۆلۆجی ـ سایکۆلۆژی)ش دا حەتمییەتی زانست نەبێ. هونەر ڕاستە لە ئەشیا و حاڵات و ئەفسانیات و هەروەها لە باری بەرچاوی کۆمەڵایەتی کەڵك وەرئەگرێ و توێشە هەڵئەگرێ، بەڵام کاتێ ئەم شتانە بەرانە بەر دەستی زەمیری فەننان و دەروونی ئینسانەوە، ئەگۆڕێن و بە چەشنێکی تر دێنەوە دەرەوە و خۆیان ئەنوێنن. بۆ نموونە چیای «بێستوون» وەك بەرچاو ئەکەوێ ئەچێتە ناو بیر و زەینی شاعیرەوە، شاعیریش بۆ ڕوانین هەروەك خەڵکی تر دوو چاوی هەیە، بەڵام لە دەروونی شاعیرا «بێستوون» تەنیا چیایەکی بەرز و بەردەڵان نییە؛ تەنانەت شاعیرێك لە بەرامبەر ڕوانگەی بێستوونا وەك مێژوونووسێکیش بیر ناکاتەوە و ناچێتەوە سەر ڕووداوە مێژووییەکان کە ئەمە بەردەنووسی «هەخامەنشی»یە یا «ساسانی»، بەڵکوو بیر لە دڵی سووتاو و لەشی لە

خوێن هەڵکشاوی «فەرهاد» ئەکاتەوە. دەنگی تەشوێ و کوڵینگی «فەرهاد» لەوپەڕی سنووری ئەفسانەوە، لە چیای دەروونی شاعیرا دەنگ ئەداتەوە. شاعیر وەها لەگەڵ «بیستوون» و «فەرهاد» و ئەفسانەی «شیرین» تێکەڵ ئەبێ کە خۆی ئەبێ بە «فەرهاد»، پێنووسەکەی ئەبێ بە کوڵینگی «فەرهاد» و دەروونی پڕ دەنگ و جۆش و خرۆشی ئەبێ بە چیای «بیستوون» و شیرەی هەستی ئەبێ بە شێعرێك گەلێك روونتر لەو کانیاوە کە لەشی «شیرین»ی ئەگرتە باوەش و گەلێ سپیتر لەو جۆگە شیرەی کە لە چیای «بیستوون»ەوە تا ناو گۆلی کۆشکی «خوسرەو»، بە جادووی هونەری «فەرهاد»ی ئەندازیار سەرەولێژ ئەهاتە خوارەوە! سەبارەت بە «شیرین» و «فەرهاد» گەلێك هەڵبەستەی جوان نووسراوە، بەڵام هەموو باسی دڵداری و دەرد و پەژارەی «فەرهاد» و «شیرین»ە، وەك ئەمەو لە بیر چووبێتەوە کە رووداوە مێژوویەکە و بەردەنووسەکان شتێکی تر ئەڵێن و کاتی نووسرانی ئەو تاشەبەردانە ئەبەنەوە بۆ زۆر بەر لە کاتی خوسرەو پەرویزی ساسانی.

بەم چەشنە هەم من بە ناوی نووسەری بەرنامەیەکی وێژەیی، بەتایبەت ئەمجارە کە باسەکەمان سەبارەت بە وێژەی کوردە و هەم ئێوە بە ناوی گوێگری پسپۆڕی ئەم بەرنامەیە مافمان هەیە هەرکام جۆرێك بیر بکەینەوە؛ چونکە دوو و دوو نییە کە بکا چوار. باسی هونەر و وێژەیە و زیاتری لەسەر لێکدانەوەی شەخسی و تاکییە. هەڵبەت باشە ئەمەشمان لەبیر بێ کە تەنانەت لە هونەریشا ئەسڵێك و مەنتقێك هەیە و هونەرمەندیش ناچارە لەبەرچاویان گرێ، جا ئەگەر ئەوەی من ئەیڵێم بە لاتانەوە دروست نەبوو و بیرێکی ترتان هەبوو، قەیدی نییە هونەر وەك ئاو وایە، لە هەر دەفر و کاسەیەکا شکڵ و قالبێ ئەگرێ

لە وێژەی کوردیا چوار فۆرم و قالبی جیاوازمان هەیە:

١ ـ شێعری وتاری یا بەیت ٢ ـ شێعری هیجایی ٣ ـ شێعری عەرووزی ٤ ـ

شیعری نوێ

لە ئەدەبی ئەسر واتە وێژەی پەخشان باس ناکەم، لەبەر ئەمە کە چەشنی تایبەتی ژیانی کوردەواری کە تا ساڵەکانی دوایی سەدەی حەڤدە دەوارنشینی بوو زۆرتر لەگەڵ وێژەی هەڵبەستدا ئەهاتەوە، هەڵبەت ئەمە لە زۆرتری وڵاتە خۆرهەڵاتییەکانا بەرچاو ئەکەوێ و وێژەی شیعری هەم زووتر دەس پێکراوە و هەم لە باری زۆر و کەمیەوە لە پەخشان زۆرترە. وێژەی هەڵبەستە و هۆنراوە لەبەر ئەمە کە رەوان و لەسەر زمان سووکە، باشتر لەبەر ئەکرێ و لە سینەی بەیت بێژانی کوردا باشتر ئەتوانێ هەڵبگیرێ و لەگەڵ گەرمێن و کوێستانی خێڵ بڕوا. لەو کاتەدا کە ئێمە قسەی لەسەر ئەکەین و مەبەستمانە، ئاوایی تەنیا بە ناوی خێڵ بەزێکی کورتی زستانانە کەڵکی لێ وەرئەگیرا و پاش خێڵ خێزی سەرەتای بەهار ئاوایی ئیتر ئاوەدان نەبوو و چەن ماڵێك کە پێیان ئەکوتن پاش ماڵەی خێڵ لە ئاواییا، ئەمانەوە. ژیانی ئابووری کوردەواری لەسەر بناغەی ئاژەڵداری دامەزرابوو و کۆمەڵی ئاژەڵداری کورد لەبەر هات و چۆی هەمیشەیی لە گەرمێنەوە بۆ کوێستان و گەڕانەوەی لە کوێستانەوە بۆ گەرمێن، دەرفەتی خوێندەواربوونی کەم بوو، چونکە خوێندەوار بوون پێویستی بە قوتابخانە دروستکردن و نیشتەجێ بوون هەبوو و ئەمە کاری کۆمەڵی ئاژەڵدار نەبوو، لەبەر ئەمە ئەدەبی نووسراوە نەیتوانی پەرە بگرێ. شیعر ئەکرا بە یاد بسپێررێ و لەبەر کرێ، بەڵام ئەسر نەدەکرا. بەم چەشنە وێژەی وتاری کە هەر باشترە بڵێین شیعری وتاری لە کوردیا پەیدا بوو.

لە بەرنامەیەکی ترا لەسەر ئەم باسە ئەڕۆین، خواتان لەگەڵ.

# بەیت تەواو بە تانوپۆی خۆماڵی چندراوە

سەلام لە گوێگری بەرێزی بەرنامەی تاپۆ. لە بەرنامەی پێشوودا گوتمان کە شێوە وێژەییەکانی شێعری کوردی بریتین لە چوار شێوە: «شێوەی شێعری وتاری» یا «بەیتی»، «شێعری هیجایی»، «شێعری عەرووزی» و «شێعری نوێ». هەروەها لە وتاری پێشوودا باسمان کرد کە لەبەرچی شێعر بەر لە ئەسر لە ناو کوردا و رەنگە لە هەموو خۆرهەڵاتیشدا پەیدا بووە.

«شێعری وتاری» یا «بەیت» بە لای منەوە گەنجێکی هێژا و سامانێکی گەورەی زەوق و چێشکەی هۆزەکەمانە. هەر لەبەر ئەمەیە کە «باسیل نیکیتین» و «خاچاتوور ئەبوویان» شاعیری ئەرمەنی ئەڵێن: «فۆلکلۆری کوردی ئەوەندە پڕو بەرز و خێروەندە کە هۆزەکانی تری هاوسێی کوردیش کەڵکیان لێوەرگرتووە و کەوتوونەتە ژێر تەئسیریەوە.»

ئەم کوردناسانە راست ئەکەن؛ بۆ نموونە بەیتی «خەج و سیامەند» کە

«هۆهانس شیراز»، شاعیری ئەرمەنی کردوویە بە شێعر، تەنانەت ئەوەندە ناوەرۆکی بەیتەکەی بە خۆماڵی زانیوە کە سیامەندی کردووە بە ئەرمەنی و بەم چەشنە بەهرەیەکی لە فۆلکلۆری کوردی کردووە بە نسیبی هۆزی ئەرمەنی.

بەیتی «مەم و زین» لەگەڵ ئەوەشا کە بە چەند رەوایەتی جۆربەجۆر کوتراوە و بەشێکی زۆری لە ئەفسانە و ئوستوورە تێکەڵ کراوە، لە لایەك «مەم»ی «نالان»ە و لە لایەکی تر «مەم» کوڕی میرە و تەنانەت ناوی «حەڵەب» و «برایمپاشا»ش کە روون نیە چۆن هاتوونەتەوە ناو بەیتێکی کوردییەوە، لە بەیتەکە دابڕاوە. بەڵێ پاش ئەو هەموو گۆڕانە و لەگەڵ ئەم گشت گێڕانەوە لە یەك دوورانەش کاتێ «ئەحمەدی خانی» ئەمر بەیتەکەی کردووە بە شێوەی عەرووزی، لە شێرەی گیان و زەوقی خۆی زۆر مەبەستی خوانانسانە و فەلسەفی هەڵرشتۆتە ناو بەیتەکەوە؛ بەڵام ناکامی کارەکەی «خانی» بەهۆی پێتووسی جادووکار و بیری شاعیرانەی خۆی و ناوەرۆکی تێر و تەیاری بەیتەکەوە، بۆتە شاکارێك کە وێژەناسێکی گەورەی شووڕەوی لە بەرزیدا ئەیخاتە پاڵ «شانامەی فیردەوسی»یەوە و بە یەکێك لە سێ شوێنەواری گەورەی خۆرهەڵاتی ناو ئەبا.

شێعری بەیتی زۆرتر باسی رووداوە مێژوویییەکانی ناو کورد ئەکا و یا خۆی بەو مەبەستانە خەریك ئەکا کە لە ناو کوردا جێی رێز و خۆشەویستین، وەك بەیتی «دمدم»، بەیتی «قەر و گوڵەزەر»، بەیتی «شێخی سەنعان» ــ کە ئەم بەیتە مەبەستی غەیرە کوردیشی تێدایە ــ بەیتی «زەمبیلفرۆش» ــ کە زۆر لە سەرگوزەشتی «بوودا» ئەچێ ــ بەیتی «ئاورەحمانپاشا»، بەیتی «شێر و کەڵ»، بەیتی «مەحمەڵ و برایمی دەشتیان» و زۆر بەیتی تر.

لە بەیتی کوردیدا شوێنی زانستی بێگانە و دروشمی لاوەیی بەرچاو ناکەوێ و سووژە و ناوەرۆکەکان تەواو کوردین، لەبەرئەمە بەیت بەناوی فۆلکلۆر باسکراوە و بە داخەوە بێ ئەوەی بەستانە بە سەر ئەم راستەقینەدا تێپەڕیون کە بەیت شێوەی تایبەتی

کاتێکی دابراو و دیاریکراوی ژیانی کوردە؛ شێوەی ژیانی ئاژەڵداری تا ئەگاتە پەیدابوونی ئەمیران و بنەماڵە ئەشرافە کوردەکان. بەڵام وەك ئەزانین بەیت هەرگیز باسی ژیانی شارنشینی کورد ناکا و لەهیچ کام لە بەیتەکاندا ئێمە تووشی باسێکی ئەوتۆ نایین کە تەرخان کرابێ بۆ دەربارە بچووکەکانی ئەمیرانی کورد، وەك «بەدرخانی» و «ئەردەڵانی» و «بابانی».

بەیتی «لەشکری» و بەیتی «ئاورەحمانپاشا» هی کاتێکە کە کورد ئەمیری گەورەی لێ هەڵکەوتووە و ئەم ئەمیرانە تێکەڵێ لەگەڵ رامیاری و سیاسەتی ئێران و عوسمانی و ئیمپراتۆرانی رووس. بەڵام بەیتبێژ کاری ئەوە نییە کە ئەم پێوەندە وردەسیاسییانە لێکبداتەوە و هەر لەسەر پێوشرێنەکەی خۆی ئەڕوا و بە گەز و ڕبەکەی خۆی ئەیپێوێ. «لەشکری» بۆیە خراپە، چونکە لەگەڵ گەورەی خۆی خراپ جووڵاوەتەوە، نەك لەبەر ئەمە کە لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانی سازاوە و «ینی‌چەری» و سوڵتانی عوسمانیش بۆیە خراپن و بۆیە لە بەیتەکەدا بەناوی «بڵحە رۆمی» ناو براون، چونکە میرێکی کوردیان بە جامێك ژاراو بێ‌گیان کردووە، نەك لەبەر ئەمە کە هێرشیان هێناوەتە سەر کورد و هەبوونی نەتەوایەتییان لە ناو بردووە.

ئەمە باسی ناوەرۆکی بەیت بوو؛ هەڵبەت زۆر بەکورتی، چونکە لە سەرەتای نووسینی بەرنامەی تاپۆو بوومەلێڵدا، بە درێژە لەسەر ئەم باسە چووین و ئێستە مەبەست لە دووپاتەکردنەوەی تەنیا ئەمەیە کە کورتەیەك لە وتارەکانی پێشوو کە نزیکەی پێنج ساڵ بە سەریاندا تێپەڕیوە بێتەوە یادی گوێگرە بەڕێزەکانمان، بەڵام رواڵەت و قالبی کەلامی بەیت بزانین چۆنە؟

بەیت هەروەك لە ناوەرۆکا تەواو کوردییە، لە قالبیشا وەهایە. لە بەیتا کورت‌ودرێژی میسراع یا رازاندنەوەی رواڵەتی وتار بە چەشنێ کە لە شێوەی عەرووزیا هەیە، لەبەرچاو نییە و بە گرنگ دانانرێ. لە بەیتا مووسیقای کەلام و

ئاهەنگی وشە گرنگە و بەس. تێکەڵی و پەیوەندی بەیت لەگەڵ مووسیقا تا رادەیەکە کە هەر بەیتێ بە ئاهەنگێکی تایبەتی مووسیقا لێدەدرێ، تەنانەت ئەگەر وشە و وتاریش نەبێ، شمشاڵژەنێکی کورد نە توانێ بەیتێك لێبدا و گوێگر خێرا بزانێ کە خەریکی لێدانی کام بەیتە.

گوێگری بەرێز باشە ئەمە بزانێ کە لەم بەرنامەدا ئێمە باسی ژیانی کوردەواری ئەکەین، ژیانی گشتی کوردەواری و کارمان بەسەر ئەمە نەداوە کە شاعیرێك و یا زانا و نووسەرێکی بە ئەتەوە کورد، بە عەرەبی و یا زمانێکی تر چی نووسیوە. نووسین بە چەشنێ کە هەموو لایەك بگرێتەوە و لە هەموێلی گش کەسێکا بێ، لە جامیعەی ئاژەڵداری کوردا نەبوو. لەبەرئەمە وێژەی ئەسر نووسینیش تا کاتێ کە ژیانی شارسانی کورد دامەزرا و سێلاوی خێڵات لە هات‌وچۆی گەرمێن و کوێستان دامرکا پەرەی نەگرت.

ئەڵێن بەڵگەیەك دۆزراوەتەوە کە بە زمانی کوردی نزیك بە بەشی گۆرانی نووسراوە و لەو نووسراوەدا سکاڵا کراوە لە هێرشی عەرەب و کوژانەوەی ئاورگا و تاڵانی ئاواییەکانی کورد؛ هەڵبەت بۆزانینی ئەم مەبەستە کە ئەم پارچە، یا ئەو پێستە وا شێعرەکانی لەسەر نووسراوە هی کام دەورەیە، ئەمڕۆ کەرەسەی باش هەیە و زوو ئەکرێ بزانرێ کە پارچەکە هی هەزاروچەند سەد ساڵ لێترەو بەرە، یان تازەیە و دەستی کابرایەکی هەڵپەرەست بۆناو و پارە کۆنی کردووە و بەناوی بەڵگەیەك بۆمێژینەی وێژەی کوردی خستوویەتە روو. هەرچی بێ کۆن یا تازە، ئەگەرچی لە بارەی وێژەییەوە لە کۆن ناچێ و دیارە لەسەر شێوەی هیجاییە، شێوەیەك کە تەنانەت ئەو کاتە لە ناو فارسە پێشینەدارەکانیشا نەبوو، بەڵام هەروەك گوتم کۆن و تازەبوونی ئەم نووسراوە رێگای لێکۆڵینەوەکەی ئێمە ناگرێ و نابێتە مایەی ئەم بیرە کە لامان وابێ شێوەی هیجایی بەر لە شێوەی بەیتی لەناو کوردەواریدا هەبووە. ئێمە زۆر زانا و مەلا و نووسەر و

مێژوونووسی گەورەی کورد ئەناسین کە لە زانستی ئیسلامیا هەڵکەوتوو بوون، بەڵام ئەو کەسانە لەگەڵ لەوەشا جێگای رێزن، نایەنە ناو باسەکەی ئێمەوە، چونکە بەکوردی شوێنەواریان نییە و ئاساریان سەرچاوەی لە ژیانی کوردەوارییەوە نەگرتووە.

تا حەوتەی داهاتوو کە دیسانەوە پێکەوە دەچینەوە سەر ئەم باسە، بەخواتان ئەسپێرین.

# بەیت، بانگەوازی بلاوێنی ژێر دەوار

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرستی بەرنامەی تاپۆ. لە بەرنامەی پێشوودا گەیشتینە ئەم جێگایە کە بەیت یەکەمین و بێ تێکەڵاوترین شێوەی وێژەیی کوردییە. شێوەی هیجایی بە تایبەت پەنجی هیجایی کە لەگەڵ باری زمانی کوردیدا باشتر ئەگونجێ، لە شێوەی کوردیدا پێشینەیەکی لە مێژینەی هەیە، تەنانەت لە بەیتیشدا زۆرجار تووشی شێوەی پەنجی هیجایی ئەبین؛ بەڵام شێوەی هیجایی بە چەشنێکی سەربەخۆ پاش شێوەی بەیت هاتۆتە ناو وێژەی کوردییەوە. وەك لە بەرنامەی پێشوودا باسمان کرد، ئەڵێن کە دەستە شێعرێك لە سەر پێستی ئاسك نوسراوەتەوە، دۆزراوەتەوە. شێعرەکە باسی هێرشی عەرەب ئەکا بۆ سەر خاکی کوردستان و خاپوورکرانی ئاوایییەکانی کوردستان و کوژانەوەی ئاورگاکان؛ لام وایە کە ژیانی کوردەواری لەو کاتەدا نەگەیشتۆتە ئابووری زەوی‌کێڵگە و ئاواییش بەو چەشنە کە لە شێعرەکەدا باس کراوە زۆر نەبووە. ژیانی کوردەواری لەو کاتەدا ژیانی ژێر دەوار و

رەشماڵ بووە و ئیلاتی کورد لە هاتوچۆی گەرمێن و کوێستانا بوون؛ هەر لە بەر ئەمەش بووە کە لەشکری ئیسلام بە زۆری نەیتوانیوە بە سەریانا زاڵ بێ و شێوەی ژیانیان و بڕوای ئایینی ئەوان بگۆڕێ کە میهرپەرستی یا میترائیسم بووە و یا ئەگەر زۆر پێشکەوتووتر بووبێ، گەیشتۆتە یەزدانپەرستی و ئایینی زەردەشتی. کۆمەڵی کوردەواری ئەوکاتە لە سەر ژیانی ئاژەڵداری دامەزراوە و لە ژیانی ئاژەڵداریا ناکرێ نووسراوەی شێعری بەم هەستە کۆمەڵایەتییەوە هەبووبێ.

خاوەنی تاریخی گوزیدە نزیکەی حەوسەد ساڵ لەمەوبەر باسێکی ئەوتۆ ئەگێڕێتەوە و هێرشی عەرەب و رووخاندنی ئاورگا و کوشتاری ئێرانییەکان باس ئەکا.

با بێینەوە سەر هەڵبەستی سەر پێستەکە. مامۆستا عەلائەددین سەججادی، حوسێن حوزنی موکریانی و چەند کەسی تر باسی ئەو بەڵگە شێعرەیە ئەکەن، بەڵام هیچ کامیان ناڵێن کە خۆیان ئەو نووسراوەیان بە چاوی خۆیان دیوە؛ ئەوانیش هەر بە گوایە و ئەڵێن ئیشەکە ئەبڕنەوە و هێشتا کەس نەیپرسیوە ئەی کوا ئەم بەڵگە هێژایە لە کوێیە و بە دەست کام کەسەوەیە.

حوسێن حوزنی ئەڵێ: «بازیل نیکیتین لە پەڕاوە بە نرخەکەیا کە ناوی «کوردەکان»ە باسی ئەم بەڵگەیەی کردووە.» من بە تەواوی بە تەرجەمە ئینگلیسییەکەی ئەم پەڕاوەیەدا گەڕام، باسێکی ئەوتۆم بەر چاو نەکەوت. بێگومان ئەگەر وێژەی کوردی لە سەدەکانی سەرەتای ئیسلاما گەیشتبایەتە ئەم پلە و پایەیە، تەنیا شوێنەوارێکی سێ چوار دێڕی لێ بەجێ نەدەما و ئەبوو ئێمە ئەمڕۆ زۆر پێستە ئاسکی وەهامان بەدەستەوە بوایە کە شێعری کوردی لە سەر نووسرابێ. نووسینی شەجەرەنامەی بێ بایەخ بۆ کورد نایگەیەنێتە هیچ کوێ و زۆرتر ئەبێتە هۆی سەرلێشێوانی ئەو کەسانە کە لێکدانەوەیەکی زانستییان بۆ هەموو رووداو و واقعەیەکی کۆمەڵایەتی هەیە.

بە کورتی بیرمەوە، لەم ریزە وتارەدا نامانەوێ ئەمە بچەسپێنین کە کورد لە

زانستی ئیسلامیا خاوەنی چ پلە و پایەیەك بووە و یا گوێ نادەینە باسێکی درۆ یا راستی وەك دۆزرانەوەی بەڵگەیەکی مێژوویی تاق و تەنیا بۆ ویژەی کوردی. باسی ئێمە لە سەر ژیانی گشتی خەڵکە، نەك هەڵکەوتوو و بلیمەتی وەها کە لە رادەی زانستی گەلەکەیان بەرزتر بوونەتەوە. لێمە ئەمانەوێ باسی ئەو هونەرە بکەین یا ئەو رووداوە و ئەو بارە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە بخەینە بەرچاو کە بە چەشنێ تەئسیریان هەبووە لە ژیانی گشتی کوردەوارییا و تایبەتی کۆمەڵی کوردن.

بەیت بانگەوازی بە تەوژمی ژیانی کۆمەڵی ژێر دەواری کوردە. بەیت لایەنگری ژیانی ئازاد و خوێنەبەستنەوەیە بە کشت و کاڵەوە. بەیت نەوای تێکەڵایەتی لەگەڵ سروشت و تەبیعەتی رازاوەی کوردستانە. هەروەك لە بەیتی «شێر و کەڵ»دا بەرچاو ئەکەوێ. لەو بەیتەدا بەیتوێژ بە ئاشکرا لایەنگری خۆی لە شێر ــ کە نموونە و مەزهەری ژیانی ئازادە ــ دەرئەبڕێ و بە سەر «کەڵا» ــ کە ئەویش بە نۆبەی خۆی مەزهەرێکە لە ژیانی نیشتەجێیی و ئابووری کشت و کاڵ ــ زاڵی ئەکا.

هەڵبەت ئەبێ ئەمە بزانین کە گۆڕانی ژیان لە ئاژەڵداریەوە بۆ کشتوکاڵ لە تەواوی هەرێمەکانی کوردستاندا بە رۆژ و سەعات و سەردەمێکی دابڕاو دیاریکراو دەستی پێنەکردووە. ئێمە تەنانەت ناتوانین سەدەیەکی تایبەت هەڵبدەین و بڵێین لەو سەدەیەدا ژیانی ژێر خێوەت و دەوار، ژیانی گەرمێن و کوێستان چوونی خێڵات گۆڕاوە بە ژیانی ناو ئاوایی و خێڵات لە کۆڵ کەوتن و نیشتە بوون. لە بەر ئەمە ناشتوانین هونەری تایبەتی ئەو دوو چەشنە ژیانەش لە پەرژینی سەدەیەکی تایبەتا دامەزرێنین و هەر لە بەر ئەمەیە کە ئێمە لە ژیانی کۆمەڵی ئاژەڵداری کوردا ئەبینین کە شێعری عەرووزی هەیە و هی سەرای ئەمیرە کوردەکانە و هەروەها ئەشبینین کە لە ژیانی کشتوکاڵی کوردەوارییا بەیت ئەگوترێ. بەڵام نە شێعری عەرووزی ئەو کاتە و نە بەیتی سەردەمی ئابووری کشتوکاڵ، ئەو هێز و توانایەیان نییە کە ئەبێ بیانبێ. لە

راستیـیا شیعری عەرووزی سەرای ئەمیرە کوردەکان چەشنێك بەپیرەوەچوون و ئیستیقباله لە گۆرانێك کە چینی تێر و تەسەلی ئەوکاتە بە پێویستی ئەزانێ. واتە شێعری عەرووزی بێ ئەوە بتوانێ لە ناوی هەوای کۆمەڵا بژی و لە ناو باغچەی هەناوی گشتیا بڕوێ لە کۆشکی ئەمیران و لە گوڵدانی سەر هێلای خانووبەرەی چەن قاتی ئەوانا ئەپشکوێ. بێگومان ئەو گوڵە دەستێژە لەو گوڵدانە تەنگەدا ناتوانێ بە خۆیا بێ و چرۆ دەر بکا و بۆنی خۆشی بە هەموو لایەکا بڵاو کاتەوە.

بەپێـیژی لە سەردەمی زەوی کێڵگەشدا خاوەنی بارێکی ئەوتۆیە و ئەویش ناتوانێ بەهێز و پەرەگر و پتەو بێ، چونکە ئیتر لەو سەردەمەدا بەیت نیازی گشتی کۆمەڵی ئیشتەجێ نیە و چینی خوارەوە بە بەیتگوتن لە راستیا ئەیەوێ بگەرێتەوە بۆ سەردەمی پێشوو؛ یا لانی کەم، یادی سەردەمی پێشوو کە بەرەنگاری چینەکان هێندە زۆر نەبوو لە دەروونیا زیندوو کاتەوە.

بەم چەشنە شێعری عەرووزی سەردەمی ئاژەڵداری ئەبێ بە لایلایی بۆ کۆرپەیەك کە هێشتا لە دایك نەبووە و شێعری بەیتی کاتی ئابووری کشتوکاڵ ئەبێتە گریان بە سەر مردوویەکا کە ئیتر زیندوو نابێتەوە.

دیسانەوە باسەکەمان درێژەی ئەبێ و لە بەرنامەیەکی ترا کە پێکەوە کۆ ئەبینەوە، لە سەر لێکدانەوەکەمان ئەڕۆین. تا ئەو کاتە خواتان لەگەڵ.

# وەزنی «عەرووزی» و وەزنی «بەیتی»

سەلام لە گوێگری هۆگری هونەر.

زۆرجار ئەم پرسیارەمان لێکراوە کە بۆچ لە بەرنامەکەماندا هەڵوێستێکی دژانە ئەگرین بەرامبەر بە شێوەی عەرووزی؟

هەندێ لە گوێگرە بەڕێزەکانمان لە ڕەخنەگرتنەکەیاندا شاعیرانی بەرزی کوردیان بە نموونە هێناوەتەوە و نووسیویانە کە «نالی» و «خانی» و «بێکەس» و «پیرەمێرد» و «وەفایی» بەم شێوەیە شێعریان گوتووە و دژبوونی ئێمە لەگەڵ شێوەی عەرووزی واتە دژبوونمان لەگەڵ بەشی هەرەبەرز و بەهرە و بەری داری وێژەی کوردی، جگەلەمانەش هەندێك لە ڕەخنەگرانی تووڕەمان نووسیویانە کە بۆچ ئێمە لامان وایە شێعری کوردی ئەبێ بگەڕێتەوە سەر شێوەی بەیتی کە شێوەیەکی سەرەتاییە و ناتوانێ واتەی قووڵی شاعیرانە لە خۆیا جێبکاتەوە؟ ئێمە پاش مووسیقایەکی کورت وەڵامی ئەم ڕەخنە و پرسیارانە بەوردی ئەدەینەوە.

پێش هەموو شت ئەبێ بڵێم کە ئەگەر چەوتی و هەڵەیەك لە بڕواکەمانا سەبارەت بە شێعر و لێکدانەوەی هونەری هەیە، هەر خۆمان ئەگرێتەوە و کاری بەسەر بیروباوەڕی هەموو نووسەرێکی کوردییەوە نییە.

عەرزتان ئەکەین کە ئێمە بە هیچ بارێ دژی شێوەی عەرووزی نین، تەنیا ئەوە ئەبێ کە تایبەتییەکانی ئەو شێوەیە و چەشنی پەیدابوونی لە وێژەی کوردییا باس ئەکەین و ئەڵێین کە شێوەی عەرووزی لە پێشا نەبوو و کاتێ هاتە ناو وێژەی کوردییەوە کە زیاتر لە هەزار ساڵ بوو لە وێژەی هاوسێکانی کوردا جێگیر ببوو. لەراستییا داوخواز و نیازی کۆمەڵ نەبوو کە ئەو وێژەیەی کرد بە باو، بەڵکوو پێتەویستی کەمایەتییەکی ئەشراف و ئاریستۆکرات وەك دەرەبەگی زل و چینەکانی تری حەساوە و تێر و تەسەل بوو کە نیازی بە وێژەیەکی دوور لە تێگەیشتنی چەوساوەکان بوو بۆ خەڵەتاندنیان و گێژکردنیان. ئەمە ئیتر وەك رۆژ روونا کە «بەیت» هی خەڵك بوو و خەڵك لێی تێئەگەیشت؛ بە گوێ‌لێبوونی ئەگریا یا پێئەکەنی، یا هانئەدرا و ئەبزووت؛ لەکاتێکا کە بە شێعری مینیاتۆری و پرپێچ‌وقەمچ و رازاوەی عەرووزی کە باسی واتەیەکی بەرزتر لە وزەی دەسکورتی فامی ئەوانی ئەکرد هەر تەقەی سەریان ئەهات و زاریان تاك ئەبوو وەك وێردێکی جادووکارانە بیستن. شاعیری عەرووزی ئەیگوت:

بۆ لە سەر چەشمەیی چەشمم نەچکێ قەترەیی خوێن

وشەکان هەموو فارسین، جگە لە «بۆ» و «لە» کە دوو «قەید»ی بچووکن، لەکاتێکا ئەکرا بڵێ «بۆ لە سەر چاوەیی چاوم نەتکێ تکەیێ خوێن».

رەنگە گوێگرانی بەرێز ئەمەیان بەدڵا بێت کە قۆناخی شێوەی عەرووزی جیا بوو و کات پێتەویستی بەمە بوو کە تێکەڵییەکی زۆرتری وێژەیی هەبێ لەنێوان ئەدەبی گەلانی دراوسێدا و نموونەیان ئەمە بێ کە وێژەی فارسی بە وەرگرتنی عەرووز لە عەرەب زیانێکی تووش نەهاتووە، بەڵکوو دەوڵەمەندتر و بەرینتر و شکۆدارتر بووە؛

بەڵێ دروستە، بەڵام وێژەی فارسی، «بەیت»ی نەبووە... و کاتێ عەرووز هاتووە وێژەی فارسی دەسکورت و سەرەتایی بووە، جگەلەمەش هەزارساڵ لە وێژەی فارسییا کار لە سەر عەرووز کراوە، «وەزن» و «بەحر»ی تازە و گونجاو لەگەڵ چۆنیەتی زمانی فارسیا دروستکراوە.

ئەگەر سەیری وێژەی شێوەی «خوراسانی» بکەین، بەتایبەت لە شوێنەواری شاعیرانی پێشووی ئەو سەبکەدا زۆرجار چاومان بە لەنگولۆری و خێچوخواری ئەکەوێ و دەرئەکەوێ کە لە خۆڕایی نەبووە ئەم نیوە شێعرە لە فارسیا بۆتە نەزیلە و کەوتۆتە سەر زاری خەڵك. شاعیران ناچار بوون سەروگوێی وشە بشکێنن و لە قالبی داڕژراوی عەرووزا جێگای بکەنەوە. لەبەرئەمەیە کە ئەڵێن «در تنگنای قافیه خورشید خر شود»؛ ئەگونجێ ئەمەش کە ئەڵێن «یجوزُ للشّاعِرِ مالا یجوزُ لِغَیْرِهِ» هەر لەبەر ناچاربوونی شاعیر بێ لە پەیڕەوی‌کردنی عەرووز؛ کە وەها بوو کورد بۆچ وێژەی خۆی بخاتە چوارچێوەیەکی داتاشراوی دەستی گەلێکی ترەوە، کە زۆر تەسك و تەنگ و بڕستبڕە. ئایا کەس هەیە کەمەری وەك موو و بەژنی وەك چنار و چاوی وەك ئەستێرە و برژانگی وەك شیر و بڕۆی وەك کەوان و زولفی وەك زرێی پێ جوان بێ؟ ئاخۆ ئەگەر ئافرەتێك بەم شکڵ و سەر و سیمایەوە بێتە خەونی کەسێك لێی ناترسێ؟ بەڵێ کاتێ عەرەب و فارس ئەم تەشبیهانەیان کردووە کە ئەم چەشنە چەکانە لە شەڕا کەڵکیان لێوەرگیراوە و لە ژیانی کۆمەڵا تەئسیریان هەبووە، لە کاتێکا بۆ کورد ئەم باسە نیيە؛ کورد کاتێ شێعری عەرووزی وەرگرتووە کە زرێ و شیر و تیر و کەوان تەنیا لە مووزە و هەنتێکەخانەکاندا ماونەتەوە. بەم‌چەشنە وێژەی کوردی بە چاوێکی بەستراوەوە بۆ ماوەیەك کەوتۆتە شوێن تەقلید و لاسایی‌کردنەوە و سەربەخۆیی خۆی لەدەست داوە. جا ئەمە لەبەرچی؟ بێگومان هەر لەبەر ئەمە کە چەك بێ بۆ چینی دەرەبەگ و چینە

بەدەسەڵاتەکانی تر.

«حاجی قادر» لە غەزەلێکا ئەڵێ:

پێــم خۆشــە غــەزەل فــەرشــی قــودوومــی عــوقــەلا بێ

نــەك بێــتــوو لەبــەر کــەن جــوهــەلا لــەفــز و مــەعــانــی

لەگەڵ ئەوەشا کە «حاجی» بە لامەوە بەڕێزە، ناچارم بپرسم «جوهەلا» کێن؟ ئەو کەسانەی کە دەرەبەگ ڕێگای خوێندنی لێ بەستوون؟ ئەو کەسانەی کە تێناگەن لەم هەموو پێچ و قەمچە کە شاعیران ئەیدەن بە شیعرەکانیان... ئاخۆ ئەمانەن «جوهەلا»؟! ئایا دانەری بەیتی «سەیدەوان» کە شان لە شانی «ئۆتێللۆ» و «هاملێت» ئەدا جاهیلە؟ لێرەدایە کە ئەبێ دەنگ بدەمە پاڵ دەنگی «گۆران» و بڵێم:

بەڵام چی بکەم لە ناو چاوی ڕەشی بەعزێ زەکای گەورە،

وەکوو تۆوی گوڵی دەم با لەسەر بەردێکی ڕەق ئەڕوێن.

هەر لەم غەزەلەدایە کە حاجی ئەفەرموێ:

تــا دەســتــی ئەدا خــەنــجەر و نــەیــفــەرمــوو دەســا دەی...

نــەمــزانــیــبــوو دڵــدارم دەمــان و مــیــانــی هــەیــە

«دەمان» و «میان» کوردی نین و ئافرەتێك کە «دەمان» و «میان»ی دیار نەبێ، یەك لەبەر بچووکی و یەك لەبەر باریکی، جوانیەکەی لەکوێدایە؟ بەلای منەوە ئەمە نەخۆشی یە... «ئاهۆ»یەکە کە وێژەی کوردی گرتوویە و ئەبێ تێبکۆشین لەوە رزگاری کەین. گۆران ئەڵێ:

ئەی قژ زەرد، ئەی بەژن و باڵا کەڵەگەت...

زۆر ساكار و زۆر جوان و نزیك لە لێكدانەوەی زۆربە و قسەی رۆژانەی خەلْك. هەر لەم هەلْبەستەدا كە ناوی «بۆ قژ زەردی بەر دەرگا»یە، «گۆران» ئەلْێ:

ئەبینم پەپوولەی نیازی گفتوگۆ
دوودلْ راوەستاوە لە سەر گوڵی لێو
ئاخ خۆزگە هەلْئەفڕی، ئەمزانی ئاخۆ
رامبێنری چی پێیە بۆ گیانی پەشێو

ئەم بەرنامەیە لێرەدا تەواو نابێ لە سەر رووێشتێكی زۆرتری ئەوێ كە ئەیهێنلْینەوە بۆ بەرنامەیەكی تر. تا ئەو كاتە خواتان لەگەلْ.

١٣٥٢/١/٢٠

# شیعری کوردی و کێشی عەرووزی

سەلامێکی بەتین پێشکەش بە گوێگری هونەرناس.

لە بەرنامەی پێشوودا وەڵامی پرسیارێکمان داوە بە ناتەواوی و هێشتمانەوە بۆ بەرنامەیەکی تر کە لە سەری بڕۆین. ئەگەر لە بیرتان مابێ رەخنەیان لە ئێمە گرتبوو کە بۆچ سەبارەت بە شیعری عەرووزی باش نادوێین. ئێمە بەرنامەی ئەمڕۆشمان دیسان تەرخان ئەکەین بۆ ئەم مەبەستە و بڕێ شوێنی تاریکی مەبەستەکە رووناک ئەکەینەوە.

بێگومان بیستووتانە کە ئەڵێن فڵانە شاعیر یا فیسارە هونەرمەند خاوەنی

مەکەیێکی تایبەتە و ڕێگا و شوێنێکی تایبەتی خۆی لە هونەرا دۆزیوەتەوە. دۆزینەوەی ڕێگا و شوێنی تایبەت یانی چی؟ مەگەر هونەر بۆ نواندنی جوانی و دەرخستنی دزێوی نییە؟ هەموو هونەرمەندێك ئەبێ کاری ئەمە بێ و هەرکەس ئەمە کاری بوو، هونەرمەندە و لەگەڵ هونەرمەندی ترا جیاوازی نییە. بەڵێ وەهایە؛ هونەرمەند پردێك هەڵئەبەستێ لە نێوان کۆمەڵ و راستەقینەدا و ئەیەوێ ئەم دووانە بەیەکەوە پەیوەند بدا و بەیەکیان بگەیەنێ. واتە کاری ئەمەیە کە کۆمەڵ تێبگەیەنێ کە راستەقینەی دەوروپشتی چییە؟ ژیان بە چ بارێکا کەوتووە؟ بەڵام ئاخۆ هەموو ئەندازیارێك وەك یەك پرد دروست ئەکەن؟ کە وەها بوو ئەبوایە پردەکانی تەواوی جیهان یەك چەشن بوایەن. کەچی ئێمە ئەبینین کە پردێك لە ئاسن و بتۆنە و ئەوی تر لە قوڕ و قسڵە؛ سێهەمیان لە دار و پەردووە. یەکێك ڕاستە، یەك کەوانییە؛ یەك زۆر لە ڕووبارەکە بەرزترە و یەکێك نەوییە. هەرکام لەمانە بۆ ئاکامێك لە بەرچاو گیراون. جێگای وا هەیە هات‌وچۆی زۆر بە سەرا نییە، باری قورسی بە سەرا ناڕوا، ئەگەر لە دار و پەردووش بێ، قەیدی نییە. یەکێك لە ناو شارە و جگە لەمەی کە پردە، مەکۆی خەڵکە و جێگای گەشتی نێوارانە، ئەبێ جوان بێ؛ با دراوێکی زۆریش بۆ رازاندنەوەی بدرێ. یەکێك کەوانییە، چونکە ئەندازیارەکە بە گوێرەی لێکدانەوەی ڕەق و نەرمی خاکەکە، وای باش زانیوە کە کەوانی دروست بکا و زۆری بۆ نەیەت. شاعیریش وەهایە. هەرکام چەشنێ ئەدوێ. گاهێ بە حەماسە، کاتێ بە وشەی نەرمی دڵدارانە، دەمێ بە رازاندنەوەی تەبیعەت و ژیان، تەنانەت گاهێ بە توانج و تەوس!! هەموو ئەم کارانەش بۆیە ئەکا خەڵك تێبگەیەنێ. لە ڕاستیا شێوەی هونەری هونەرمەند بۆ کورت‌کردنەوەی نێوانی خەڵك و ڕاستەقینەیە.

ئەڵێن حافز خاوەنی شێوەیەکی تایبەتە، هەروەها سەعدی، شکسپیر، هومێر، فردەوسی، گۆران، لێئۆناردۆ داوینچی، موتزارت، پیکاسۆ و زۆر هونەرمەندی تر. ئەوانە کە پاڵیان داوە بە لووتکەی بەرزی ناو و نیشانەوە لە هونەرا لاسایی‌کەرەوەی خەڵکی تر

نەبون. لە تەواوی شیعری شاعیرانی کوردیا بگەڕێی، زۆرتر لە چەن شاعیرت دەس ناکەوێ کە لاسایی کەسیان نەکردبێتەوە و خەڵك کەوتبێتە شوێن شێوەی ئەوان. ئێمە لە شیعری کوردیا چەند شێوەی دیار و تایبەتیمان هەیە. شێوەی بەیتی، شێوەی هیجایی، شێوی عەرووزی، شێوەی نوێ. لەو ناوەدا تەنیا شێوەی عەرووزییە کە پاش پاککران و ئامادەبوون بە هۆی گەلانی ترەوە گەیشتۆتە دەستی ئێمە و ئەگەرماڵی خەڵك خۆر نەبین، ناتوانین بە خۆماڵی بدەینە قەڵەم. کە وەها بێ هەر لە پایەوە بەلای منەوە شاعیری عەرووزی شاعیر نییە، چونکە جگە لەوە کە کەوتۆتە شوێن شێوەی شاعیرێکی تر، شاعیرەکەی پێشووش کورد نەبووە. کورد نەبووە یانی چی؟ یانی لە باری ژیان و خەم و خۆشی و مێژوو و خوو و رەوشت و خواست و ویستی کورد نەشارەزا بووە. بەم چەشنە شاعیری عەرووزی هەرگیز نەیتوانیوە پردێك هەڵبەستێ لە نێوان کۆمەڵ و راستەقینەدا. چونکە راستەقینەی ولاتی سەرسەوزی کورد و ئابووری تایبەتی ئەم ولاتە ئەوە نییە کە شاعیری عەرووزی باسی نەکا. من ناڵێم بە هیچ بارێك بە شێوەی عەرووزی ناکرێ باسی راستەقینەی ژیانی کوردەواری بکرێ، ئەبینین کە شاعیری وەك پیرەمێرد و نالی ئەم کارەیان کردووە و باشیش سەرکەوتوون، بەڵام شێوەی نوێ باشتری ئەکا، هەراوترە، دەست و پێی شاعیر بە کۆت و زنجیری «مفاعلاتن و مفتعلن» نابەستێ.

دێمەوە سەر سەرەتای وتارەکە کە کوتم ئەڵێن فلان شاعیر شێوەی تایبەتی هەیە و چونکە ڕێگای تایبەتی دۆزیوەتەوە و نەکەوتۆتە شوێن شاعیرانی پێش خۆی، شاعیرێکی بەرزە؛ ئەگەر ئەمە بۆ تاقە شاعیرێك راست بێ و دۆزینەوەی ڕێگای تایبەت نیشانەی گەورەیی و سەربەخۆیی شاعیر بێ، بۆ گەلیش وەهایە. واتە ئەگەر نەتەوەیەکیش ڕێگا و شوێنی ویژەیی تایبەتی خۆی هەبوو و دەستی بۆ هاوسێکانی درێژ نەکرد تا ویژە و هونەریان لێ بخوازێتەوە، ئەم گەلە لە ویژەدا سەربەخۆیە و مەزنە.

ئەزانین کە شێوەی عەرووزی هی کورد نەبووە، لەگەڵ تەیبەتی زمانی کوردیا نایەتەوە، ناوەرۆکێ کە تا ئێستە شاعیرانی کورد (ئەگەر چاو پۆشین لە چەند شوێنەواری بچووك) خستوویانەتە ناو قالبی عەرووزەوە لەگەڵ لێکدانەوەی زۆربەی کوردا جیاوازی هەبووە و بۆنی غەریبی لێ‌هاتووە. کاتێ مەم و زین هەن، لەیل و مەجنوون کێن؟ کاتێ چیای مەغلووب و سەری سپیان و قەندیلی مامەکۆیان و پیرس و چیای شیرن و شاهۆ، سەریان لە سینگی ئاسمان ئەسوون، دوجەیلە و واحە چالآویك و زیخی رەوان و درووی موغیلان و وشتری پێ پان، چین کە لە وێژەی ئێمەدا مۆڵ بخون؟! ئەمانە بۆ ئەوان باشن و بۆ ئێمە لێدوانیان هەر گێژی و کاسی پێوەیە و هیچی تر.

قسەی دوایم ئەمەیە کە دڵم ئەسووتێ لە سەر کانیاوێکی خورۆشان کە لە ژێر رنووی بەفری کۆن دێتە خوارەوە دانیشم و بەردەمم دەشتێکی خەمڵیوی بە شەست‌پەڕو شەوبۆ و شلێرە بێ و داوێنی چیای ئەوبەرم وەك تۆبووك تارای سووری داری ئەرخەوانی بە سەردا دابێ و من لەم حاڵەدا ناچار بم بیر لە دەشتێکی قاقڕی رەملین بکەمەوە کە «قەیس»ە شێتی تێدا وێڵ بوو. ئەوە من و ئێوەش نازانم!

تا بەرنامەیەکی تر خواتان لەگەڵ.

٥٢/١/٢٩

# جیاوازی نێوان حافز و نالی

سەلامی گەرموگوڕی ئێمە پێشکەش بە گوێگری بەهەستی بەرنامەی تاپۆ. هیواداریین سەربەرز و بەختیار بژین. ئێستا لە سەرەتای بەرنامەکەدا گوێ بگرن بۆ پارچە هەڵبەستێکی مامۆستا نالی:

قوربان مەحاڵە پێکەوە بن سەبر و ئیشتیاق

خاریج لە نەسی ئایەیە تەکلیفی «لایوتاق»

مەعنایی نوور و زوڵمەت و نەشری حەیات و مەوت
بوو، ڕوو و زوڵف و ڕۆژی ویساڵ و شەوی فیراق
ئیزهاری ئیدیعاتی تەسەببور لە وەسڵی تۆ
یا مەکرە، یا دەسیسەیە، یا کیزبە، یا نیفاق
بۆ تۆ کە بیکر و تازە، وەکوو حۆری جەننەتی
قەیدی چییە عەجووزەی دونیا بدەم تەڵاق؟!
شیرینیی و لە تاڵی و ترشی عیتابی ڕووت
خاڵت لە سەر جەبین بووەتە دانەیی سماق
سۆفی لە فەقر و فاقە وەکوو فاقە فاقی دا
تەسبیحی دام و دانەیە، ڕیشی دووفاقی فاق
ئەی میهری میهرەبان وەرە سەربانی بامیداد
با مەهرووان ببن بە هیلالی شەوی میحاق
نالی کە سەدری مەسنەدی تەمکینی تەکیە بوو
بۆ تۆ بووە بە دەربەدەری کووچە و سوقاق

نالی، مامۆستای بەرزی ئەدەبی کورد، ڕەنگ و بەروبووی شێعرەکانی لە شوێنەوارە بە نرخەکانی حافز ئەچێ. تەنیا جیاوازییەک کە لەنێوان ئەم دوو شاعیرەدا بەرچاو ئەکەوێ، تامێکی سۆفیانە و عارفانەیە کە لە شێعرەکانی خواجەی شیرازا هەیە، لە بەرامبەرەوە نالی زیاتر خۆی داوەتە ڕازاندنەوەی ڕواڵەت و هێنانی سەنایعی لەفزی و بە لێکدانەوەیەکی تر نالی لە باری تەعبیر و هەڵبژاردنی ئیستعارە و تەشبیهات، لە سەبکی هیندی نزیکە. بۆنموونە واتەی سۆفی لە زبانی حافزا ئەم ئادەمیزادە سەرو پرچ ئاڵۆزە فێڵەبازە نییە کە نالی باسی ئەکا، بەڵکوو ئینسانێکە گاهێ سەرمەزی دۆزینەوەی

رازی هەستییە و زەمانێکی تر شوێنگرتووی ڕێوشوێنی قوبووڵکراوی سەردەمی خۆیەتی و گوێلەمستی شێخ و پیر، بەڵام لە هیچ کاتێکا چەشنی ئەو سۆفییە کە نالی لەو شێعرانەی سەرەوەدا باسی ئەکا نەرم نابێ و بە چاوی سووک تەماشا ناکرێ. حافز ئەڵێ:

صوفی سرخوش از این دست که کج کرد کلاه

بدو جام دگر آشفته شود دستارش

هەڵبەت لە سەردەمی حافزیشا خۆپارێزی بە درۆو خواناسی بۆفریوی خەڵك بووە، بەڵام شاعیری گەورەی شیراز ئەم تاقمە بە سۆفی ناو نابا، گاهێك بە قازی، جارێك بە موحتەسیب و شەحنە و دارۆغە و زەمانێ بە ناوێکی تر ئەیانگرێتە بەر تیری تانە و توانج. نالی خاوەنی ئیدئۆلۆژی و مەکتەب و فەلسەفەیەکی تایبەت نییە کە لە سەرتاسەری دیوانەکەیا شوێنی ئەم بڕوا ئایینی و کۆمەڵایەتییەی گرتبێ. جارێك شێعرەکانی لیریك و غەنائییە، گاهێك تیك و حیماسی، زەمانێکیش ئەکەوێتە سەرباری شێعری گەلی. لە کاتێکا حافز بە هیچ بارێ خۆی لە کاری گەلی و ناسیۆنالیستی نەگەیاندووە. لە سەردەمی حافزا ئەنتەرناسیۆنالیستێکی کۆمەڵایەتی و حقووقی بە سەر هەموو وڵاتە ئیسلامییەکاندا فەرمانڕەوا بوو و لە ڕوانگەی زانیاری و ئەخلاقەوە وڵاتانی ئیسلامی زۆر بە یەکەوە بەستراو و لە یەك نزیك بوون.

لە تەواوی شوێنەوارەکانی سەردەمی پێش حافز وەك دیوانی ناسر خوسرەو، ئەبوولەعلای موعەرری و مەولانا دەرئەکەوێ کە مەبەستێك بە ناوی گەل نەهاتۆتە ناو شێعرەوە. تەنیا زامێك کە لەشی کۆمەڵی ئیسلامی ئازار دابێ بۆتە هۆی بزواندنی هەستی شاعیری بارهاتووی فەرهەنگ و زانیاری ئیسلام. تەنیا خوو و ڕەوشت و ڕێگا و شوێنێك بە خراپ دراوەتە قەڵەم کە لەگەڵ ڕەوشتی پەسندکراوی ئیسلامیا نەهاتبێتەوە. هەڵبەت ڕەوشتی ئیسلامی لە ڕوانگەی فەلاسەفە وفەقیهاندا جیاوازی هەیە و هەرکام بە

لێکدانەوەی خۆیان روانیویانەتە سەر ئەم رەوشتە. حافزی خاوەن مەشرەبی فەلسەفی، تەنیا روالەت و تێکوڵی مەبەستەکە نابینێ و بە ناخیا ئەچێتە خوارەوە و لە کاتێکا تێکوڵ پەرستی روالەت بین گیرۆدەی زاهیرە. حافز ئەڵێ:

درِ میخانه ببستند خدایا مپسند

که درِ خانه‌ی تزویر و ریا بگشایند

یا ئەفەرموێ:

زاهدان کاین جلوه در محراب و منبر می‌کنند

چون به خلوت می‌روند آنکار دیگر می‌کنند

ئەبینین کە سکالای حافز لەمەیە کە ئایین و خوو و رەوشتی باش گۆڕاوە و ئەو کەسانە وا ئەبێ جێگای چاولێکەری و پەندوەرگرتنی خەڵك بن، خۆیان هەڵەڕەوتی سەرشێوێنن.

ز باده هیچت اگر نیست این نه بس که ترا

دمی ز وسوسهٔ عقل بی‌خبر دارد

لە جێگایەکی تریشا ئەفەرموێ:

پیاله بر کفنم بند تا سحرگه حشر

بمی ز دل ببرم هول روز رستاخیز

شاعیرێکی تری فارسیش خەفەتی خۆی لەم هەموو خراپە و نزمییە کە لە کۆمەڵا بەرچاو ئەکەوێ، بەم چەشنە دەرئەبڕێ و بێزاری ئەنوێنێ لە خەڵکی جیهان:

مرا به روز قیامت غمی که هست این است

که روی مردم دنیا دوباره باید دید

هەڵبەت بەرامبەرکردنی نالی و حافز کاتێکی هەراوتری ئەوێ. بەڵام لە خوێندنەوەی

شوێنەوارەکانی ئەو دوو شاعیرە و لە ناوەرۆکی غەنایی شوێنەوارەکانیان دەرئەکەوێ کە لەیەکچوون و لەیەکنزیکی لە نێوانیانا زۆرە. لێرەدا کورتی مەبەستێك بە لای منەوە زۆر پێویستە و رەنگە بکرێ ئەسڵ و پایەیەکی کۆمەڵایەتی لە سەر دابنرێ. مەبەستەکە ئەمەیە کە پاش شێوەی عێراقی، شێوەی هیندی لە ئێرانا پەیدا ئەبێ و لە ئوروپا لە دوای شێوەی رومانتیکدا شێوەی سووررێئالیسم و سەمبۆلیسم باو ئەبێ و ئەزانین کە شێوەی هیندی بەم هەموو پێچ و قەمچ و مینیاتۆری رواڵەتەوە کە هەیەتی زۆر لە شێوەی سەمبولیکی ئوروپا ئەچێ. من لام وایە هەم لە ئێران و هەم لە ئوروپا کاتێ هونەرمەند و شاعیر دڵسارد ئەبێ لە گێرانەوەی ئەو شتەوا لە پێشا هەبوو و مەئیووس ئەبێ لەوە کە ئەو شتەوا دڵخوازیەتی دایمەزرێنێ؛ ناچار دان بە شکستی خۆیا ئەنێ و تەریك ئەبێ و پاڵ ئەدا بە تاقمی کەمایەتی بێ دەربەستەوە. لە ئوروپا شاعیر هەست ئەکا ئەوشتەوا بۆ دامەزراندنی تێکۆشا، واتە بورژوازی، زۆر لە روانگەی دادگەرییەوە جیاوازی نییە لەگەڵ فیئۆدالیسم و لە ئێرانا کاتێ رێك‌وپێکی و برایەتی ئیسلامی ئەشێوێ و شاعیر بە چاوی خۆی نزمی و چەپەڵی پەرەگری کۆمەڵایەتی ئەبینێ و هیچیشی لە دەس نایە هەر دووك مەئیووس ئەبن. ئەو شوێنێ سەمبولیسم ئەکەوێ و لە تونی تارادا بووکی واتە و مەفهووم ئەشارێتەوە؛ ئەم دەس ئەکا بە رازاندنەوەی رواڵەتی خاڵووبەرەیەك بە ناوی هونەری شیعری کە ناو ماڵ و ژوور و هۆدەکانی هیچیان تێدا نەماوە.

تا بەرنامەی داهاتوو بە خواتان ئەسپێرین. ئەم کاتە و هەموو کاتێکی تری ژیانتان شاد.

# کەی کێشەی نێوان شێعری کۆن و نوێ ئەبڕێتەوە؟

سەلام لە گوێگری هەستیار و بیستیاری هۆگری هونەر.

گوێگرێکی بەڕێز بە ناوی وەفای عەزیزی لە سنەوە نامەیەکی گەرموگوڕ و برایانەی بۆ نووسیوین و چەند پرسیارێکی کردووە. نامەی ئەو گوێگرە بەڕێزەمان کە وا دەر ئەکەوێ خاوەنی چێشکەیەکی پاراو و بەهرەو بەرێکی هونەرییە بۆ ئەوە ئەشێ کە برێکی بۆ بیستیاران لێ بخوێنینەوە.

...کاک وەفا ئەنووسێ: «جیهان و کەون لە گۆڕاندایە بە تایبەت بەپێی گۆڕانی

جیهان خواست و ویستی ئادەمیزادیش ئەگۆڕێ و کاروباری کۆمەڵایەتی و ئەوەی وا پێی ئەکوترێ زانیاری کۆمەڵ و کۆمەڵناسی لەگەڵ چەرخ و خولی جیهانا ئەگۆڕێ. واتە ئەو شتە کە ئەمڕۆ باوە و کۆمەڵ نیازی پێی هەیە، بەیانی کۆن ئەبێ و لە ریزی نیاز و پێداویستەکانی گەل و کۆمەڵ ئەخرێتە کەنارەوە و شتێکی تازە جێگای ئەگرێتەوە. ئەم گۆڕانە وەنەبێ هەر لە هونەرا بێتە پێش، بەڵکو لە هەموو بار و لایێکی ژیانی ئینسانیشا خۆی ئەنوێنێ. دوێنێ کابرای فیلسووف و فیزیکزان کاتێ هەستی کرد کە لە گەرماوەدا سەنگایی هەموو شت کەم ئەبێتەوە، بە لەشی رووت لە گەرماوەکە هاتەدەر و سەرخۆشانە ئەیزانی: «دۆزیمەوە... دۆزیمەوە!» پاش ئەو زانایەکی تر لە ژێر دارە سێوێکا دانیشتبوو؛ سێوێکی گەیشتوو لە لقی دارەکە بۆوە و کەوتە سەر کۆشی. بیری کردەوە لە لکی دارەکەوە تا سەر زەوی فەزایەکی بەتاڵە و لە دارەکەوە بەرەو سەرووتریش بەتاڵە و جگە لە هەوا هیچی تری تێدا نییە. کە وەهایە بۆچ ئەو سێوە بۆ فەزای ژوور ناچێ و ئەکەوێتە سەر زەوی؟ بە بیر کردنەوە بۆی دەرکەوت کە ئەبێ کێشەرێک لەم زەوییەدا هەبێ وا هەرشتێك لە بەرزاییەکەوە بەریدەبێ ئەکەوێتە سەر زەوی و لەو رۆژەوە کە «نیوتون» ئەم رازەی دۆزییەوە یاسای کێشەری گشتی واتە قانوونی جازیبەی عمومی پەیدا بوو. ئەو رۆژانە بۆ ئادەمیزاد زۆر بە بایەخ بوون و پێداویستی ئادەمیزاد بوو کە سەر لە م رازانە دەربهێنێ. بەڵام ئەمڕۆ هەموو منداڵێکی پۆلی ناوەندی ئەم کەشفە زانستییە گرینگانە ئەزانێ، کە وەهایە هەموو شت لە گۆڕان دایە و هەموو شت پاش ماوەیەك کۆن ئەبێ و جێگای خۆی ئەدا بە شتێکی نوێ. ئەی لەبەرچی باسی کۆن و نوێ لە شێعرا نابڕێتەوە؟ بۆچ بەم شێوەیە کە شێوەی باوی رۆژگاری ئێمەیە ئەڵێن شێوەی نوێ؟ جا چ لەقەشی بێ، چ پەیکەرەسازی، چ وێژە؟ ئاخۆ باشتر نییە ئەم شەڕی کۆن و نوێیە بیڕێتەوە، وەك لە زانستا بڕاوەتەوە؟ ئەمە پرسیارێکم بوو، پرسیارێکی تریشم هەیە؛ لە بەرنامەی تاپۆدا زۆر جار وشەی ئیماژمان بەرگوێ ئەکەوێ. ئاخۆ ئیماژ هەر

ئەو سفەتە لەفزییەیە کە لە شێعری کۆنا پێی ئەگوترا نیستعاره؟»

لە پێش هەموو شتێکا سوپاست ئەکەم و پیرۆزبایی ورد بوونەوەت لە مەوزووعە هونەرییەکان. پاشان وەڵامی پرسیارەکانت. لە زانستا تاقیکاری هەوێنی بەرەتییە و هەموو شت لە سەر ئەو بناغەیە دائەمەزرێ. واتە زانا ناچارە ئەسڵە زانستییە کۆنەکانی قوبووڵ بێ و بە پێی ئەوان بجووڵێتەوە. یەکەم کەسێ کە بەرد و ئەستی دۆزییەوە بناغەی دانا بۆ دۆزینەوەی ئاگر و ئاگر بوو بە بناغەیەك بۆ زۆر شتی زانستی کە ئەمڕۆ هەیە.

چەشنی مووشەکێ کە پیاو ئەباتە سەر گۆی مانگ، جا با ئەو شتە کە گەرمایی لە مووشەکا پێکدێنێ، ئەو ئاگرە نەبێ کە لە بەرد و پووشوو پەیدا ئەبێ. لە هەرحاڵێکا ئاگرە و گەرمایی و هێز ئەخوڵقێنێ. بەڵام بناغەی هونەر لە سەر عاتیفە دائەمەزرێ و ئەشزانین کە عاتیفەی هەموو کەس چەشنێك نییە. چەن کەس بچنە ناو دارستانێکەوە، ئەوەی کە دارتاشە لە بەر خۆیەوە بیر ئەکاتەوە ئەم دارگوێزە چەند ڕەختە و لە بارە بۆ دەرگا و پەنجەرە لێ دروست کردن. ئەوەی کە هونەرمەندی پەیکەرەسازە ئەڵێ: ئەم دارە، باش ئەکرێ ڕواڵەتی ژووڵ سیزاری لێ دروست بکەی. ئەو کەسەیان کە شاعیرە ئەڵێ: چەندە خۆشە پاش شەکەتی ڕێگا لە ژێر سێبەری ئەو دارە دانیشی و شەیەکی فێنك نارەقەی لەشت وشك کاتەوە. ئەگەر بازرگانێکیشیان لەگەڵ بێ، ئەڵێ بریا ئەم دارستانە هەموو هی من بوایە و بمفرۆشتایە بەم دارتاش و پەیکەرەسازە و دراوەکەم لە تەنکەی گیرفانم بنابایە. ئەبینی کە هەر کەسێ چەشنێ بیر ئەکاتەوە و هونەر کە بناغەی لە سەر بیر و عاتیفەیە، زۆرتر لە زانست جیاوازی تێدا بەرچاو ئەکەوێ. زانست ناگۆڕێ. بەڵام پێش ئەکەوێ و هەڵئەچێ. چەشنی نەمامێك کە ساڵ بە ساڵ گەورەتر و ڕاکشاوتر و هەڵچووتر ئەبێ. بەڵام تۆ ئەزانی کە ئەم دارە گەورەیە هەر ئەمامە بچووکە دەستێژەکەی خۆتە، لە کاتێکا هونەر ئەگۆڕێ و لە پایەشەوە ئەگۆڕێ. دوێنێ

هونەری شیعر و ویژەوانی بۆ پێهەڵکوتنی ئەمیر و پایەبەرزان و بەدەسەڵاتان بوو تا شاعیر بەخشش و سیلەیەك کە بە گوێی شیعرەکە وەریەگرێ خۆی پێ بەخێو کات؛ بەڵام ئەمرۆ شیعر بۆتە چەکێك کە ئەکرێ سێدارەیەکی بۆ خنکاندنی دوژمن لێ ساز بکەی. ئیتر شیعری پێهەڵکوتن باوی نەماوە. لە بەر ئەمە ئەڵێن شیعری کۆن و شیعری نوێ؛ بەڵام بەلای منەوە ئەگەر شاعیرێك بتوانێ لە قالبی عەرووزیشا واتە و مەفهوومێکی ئەمرۆیی دەربڕێ، شیعرەکەی نوێیە و کۆنی قالب نابێتە هۆی کۆنی شیعرەکەی. کە وەها بوو بۆچ شیعری نوێ زۆرتر لە قالبی نوێ ئەخرێ؟

شاعیران لایان وایە خۆبە قافیە و کورت و درێژی دوو نیوە شیعر و رەوی و رەدیفەوە خەریك‌کردن رێگایان نادا بیر لە کاکڵەی شیعرەکە بکەنەوە و لە قالبی ئازاددا باشتر سەرئەکەون.

وەڵامی پرسیاری دووهەمیشتان ئەمەیە:

بەڵێ ئەتوانین بڵێین ئیماژ کە وشەیەکی بێگانەیە، لەگەڵ ئیستعارە کە ئەویش هەر وشەیەکی بێگانەیە ـ بەڵام زۆرتر بیستراوە ـ هەر یەك مانایان هەیە؛ بەڵام وردەیەك جیاوازیشیان لە نێوانا بەرچاو ئەکەوێ. ئیستعارە لە شیعری قەدیما زۆر زوو ئەناسراوە، بۆنموونە نێرگس ئیستعارە بوو بۆ چاوی کەژاڵ؛ سەرو ـ کە بە کوردی ئەبێتە سەوڵ ـ ئیستعارە بوو بۆ بەژن و باڵا. بەڵام ئیماژ زیاتر شەخسی و تەکیە و هەر شاعیرە بۆخۆی ئیماژێکی هەیە. هەڵبەت ئیماژی واش هەیە کە هەموو شاعیرێك یا زۆربەی شاعیرانی نوێبێژ کەڵکی لێ وەرئەگرن. دوو نموونە ئەخەینە بەرچاو کە شار کراوە بە ئیماژی سفەت و بێ بەزەیەتی و پارەپارێزی و نزمی خوو و رەوشت. شاعیرێك کاتێ قسە لەگەڵ مەعشووقەکەیا ئەکا ئەڵێ:

تەواری بەسامی کەژی کوردەواری

بە جوانی دلێر و بە نازی کەنیشکانە تیر و تەیاری

دەسا بەشقی خوا بەس کە تاویّ

بە کەولەنجە شێت و چەواشەم مەکە

دەمیّ لێم گەڕیّ

سەرنجم دەمێکە

زوڵاڵی نەماوی چەپەڵگای هەراسانکەری گەورە شارە

بڵا با لە چاوی گەش و روونی دوو چاوی شێت

کە هەر وەك زریاری بەر تاووساوی بەیانە

مەلەی دەم!

شاعیرێکی تریش هەر لەو کاتەدا کە دەردەدڵی خۆی بە لای دڵبەرەکەیەوە ئەکا، ئەڵێ:

گوڵم دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت

لە شاری چاو لە بەر چرای نیّژن شەوارەکەت

هیوا دارم کاك وەفا وەڵامەکانی گویّ لێبوویێ و پەسندی کردبێ. تا حەوتەی داهاتوو بە خوای گەورەتان ئەسپێرین.

# تامی تاڵی بەزین

بەڵێ هەرچی بوو ئەوەندە بوو کە هات و وردەیەک مایەوە و تێپەڕی؛ چەشنی سێبەری شەو کە لەبەر تیژەی ئاڵتوونی شازادەی بەیان ڕائەکا، یا زەردەی نیوەڕەنگی هەتاو لەسەر لووتکەی کێو کە بە بزەیەکەوە کە تۆ هەرگیز بۆت دەرناکەوێ، بزەی بەزەییە، قەشمەرییە، یا خوا ماڵاوایی، ئاوا ئەبێ و بۆ تۆی بڕوانکار هەر ئەوەندە ئەمێنێتەوە کە دانیشی و بیر بکەیەوە ئاخۆ لەودیو سنووری خۆراوا هەتاو چی ئەکا؟ سەر لە کام گوڵ و گیا ئەدا؟ بە سەر کام دەریای کاسا پڕشنگ ئەداتەوە و لە خەو ڕایئەچڵەکێنێ؟

بەڵام داخێك و سەد مەخابن، گەلۆ، گەلی دە ماجەرایە! ئەمڕۆ منم و هەواڵی هەمیشەییم، گەرمتر لە هەمیشە دەستەملانم بووە و هەر ئەڵێی لە دڵما لێدانە، لە خوێنما بزووتە، لە سەر چاوم دوو تنۆکی قەتیس ماوی فرمێسکە، بە خەم ئەڵێم برادەر. خەمێ وەك رۆژێکی زەردی پاییزی بەرەو زستان لەگەڵما یەك ماڵە و بێ جیاوازی. تۆ بڵێی برای ماوپشتم نەبێ؟! ئێستە بمبوورە کە گوڵ و ئەستێری هەڵگرتن و توانام لەبەر چەخماخەی هەوری بە بارشتی خەفەت لەبەر رەهێڵەی گریان پاش برووسکەی ئێش و ئازار سەرریژ ئەکا و وشکاروی زەردی روخسار و داوێنم ئەکا بە زۆنگ و زەل! ببوورە کە ناچارم رووگەم وەگوێزم و بە زاراوێکی ئاڵتر و ژاراویتر لە ژەقنەمووت بڵێم ئەوین بێهوودەیە. بێهوودەیە لەم سەردەمەدا کە خرینگەی پوولی ورد جێگای شمشاڵی شوانی ئەوینداری گرتۆتەوە شوێن پەریەکی سپی پۆشی ئەفسانەیی کەوم کە ناوی لە پەڕاوە کۆنەکانا ئەوین نووسراوە.

رۆژێك بوو ئەمکوت ئەوین واتەی ژیانە، ئەوین بەیانە، ئەوین هەموو شتێکی ئێـــانە. ئەمکوت با بکوژێتەوە چۆڵەچرای رەنگ بزرکاوی هەتاو، ئەگەر خول و گەڕانی خۆر بۆ نیایش و لەدەورگەڕانی خوای ئەوین نەبێ. ئەمکوت کۆیلەتم ئەوین، هەر تۆم هەبێ خوونکارم. تۆم رێنوێن بی رزگارم! با بڵێم ئەمڕۆ چۆنم. بمبوورە کە دێمە دەنگ وەك قامیشەڵانی دەمبای ساردی ئێوارانە. لە هەر دەمارێکمەوە نەوایەکی خەم و ماتەم هەڵدەستێ. کوتم ئەبم بە بەردی ژێر گۆم، بێ هەست و خوست دانەکەوم. ئەبم بە شوورەی پۆڵا با قەڵماسکەی ئاگرینی خەم ئەمڕووشێنێ و ئەمشەمزێنێ. با ئەگەر سەرم بێ شۆرە و دڵم بێ هیوا، لانیکەم شاییم بە خۆم هەبێ کە پیاوم، ئەبەز و راوەستاوم. راستە کە لیقەوماو و داماوم؛ بەڵام نە وزەم بەرداوە و نە فەوتاوم. ئەبینی برادەر خۆ فریودان گاهێ پێویستە بۆ ئەوەی ناتەوێ پێ لە مردنی خۆت بنێی و سەر دانەوێنی، بۆ ئەوە کە هەنگاوێ وا هەڵگرت و وەستای هەنگاوی دوایی بوو و لەمەوبەدوا هەرچەندە

ڕێ بڕی، هەوراز و لێژ بپێوی، خۆت شەکەت و ماندوو کەی، هەر لە دەوری خۆت ئەسووڕێی و گێژ ئەبی. چەشنی مێروولەی ناو گۆزی بلوور دەرەتانت نامێنێ؛ ناچاری ئەم ڕاستەقینەیە کە وەك داوی جاڵجاڵۆوکە دەست و پێ و هەست و گیانت ئەخاتە ناو کەمەندەوە وەرگری. هاوار لە من کە ملکەچ کردن بۆ دوایی هاتن هەر مەرگە تاڵەکەیە وا لێی ئەترساین.

لە نێوان هیوابڕان و وەرگرتن و هەموارکردنی هیوابڕاوییا بە تاڵییەك، دۆڵ و شیوێك هەیە کە پیاو کاتێ ئەیگاتێ، هەم لە ساماڵنگی ئەلەرزێ و هەم خۆی ناچار ئەبینێ کە بۆی بڕوانێ. وەك کەسێك کە لەسەر هەڵدێرێکی بەرز وەستابێ و بیەوێ خۆی بخاتە خوارەوە، نە ئەتوانێ بگەڕێتەوە و نە لێی ئەبڕێ بچێتە پێشەوە. بەڵام هەرچی هەیە ئەم سنوورە کە لە هەودایەکی هاوریشمین باریکترە، تەنها جێگایەکە کە مرۆڤ دەرفەتی هەیە بیری تیا بکاتەوە. بیری ئەوەی کە هات و تێپەڕی، ئەوەی کە لە ناخی دۆڵەکەدا بە سەری دێ و من لەم سەر سنوورە لەگەڵتا ئەدوێم. ئەی برادەرێ کە خۆمی یا ئاوێنەی خۆمی! و ئەمەیە کە بە دڵما دێ و دێتە سەر پێنووسم.

دێتەوە بیرت کە پێت داکێشاوەتە ناو ڕووبارێکی بچووك و ڕوون و ماسی بچووکی سەر پشت ڕەشی بەر زگ زەرد لە سامی تاریکی قووڵایی ناوەڕاستی ڕووبارەکە هاتوونە کەناری تەنك و ئاو تێزاو و بە دەمی لووسیان بەرەپێت ختیلکە ئەدەن، تۆش سەرت ناوەتە سەر سەرینی سەوزەڵانی ڕوو لە هەڵچوون و شلك و خۆرەتاو بە هەموو میهرەبانی خۆیەوە ڕوومەتت ئەلاوێنێتەوە. یادێك پێ ئەنێتە سەر گلێنەی چاوی نیوە خەوتووت. پەلکەزێڕینە بزەی پڕەنگ و نادیار، کاروانێ کە دەنگی زەنگی وشتری پێشەنگی لە گوێتا ئەزرینگێتەوە، کیژۆڵەیەك کە لە پەناتا دائەنیشێ؛ تۆ لە جیهانی خەون و خەیاڵا بەرخە مامزی خنجیلانەت بە سرکی و سڵی ئەکا، بە ڕوانینی گەرمی نیونیگایا، بە شنەیەکی فێنك و بۆنخۆش کە بە داوێنی کراسی موونسی شاگوڵی لەشی

ئەپژێنێتە ناخی دەماختا، ئەناسییەوەو بێ یارمەتی زمان و وشە و دەنگ پێی ئەڵێی خۆشم ئەوێی. گڵی زیندوو، تووترکی کێوی و عەتری ئەو با نەرم و نیانە کە مەست و سەرخۆش لە میوانی شلێرەجارِ ئەگەڕێتەوە. ئەمەیە خەوبینینی تۆ. بەڵام داخی‌گرانم، تۆ بە خەوبینین قنیات ناکەی. ئەتەوێ هەرچی لە خەوا ئەیبینی، لە بەخەبەریا بتبێ. دەس درێژ ئەکەی تا پەردەی تارمایی لادەی. بە هەر دوو دەس چاو ئەگلۆفی و خەون و خەیاڵ ئەتارێنی. پاشان دەس ئەگێڕی تا داوێنی ئەوینت بگری و بەری‌نەدەی، کەچی دەستت بێهوودە هەوای بەتاڵ ئەپشکنێ. تۆوەك پەپوولەی هاوریشم ئەتەوێ لە تالاری رەنگاورەنگی تانوپۆت بێیە دەر؛ بەڵام لە دەرەوە جگە لە زبری و رەنگی خۆڵەمێشی هیچی‌تر نییە. تۆ ئەو کاتە ئەزانی کە هەی داد و بێداد چیت بە سەر هات. ئیتر نە هەتاو ماوە، نە دڵدار کە کەزی شۆڕی ئەتکوت پرچی گوڵەبەڕۆژەیە. ئەتەوێ بگری. لە کاولی تەنیاییتا بگری. هەوا تەزووی ساردە و لەشت ئەتەزێنێ. بزەی پێرەنگی هەتاو و ماسی بچووکی کەناری هەتاوگر لە ترسی هەوری رەش تاراون. هەور بە نەرمی و پیاوانە ئەگری و تۆ تەنانەت تنۆکێکت فرمێسك بۆ نەماوەتەوە کە بە سەر ناگری دەروونتا بیپژێنی. وەرگرتن و ملکەچ‌کردن ڕێگات لێ‌ئەگرێ. داخی‌گرانم کە ملکەچ‌کردن و وەرگرتن هەر ئەو مەرگە تاڵەیە کە لێی ئەترسای.

# کام شاعیر لای کۆمەڵ زۆڵەیە؟

سەلام لە گوێگری بە هەست و هونەرپەرەستی بەرنامەی تاپۆ.

«گەورەیی» گەورەترین شاعیر و نووسەر، یا هەر هونەرمەندێکی تر لەوەدایە کە هەرچی لە دڵیا هەیە و هەر مەبەستێکی بە دەستەوەیە باش بینوێنێتەوە. هەر وەك ئاوێنەیەکی روون کە هەر شتێ لە بەرامبەریا بێ، لە ناویا دەرنەکەوێ. هونەری ئیلقاکردن و راگەیاندن و تێگەیاندن، هونەرێکی هەرە مەزنە و راستییەکەی ئەمەیە کە زۆربەی کەس لە دڵی خۆیا شاعیر و نووسەرە. پیری یەکجار جوان لە زۆر مێشك و دەروونا

هەیە کە خاوەنەکەی شاعیر نییە، واتە ناتوانێ بیرە جوانەکانی بخاتە چوارچێوەی وشە و عیبارەتەوە. کە وەها بێ، جیاوازی هونەرمەند لەگەڵ خەڵکی ئاسایی ئەوە نییە کە باش هەست نەکا و باش جوانی نەناسێ، چونکە ئەم هێز و توانایە لە خەڵکی تریشا هەیە. ئەوەی شاعیر لە خەڵکی ئاسایی بەرزتر ئەکاتەوە و جیای ئەکاتەوە ئەمەیە کە هەستە دەروونییەکانی باش بە خەڵك رائەگەیەنێ. راگەیاندنی هەستی شاعیرانە، یانی ئەو چەشنە هەستە کە تێکەڵ بووە لەگەڵ هەوێنی عاتیفە و رواڵەت و قالب و چەشن و تەرزێکی تری پەیدا کردووە، یەکجار دژوارە، چونکە شاعیر زۆر شتی وردی وەها ئەبینێ کە دیتنی بۆ زۆربەی کۆمەڵ ساکار نییە. جگە لەمەش شاعیر تەنیا پلاتێك لە کارەساتێك یا روانگەیەك هەڵناگرێ کە بێ دەس لێدان و گۆڕین بیخاتەوە بەرچاوی سەیرانکار. شاعیر بەتایبەت شاعیری ئەمڕۆکە ناتورالیسم بە شێوەیەکی دواکەوتوو ئەزانێ، وەها نایێتە کۆیلەی تەبیعەت کە بێ دەسکاری کۆپی لێ هەڵگرێ. شاعیر، شەیء و مەکان و حاڵات، واتە ئەو شتانە کە لە دەور و بەرین، ئەو کاتە کە تێیدا ئەژی، ئەو ئەفسانیات و حاڵەتانە کە هەیەتی تێکەڵ ئەکا و ئاوێنەیەکی لێ دروست ئەکا کە تەواو ئەو شتە نییە کە لە دەرەوە هەیە و خەڵکی تر ئەیبینن. بە کورتی کاری شاعیر ستاتیك static و وەستاو نییە، واتە زێهنی شاعیر چەشنی مەکینەی وێنەگر لە یەك حاڵەتی قەتیسی یەك کاتی کورت وێنە ناگرێ. کاری شاعیر دینامیکە dinamic، واتە بە درێژایی زەمان و کات لە جووڵانەوە دایە چەشنی فیلمی سینەما، لە سەرەتای پەیدابوونی شتێکەوە تا دوایی هاتنی ئەو شتە لە هەموو حاڵێکا ئەیداتە بەر تیشکی رووناك کردنەوە. بۆ نموونە، بۆرەپیاوێك ئەبینێ کە منداڵێکی برسی لە باوەش دایکی ترساو و سەر لێشێواودا خەوی لێکەوتووە، هەندێك کە ئەڕوا ئەبینێ منداڵێکی خڕ و خوڵ و چاوگەش و لێو سوور لە ناو باغچەی پڕگوڵ و سەوزەی حەوشی باوکی دەوڵەمەندیا خەریکی کایە کردنە. بۆ ئەو بۆرەپیاوە ئەگەر زۆر تێنەگەیشتوو بێ، یا دڵی

تەواو رەق و رەش بووبێ، دیتنی ئەو دوو روانگە جیاوازە باسی هیچ شتێك ناكا. بۆرەپیاو تێیەپەڕێ و نەخشێك ناكەوێتە سەر هەستی، یا ئەگەر هەستیشی جوولا، هەر بۆ ماوەیەكە، پاشان ئەچێتەوە سەر باری ئاسایی خۆی، تەنانەت ئەگونجێ كەسێك ئەم دوو روانگەیە ببینێ و كارێكی گران و شوێنێكی قووڵ بخاتە سەر هەستی و لە بیریشی نەچێتەوە. بەڵام ئەو هەوێنە كە لە هەستی ئەوا مەیبوە، هەر لای خۆی ئەمێنێتەوە و ئەو بەرهەمە كە هاتۆتە بەر هەر لە گیانی خۆیا پاشەكەوت ئەبێ و هەرگیز بە چەشنی شێعرێك نایەتە دەر كە خەڵكی تریش لە راستەقینەی كارەسات بگەیەنێ و ئەوانیش وەك خۆی بخاتە سەر زرێەی بیر و خەیاڵەوە، بەرزتر لەم رادەیەش ئەگونجێ روو بدا، واتە كەسێك كە ئەو دوو روانگەیەی چاو پێكەوێ، روانگەی ناڵێكی لاواز و بێ‌هێز لە باوەشی دایكێكی هەژار و نیگەران و شڕوڵاو ناڵێكی لەش پتەوی چاوگەش و بزۆز لە باغچەی بەگوڵ رەنگاوی باوكی دەوڵەمەندیا، دڵی لەم جیاوازییە سەیرە پڕ بێ لە خەم و بیەوێ خەڵكی تریش تێبگەیەنێ كە چی دیوە. بەڵام یا هەر باسی ئەو روانگەیە ئەكا و لێكی ناداتەوە كە بۆچی وەهایە یا ئەگەر شارەزاش بێ و بیەوێ هۆیەكانی ئەم بەرز و نزمییە دەرخا، ناتوانێ بە زمانێكی هونەری بدوێ و ئەگەر توانی ئەمە هونەرمەندە و خەڵكی ئاسایی نییە.

شاعیری ئەمڕۆ ئەڵێ كە لە كۆمەڵا تووشی فڵان مەبەست یا كارەسات یا روانگە هاتم، بە لێكدانەوەیەكی زانستی لێكمداوە. واتە بەرودوای شتەكەم هەڵسەنگاند، هۆیەكانم لە سەرەتاوە شی كردەوە، پاشان ئەو مەوادە خاوەی كە كۆمەڵ و تەبیعەت دابوویان بە من و لە ژێر تیشكی زانستا بە باشی سەرنجم لێ‌دابوو، بردمە ناو كارگەی زەین و عاتیفەی هونەریمەوە و لەو كارگەیەدا رێك و پێكم كرد، لێك‌ولووسم كرد، ئەوەی وا دزێو بوو بە رەنگی هونەر رازاندمەوە و بە كورتی شتەكەم گۆڕی، بەڵام نەك گۆڕینێكی ئەوتۆ كە نەناسرێتەوە. پاشان ئەو دەسكردەی كارگەی خەیاڵی خۆم خستە

بەر تماشای خەڵك، ئەوانیش لێی تێگەیشتن، چونکە لەگەڵ ئەوەشا کە لەگەڵ قسەی ڕۆژانەی خۆیان جیاواز بوو بەڵام هەر بە زمان و لێکدانەوەی ئەوان بوو و پێیان خۆش و گونیان بۆ شل کرد، چونکە دەردیدڵی خۆیان بوو و لەبەر ئەمە من کە شاعیرم بووم بە ساحیر و کۆمەڵ لە خۆی پرسی: چۆلە وانەزانێ ئێمە چیمان ناتەواوە؟ چیمان ئەوێ؟ و بەیانی ژیانمان چۆن ئەبێ؟ من کە شاعیرم و ساحیرم و ئەزانم کۆمەڵم چی نییە و چی هەیە و چۆن ئەبێ لەوانەی کە هەیەتی کەڵك وەربگرێ بۆ بەدەستهێنانی ئەوانەی وا نییەتی، خۆشەویست بووم، بە گوێم کرا و قسەم ڕەوا بوو، شێعرم برەوی پەیدا کرد و کۆمەڵ ناوی نام: «ڕۆڵە».

تا بەرنامەیەکی تر هەمووتان بە خوای گەورە ئەسپێرین. هیواداریین شادمان و بەختیار و سەرکەوتوو بن.

# بەرە هەر لە لای تەنگییەوە دەدرێ!

کۆڵان و گەڕەکی شار لە ژێر پۆپەشمینی مانگەشەوا خەویان لێکەوتبوو. هەناسەی ژین جار جار بە نەسپایی نەهاتە گوێ. دوو دڵدار لە ژێر سێبەری سەردەرانێکا قسەی شیرین و هیوابزوێنی لەوێنیان بە گوێی یەکترا نەچپاند. سەرخۆشێك لە مەیخانەی سەر رووبار نەگەڕاوە و بە دەنگێکی بەسۆز خاڵەی رێواری نەکوت. وشەکانی هەر وەك هەنگاوەکانی تێکەڵ و پێکەڵ نەبوون، گاهێ دەستی بە دیوارێك نەگرت و بە دەسرەسرێنکی چڵکن کە لە پێشا وا دەرنەکەوت پڕ بووە لە

خواردەمەنی مەزەی ئارەق و ئێستە هیچی تێدا نەماوە ئارەقەی سەرگۆنای گرگرتووی ئەسرێ. گاهێ پۆلێك خەڵك پاش شەوباش و تۆخۆش و منخۆش لە ماڵێك ئەهاتنە دەرەوە. پرشنگی چرای ناوماڵ وەك مافوورەیەكی زەردی كاری كرمان لە داڵانی تاریكەوە رائەخرا و ئەگەیشتە سەر تاریكایی جۆگەی سەر شەقام، پاشان بە پێوەدانی دەرگا ئەپێچراوە و تەنیا رەنگی نیومڕلكی مانگەشەو لەما كە لە بزەیەك ئەچوو نەتئەزانی بزەی دڵتەنگییە یا زەردەی دڵخۆشی. پۆلی میوان بە وتوویژیانا دیار بوو كە لە خوازبێنی ئەگەڕێنەوە. یەكیان كە گەنجتر بوو ئەیكوت جا ئەمە بوو بە چی؛ دەمەزارتمەن مارەیی، گوڵ و گوارەی زێڕ، ژێرچەنە و ملوێنكە و ئاینە و ئۆینەی گرانبایی، هەیت و هووت و جڕو جانەوەر، سەر تا پاخوار پێنج دەست جل و بەرگ، پشتێنی پەشمینەی قەدیم، كراسی زریوە و چیمەنی كوردوستان، كوڵۆنجەی چاوی لەم و ریشی ئەوا![1] جەماڵ ئەگەر هەموو ئەمانە بكڕێ، پاشان ئەبێ بۆنانی شەو دەست بۆئەم و ئەو درێژ كا. كەس نییە بە حاجی بڵێ ئەمە كچ بە شوودان نییە، كچ فرۆشتە.

یەكیان كوتی: «جا بە ئێمە چی برا!؟ لە سەرمان بوو بچین و خوازبێنی بكەین و كردمان، سازان و نەسازانەكەیان بە خۆیانە. جەماڵ ژن دێنێ و حاجی كچ بە مێرد ئەدا، ئێمە لەم نێوانەدا سەری سیرین یا قونچكی پیوازین؟» یەكی تریان وەدەنگ هات و كوتی: «كەچە ربەیە كەس پێی ناپێوێ، لە بەر خۆیەوە دەڵێ شازدە.»

زەنازەنایان هەر دەهات و كەمتر دەهاتە گوێ و خرمەی پێیان لە سەر قیلەتاوی شەقام ئەبڕایەوە. من سێ‌چوار رۆژ زۆرتر نەبوو هاتبوومە ئەو شارە، بەڵام نەتكوت هەموو تەمەنم لەوێ رابواردووە. لە بەر چی هێندە هۆگری شارێك ببووم كە بە رواڵەت هیچ جوانییەكی تێدا نەبوو؟ نە دار و شینایی، نە كێوی بەرز و بەفراوی، نە خانووی

---

[1] - چاوی «مەلا ستەفا» و ریشی «مام جەلال» ـ س. ع

خۆش و مەیدانی بە گوڵ و چیمەن. خۆم نازانم کە هی ئەوینێکی کوتوپڕبوو کە لە دڵما خەریکی چرۆ دەرکردن بوو، یا ئەوینێکی لەمێژینەترم لەو شارە لە دڵدا بوو. ئەوینێکی لەوتۆ کە گەلێ بەرێزترە لە کەشم و نەشمی ئەندامی کیژۆڵەیەك یا بزەی لێوێکی ئاڵ و ئیوێنگای دوو چاوی کاڵ. ئەوینێك کە منی دەکرد بە هاوشاری خەڵکەکە. ئادەمیزاد بریتییە لە دوێنێ و ئەمڕۆ و بەیانی و شارەکە بیری دوێنێی منی شیرازە گرتبوو. ئەمڕۆش دوو چاوی مەڕی رازاوەی شەرمێکی کچانە بە جادووی روانینێکی گەرم، هۆگری کۆنی منی بەم شارە بووژاندوتەوە.

ئەو شەوە من لە بیری شارەکە و رابردووی و ئەمڕۆی نەچووبوومە دەر. لە هەر گۆشەیەکی شارەکەدا تاپۆیەك وەستابوو و لە رووبەندەی ئەفسانەوە پێچرابوو. ئەتکوت پەیکەرەی مەرمەڕینی مەزنە پیاوێکە و هێشتا پەردەی لە سەر لانەبراوە. ئەمانە بیری مێشکم بوون و بیری دەمارم؛ بەڵام دڵیشم سەرەڕۆی بیرێکی تر بوو. بیری چاوکەژاڵێکی شلکەلەمام کە دەنگی ئەتکوت چەپەی بە ئەسپایی شەوبای شەوگەرە و لارولەنجەی لە رەوتی ئاسکێکی سڵی ترساو ئەچێ. ئەم دوو بیرە تلاوتلیان دام و بە دەردی خەورەوینەوە هەستام و چەشنی مقەستێك بە دەست بەرگدرووێکی ناشارەزاوە لە حەریری زەردی مانگەشەو نیشتم. ئەڕۆیشتم، بێ ئەوە بزانم بۆ کوێ! هەنگاوم بێ ئەوە نیازی بە فەرمانی مێشکم بێ، بەرەو پێش ئەچوو. شاری میهرەبان، دەنگی پێی منی ئەکرد بە لێدانی دڵی. قانگڵەی کۆڵان لە ژێر پێما ئەپێچرایەوە و هەڵئەکرا و من کاتێ بە دەور و پشتما روانیم جگە لە چەند خانووبەرەی بە مۆزە دروستکراوی یەك نهۆمی لار و کۆم، نیشانەیەکی لە شار نەمابوو. خانووبەرەکان هەندێکیان بە نووری بێرەنگی مانگەشەو لە بزەیەکی بێ تەوژمی رەنجەڕۆیەك ئەچوون کە خۆیشی نازانێ بە خۆی پێئەکەنێ یا کۆمەڵ و ئاسمان و خوار و ژووری نێوان تاقمی ئادەمیزاد بۆتە هۆی پێکەنینی؟ هەندێکیشیان کە سێبەری شاخیان بە سەرا کشابوو ئەتکوت گنجی ناوچاوانی مۆڵی

کەسێکن کە شکاوە، بەڵام نەبەزیوە. بێدەنگی تەنها دەنگێك بوو کە لەم ماڵانەوە دەیلووراند. من ئەو شەوە زانیم کە دەنگی بێدەنگی چەندە بەرز و گوێکەڕکەر و زراوبەرە. دەترسام بەڵام دەکێشرام بەرەو خانووبەرەکان. گۆڕستانی زیندووان دەبێ چی تێدا بێ کە بێ‌ڕەزاترین کەڵکەڵەی من هان دەدا تا بچم و لە رازی زیندووی زیندەبەگۆڕ سەر دەربهێنم. هەنگاوێك، دوو هەنگاوی بە ترس، تا کاتێ سێبەری کێو منیشی داپۆشی. بە خۆما روانی، ببووم بە یەکێك لەو خانووبەرانە کە خانووبەرە نەبوون و تاپۆی خانووبەرە بوون! نە؛ لێکدانەوەکەم کورتی هێنا، من ببووم بە گیانی خانووبەرەکان؛ گیانێکی سەرگەردان کە لە بەر دەرگای هەموو خانووبەرەکانا دەوێستا، گوێی دەگرت و چپەی دەوێندارانەی بووك و زاوایەکی بە شەرمی لە ناو خانووبەرەکانی لێ‌دەگۆڕا لەگەڵ لێدانی دڵی خۆی و ناڵەی ساوایەکی نەخۆشی لەگەڵ ئاخێك کە دەروونی ئاگرین دەکرد لێ تێکەڵ دەبوو. ئافرەتێك بە گریانێکی بەرگیراوەوە دەیکوت: «چی بکەین پیاوەکە؟» دەنگی پیاوێك لە درزی دەرگاوە خۆی بە گوێما دەدا کە وەڵامی دەدا: «روو لە خودا بکەین!» بەڵام وا دیار بوو زۆری ئەم وتەیە بە ژنەکەی کوتبوو، کاتێ کە چەند ساڵ لەمەوبەر زەماوەندی کردبوو و بۆ شەوی یەکەمی ژیانی خێزانداری هەر ئەوەندەی بە دەستەوە بوو کە ئەو رۆژە بە قورەکاری پەیدای کردبوو و پاشانیش زۆر جار کوتبووی: «ئافرەت! کار نیە خودا چاکی دەکا.» ئەمشەو کە کۆرپە ساواکەیان بێ سەر و زمان کەوتبوو و دەستیان بە هیچ لایەك رانەدەگەیشت، لە خۆی رانەدی ئەم وتەیە دووپاتە کاتەوە، بەڵام ئەو پیاوی ماڵەکە بوو، دەبوو قسەیەك بکا.

بایەکی سەرشێت، کەلێنێکی دابووە دەرگاکە؛ من دەمدی ئافرەتەکە بە چاوێك سەیری ساڵەکەی دەکا و چاوەڕوانی رووداوێکی تاڵە، بە چاوێکی تریش دەڕوانێ بۆ شووەکەی و لای وایە دەتوانێ دەروویەکی روون لەم شەوە رەشە بکاتەوە. دەمدی کە ساوای بێ‌تاوان، سەر کوڵمی بە ئاگری تاو و یاو بۆتە پۆلووی ئاگری سوور و دەمدی کە

پیاوی لێقەوماو کە لە لایەکەوە شوو بوو و لە لایەکی ترەوە باوك، هەر لە وشەیەك ئەگەڕا کە هەندێ هیوادەرتر بێ لەوەی تا ئێستە کوتوویەتی. من خۆم پێ نەگیرا و لەبەرخۆمەوە کوتم: «بەرە هەر لە لای تەنکییەوە ئەدرێ!» شووی سەرلێشێواو بێ ئەوە بزانێ دەنگەکە لە کوێوە هات، بە شوێن مندا دووپاتەی کردەوە: «بەرە هەر لە لای تەنکییەوە ئەدرێ».

بای ئارامی سەری شەو، ئەیلووراند و چەشنی چنجرووکی ئافرەتێکی ئازیەتبار ڕوومەتی کێو و دار و دەوەنی ئەڕنی. ئیتر شار جوان نەبوو. بیری کێژە بە لەنجە و لارەکە لە دڵما نەمابوو. دڵ بە خەم و ئاڵۆز، بەرەو شار ئەگەڕامەوە تا پەنا بەرم بۆ خەو. لە دوورەوە دەنگی سەرخۆشێك ئەهات و با، سەربەندەکەی بە هەموو شارا بڵاو ئەکردەوە:

ڕێگاکەم دوورە، مزڵم کوێستانە

شەوم لێ دادێ، خەم لێم میوانە

# تراویلکه

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرستی بەرنامەی تاپۆ. تکایە گوێ بگرن بۆ پارچە پەخشانێک.

لە هۆدەیەکی بەرەو هەتاودا هەر دانیشتن و چاو لە دەرگا برین، تا کەی زاری بەستراو و تەوێڵی گنج و مۆنی دەرگا بە زەردەیەک بکرێتەوە و بەژنێکی کچانەی کەڵەگەت لەناو دووتای دەرگاکەوە دەرکەوێ، لە بەر دەرگاوە بە دەمتەوە پێکەنێ و پاشان بە رەوتێک کە پیاو ئەکەوێتە گومانەوە کە ئەم دوو پێ بچووکە بە سەر زەویدا ئەڕۆن یا

وەك مژی بەهاری بەسەر زەویا نەرمونیان خشکە ئەکەن، بەرەو لات بێ و بە دەنگێکی ئاشنا پێت بڵێ، دەی چۆنی و پاش ئەوە وەڵامت دایەوە، دەس پێ بکا بە باسێکی کە هەزارها جارت بیستووە، بەڵام هەرگیز بیرت نەکردۆتەوە کە وشە و وتە و واتەکان بۆژۆ و کۆنن. لە پێشا کەمێك خۆگرتن کە ئەمە چ ژیانێکە؟ بیستی هەزاران ناڵە و نیوەنووزە، بە بیراهاتنی هەزاران دەستی بێ گۆشت و هەیکەلی بەئێسقان جارێك لە بیافرا ئەو جارەکەی تری... و لەوێوە بیرت بچێ بۆ ئەو هەموو گەنمە کە لە ئاوی ئۆقیانووس ئەکرێ تا نرخی بازاڕی بژێو نەشکێ؛ گوایە نرخی بازاڕ دڵی ئادەمیزادە، ئەگەر شکا....

راستی من کارم چییە بە سەر ئەم قسانەوە؟ خەریك بووم بڵێم تۆ لە هژدەیەکا کە هەموو جیهانی تۆیە دانیشتووی بە هیوای کەشم و نەشم و لەنجەولاری بەژن و بارێك.

راستی دەردمان چییە؟ ئەو ئاورەی کە بە واتەی عەلی بەردەشانی:

بەر بۆتە دەروونی دەروونخانێ

نە بە بای دەکوژێتەوە نە بە بارانێ

نە بە باج و بێتەڕە و گڵ وەسەردانێ

داخوا بڵێیەی کام کڵی دانەمرکاوە؟

دوێنێشەو هەنگی سەرشێتی بیر و خەیاڵ لە پلوورەی سەرما پوورەی دابوو؛ ئیتر خەوی چی؟ با هەستم بڕۆم لەو سێبەری شەوەدا کە هەوای دەرەوە زرنگاوە بە تاسەی بۆنی دوورترین کوێستانی سەر بە تەمی پڕ لە هەڵاڵە و بەبیرونەوە سەرم هەڵگرم و کەمێك پیاسە بکەم. کۆڵانی چۆڵ لە ئێشی هەزاران قونندەرە و پێڵاوی کینە لە دڵی رۆژانە رزگاری بوو، ئەحەسایەوە و من لە ژێر پێما لەوانە بوو هەناسەی هێدی و لەسەرخۆی خەوی خۆشی پاش شەکەتی زەوی بیستم. بۆ وەهاین ئێمە؟ بۆ بێ ئەمەك و ناسپاس و سپڵەین لەگەڵ یەك، تەنانەت لەگەڵ سەرزەویش؟ لەگەڵ هەوا و دەریاش. هەر بە چەند مانگ جارێك کارگێکی ژاراوی لە نێوادا و سیبیری و

ئوقیانووسی گەورەدا ئەڕوێین، دێوێك لە ناو تەلەسمی زەریە بەرەڵڵا ئەکەین. جا هەزار هاوار بە پوولێك چوونکە ئێمە بەهێزین، ڕەگی ملمان ئەستوورە، یا هەر لە شەقام دانیشێ ئەو پیرەژیرەی کە ناوی «ڕاسێل»ە؟ مەگەر ناکامی چییە جگە لە شەکەت بوون و خنکانی گوێی بە گرمەی بێ‌وچانی شەقامی پڕ لە ڕەورەوەی ئاسن؟ هەر کەس گیرۆدەی شتێکە و داخی گران ئەمەیە کە هیچ شتێك تا سەر نییە. نە! مەبەستم ئەمە نییە کە ئادەمیزاد پیر ئەبێ و ئەمرێ، یا وەك ئەو شاعیرە خۆشەویستە خەفەت بخۆم کە جوانی دەموچاو، تا سەر نامێنێ بۆ پیاو. مەبەستم ئەو بوتانەیە کە ئەیانتاشین بە دەستی خۆمان تا نەزانیمان زاخاو کا، تا هیوامان بیزوێنێ. پاش ماوەیەکی زۆر لە بیرمان ئەچێ کە لە پێشا چێو و چیلکە بوون ئەیانپەرەستین. تا ئێرە هەر نەزانییە بەڵام بە کێ بڵێم کە دەردی زانین گاهێ لە ئێشی نەزانی تاڵترە، بوت تاشین دەردی نەزانییە؛ بەڵگەی بێ هێزییە؛ بەڵام هەرچی بێ، هیوایە بۆ زیندوو مان. دەردی گەورە کاتێ دڵ پڕ ئەکا کە مێشك تێئەگا بوت هیچی لە دەس نایە. رووخانی بوت، یانی رووخانی هیوا. جا هەر بوت تاشینە و بوت شکاندن. هەر هیوایە و بێ‌هیوایی. ڕاستی کامەیە ڕێگا؟ کوانێ خاڵی ڕێبوار؟ من چی ئەڵێم خاڵی ڕێبواریش بوتێکی ترە.

ژیان یانی ئەوەندەی ئەو ماوەیە کە تینوویەك بەردە تراوکەیەك چاو ئەکا لە یەکەم هەنگاوەوە تا هەنگاوی دوایی، تا ئەو کاتە تێئەگا ناوەکەی بۆتە بەردی داگرساوی بەر هەتاوی گەرم. تینوەتی ناخۆشە. بەشوێن ئاو گەڕان ناخۆشە. دیتنی بەردە تراوکە خۆشە، بەڵام لە هەمووان ناخۆشتر ئەمەیە کە تێگەی هەرچی بە ئاوت زانی تراویلکە بوو، نەك هەر تۆ؛ هەرچی ئادەمیزاد دۆزیویەتەوە و ئەیدۆزێتەوە تراویلکەیە....

ئەمە پارچە پەخشانێکی سەمبولیك بوو پێشکەشمان کرد بەو گوێگرە بەڕێزانە کە زۆرجار بە نامە لە ئێمەیان پرسیوە بۆچ لە بەرنامەکەتاندا پەخشانی کوردی ناناسێنن

و نموونەیان ناخوێننەوە؟ بۆچ لە بەرنامەی تاپۆدا کە گوایە بەرنامەیەکی هونەرییە و ئەبێ بە هەموو لایەکی هونەرا رابگا زیاتر باسی شێعری کوردی ئەکەن؟ ئێمە لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێین کە بەرنامەی تاپۆ باسی هەموو چەشنە هونەرێکی بە گشتی کردووە و زۆرجار پەخشانی کوردیمان لەم بەرنامەیەدا بڵاو کردۆتەوە، بەڵام باشترین وەڵام بەجێهێنانی ویستی گوێگرەکانە بە کردەوە و ئەم پارچە پەخشانەش نیشانەی رێزدانانە بۆ ویستی ئەوان. جا ئێمەش تکایەکمان لە گوێگرە بەڕێزەکان هەیە، ئەویش ئەمەیە کە لە شوێنەواری نووسەرانی کورد هەرچی دەستیان کەوت بۆمانی بنێرن، تەنانەت ئەگەر خۆشیان لێهاتوویی و جەوهەری نووسەرییان هەیە لە شوێنەواری خۆیانمان بۆ بنێرن تا پاش لێکۆڵینەوە بە ناوی خۆیان بڵاوی کەینەوە. تا بەرنامەیەکی دیکە خواتان لەگەڵ.

# ژیان و ئەوین

بەڵێ هەرچی بوو ئەوەندە بوو و ئێستە هەتاوی ڕاستەقینە لە چاوم چەقیوە، وەك خوێ بە سەر برینی تازەیا کەی ئەیکزێنێتەوە. ئاخۆ ئەوین پووچ و بێهوودەیە؟!

لە، لێم گەڕێ با ناوی بنێم تاقیکارییەکی تاڵ و بێ سەرکەوتن، چونکە ئەوین خۆی ڕاستەقینەیە؛ بەیانییە؛ هەمیشەیە. با بکوژێتەوە کوانووی گەرمی خۆرەتاو، ئەگەر ئەپژێتە ناو ێشکەی ئەوین و بە سەر گۆڕی ئەوینا بدرەوشێتەوە. بێدەنگ بوون و لە بێدەنگیدا شوورەیەکی پۆڵایی دروستکردن کە توانای هەبێ خۆی ڕاگرێ لە بەر

مەنجەنیقی غەم و تیری ئاگرینی ناهومێدی، ئەگەرچی نابێتە هۆی شادی، لانی کەم غروورێکی پیاوانەی تێدایە.

داخێك و سەد مەخابن. چەند بە ساکاری، چەند بە ئاسانی ناچارین ملکەچی بەسەرهات بین! مردنیش خۆی ملکەچییە بۆ دوایی‌هاتنی هەموو شتێك، بۆ ئەوە جێگایەك بۆ خۆی لێشارینەوە، یا ڕێگایەك کە دەستی مردن نەیگاتێ. کاتی نەهاتی هاتووەو ئێمە بە دەستی پڕ چەپکە گوڵی سوورەوە لە سەر ڕێبازی دانیشتووین. هاکا هات. هات و بە بزەیەك موژدەی بەهاری پێ ڕاگەیاندین. ڕۆژاوا بە ئاسۆی زەردییەوە لە بەر چاومان ئەبێتە ڕۆژهەڵات و هەزار خۆرەتاو هەڵدێ، بۆ ئەوە تاقە یەکێکیشیان تینی بدا بە لەش.

دێتەوە بیرت کە پێت شۆڕ کردبۆوە بۆ ناو چۆمیلکەیەك و ماسی بچووك کە لە ترسی قووڵی و ڕەشی گۆم هاتبوونە بەر خۆرەتاوی کەناری چۆم، دەمی لووسیان بە ژێر پێتا ئەهێنا و ختیلکەیان ئەدای. سەرت کردۆتە سەر سەرینی سەوزەی تازە و تازەهەڵچوو و خۆرەتاو هەموو میهرەبانی خۆی کردۆتە پێشکەشی لەشی گەرماخوازت. یاوێك لە چاوی بەستراوەتەوە ئەبێتە میوانی دڵی دڵاوات. زەردەخەنەی وەك کۆلکەزێرینە تێتەوە ئەپێچرێ. دەنگی زەنگی دوورەدەستی هەزار کاروانی ڕۆیشتوو بۆت ئەبێتە لایەلایە و تاسەی خەوێکی خۆش دەماری لەشت شل ئەکا.

لە جیهانێکا کە نە خەوە و نە بێداری خشپەی کراسێکی کچانە ئەبیستی و بۆنی مێخەکی بەرۆك و عەتری لەشی زیندووی خۆشەویستەکەت موچڕکێکی ئۆخەی ئەخاتە سەر هەستت. بۆ ئەوە نیازت بە وشە و لێو و دەنگ هەبێ، بە لێدانی دڵ پێی ئەڵێی خۆشم ئەوێ. خاکی ژیاناوی، تووترکی کێوی، بۆنی خۆشی شنەبایەك کە دوێشەو میوانی شلێرەجاڕی کوێستان بووە، پڕت ئەکەن لە گیان، لە هیوا، لە ژیان. خەوبینین لە بێدارییا! ئاخۆ گەلی دەبرادەران، ژیان هەر خەوبینینێکی دوور و درێژ نییە

کە شەقۆلی تاڵی مردن لەو خەونە رامانتەچڵەکێنێ.

بە داخەوە تەنانەت خەوبینینیش قیاتی هەتا سەر ناکا. ئەتەویێ بەخەبەر بی. بە چاوی واڵاوە سەیری دەوروپشتت بکەی. ئەتەوێ بە هەموو لەش دڵنیا بی کە خەونەکەت راستە. هاوار بۆ تۆ. ئەو دەستەی وا درێژی ئەکەی، تارای خەیاڵی و خەو لە سەر رواڵەتی بووکی هیوا لا بەدەی، لێتەبێتە بیورێك کە ریشەی ئاواتت ئەبرێ. ئیتر نە ناو ئەمێنێ نە سەوزە و پەلکەزێرینە. ماسیە وردیلەکان لە ترسی هەوری رەش پەنایان بردۆتەوە بەر قووڵایی. تەزوویەکی سارد. مێروولە بە پێستی هۆگری گەرمات ئەکا. «دونیات لێئەبێتە چەرمی چۆلەکە.» تۆی و تەنیایی. تۆی و خەم و تەم. لە بەر خۆتەوە ئەڵێی برایەوە. هەموو شت تەواو بوو. بریا وا بوایە وەك تۆ ئەڵێی. بریا دوایی هەموو شت بوایە. بەڵام بە هەڵە چووی. تەنیا خۆشیە براوەتەوە. ناخۆشی و تاڵی و زبری سەرەتایەتی. ئەبی بە مەلێکی پەرەوازەی هێلانە لێشێواو. سەر هەموو لکی دارێك لێت ئەبێتە تەڵەسمێك. هەموو باز و شمقارو کوڵارەیەك لە راو کردنت ئەگەرێن. تۆ لە تەنیایی و تەریکی بێ برانەوەتا وشەی باڵ و سێبەری ترسێتەریان ئەبیستی و ئەبینی. تا کاتێ دێیە سەر ئەم برِوایە کە مردن وەك ئەڵێن دزێو نییە. بیری مردن، بیری پەنابردن بۆ سنوورێك کە ئارامی و حەسانەوەی هەتا هەتایە، بێدەنگی و بێرەنگی رووتە، بۆت ئەبێتە ئامانج. تۆ مل کەچ ئەکەی بۆ مردن و مردن جگە لە وەرگرتنی راستەقینە و دوایترین راستەقینەی ژیان هیچی تر نییە.

لەگەڵ ئەوەشا، با ئەڵێم ئەوین بێهوودەیە. با ناوی بنێم شیرینترین بەری داری ژیان. دارێك کە ئەگەر تۆوی بکەوێتە دەم بایەکی سەرشێت و لە شۆرەکاتا بڕوێ، ئەبێتە ژەقنەمووت و ئەگەر لە زەوییەکی بە پێز و پیتا شین بێ، بەری سێوە لاسوورە دێنێ. بەڵام ئەوین زۆرتر لەو دڵانەدا ئارام ئەگرێ کە تانوپۆیان لە خەو و خەیاڵ پێکهاتووە، زەمە و خرمەی پێ و چەك لە کوێ و جیهانی نەرم و نیانی ئەوین لە کوێ؟

لە دوایی بەرنامەکەدا وەڵامی گوێگرێکی بەڕێز ئەدەمەوە کە نووسیویەتی: «وێژەری بەشی وێژەیی رادیۆ مەهاباد بە باشی شێعر ناخوێنێتەوە. بۆ نموونە نووسیویەتی ئەڵێ: «لە خوێندنەوەی پارچە شێعرێکی گۆرانی نەمرا تووشی چەند هەڵەیەك هاتووە و خوێندوویەتەوە:

کوردستان گەڕام

دۆڵاو دۆڵ پێوام

نە لە شار و نە لە دێ

نەمدی کەس وەك تۆ جوان بێ

تۆیت و بەس

پاشان مووسیقای نێوان دوو پشوو هاتووە و پاش مووسیقایەکە، وێژەر دەستی کردۆتەوە بە خوێندنەوەی پاشماوەی شێعرەکە:

کچە کوردێ وەك گوڵ وا بێ

کوردستانی پێ ئاوا بێ

..............»

بەڵێ گوێگری بەڕێز، ئەم چەشنە خوێندنەوەیە هەڵەیە. ئەبوو پاش «تۆیت و بەس» رانەوەستێ و دوایەکەی بخوێنێتەوە، چونکو ئەگەر وەهای نەخوێندبێتەوە شێعرەکەی مامۆستای تێك داوە، بێ مانای کردووە. هیوادارین وێژەری بەشی وێژەیی زۆرتر ورد بێتەوە. هەروەها لە جیلوەی شانۆشا وێژەر وەك گوێگری بەڕێزمان نووسیویە تووشی هەڵە بووە و خوێندوویەتەوە: «بە سۆزی تەشویقی مەتاعیبی گوزەران» و چەشنێکی ئەدا کردووە کە مانای شێعرەکە بەم چەشنە بەرچاو بکەوێت کە بە سۆزی تەشویقی مووسیقا ناخۆشی و تەعب رابوردن و لاچوون....

لە کاتێکا ماناکەی ئەمە نییە و بەم جۆرەیە:

به سۆزی تەشویقی
مەتاعیبی گوزەران
هێواش هێواش لەتکێتە دەروونی نیسیانێك
کە رەمزی لەززەتە
میفتاحە بۆ تەلیسمی ژیان
ژیانی ئینسانێك...!

واتە بە سۆزی تەشویقی مووسیقاکە، تەمەنێ کە لە پێشا بە سەر پیاوا هاتووە لە بیر ئەچێتەوە.

تکام لەم گوێگرە ئەمەیە ئەگەر هەڵەیەك لە بەرنامە کوردییەکانی رادیۆ مەهابادا بەدی ئەکەن، یا بۆ کاربەدەستانی رادیۆی مەهاباد بنووسن، یا بۆ تاران بە ناو نیشانی: «جادە پهلوی ـ بلوار جانسپار، برنامەهای خارجی ـ شورای نویسندگان کُردی» بنووسن. دڵنیا بن ئێمە ئاواتمان ئەمەیە بەرنامەکەمان کەمایەتی و هەڵەی تێدا نەبێ و بە سپاسەوە گوێ ئەگرین بۆ گشت رەخنە و رێنوێنییەك کە لە لایەن گوێگرەکانمانەوە بێ.

٥٢/٦/١١

# «تاپۆ و بوومەلێڵ» یانی چی؟

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆو بوومەلێڵ. پێش هەموو شت ئەبێ عەرزتان بکەم کە بە ڕاستی ناوی بەرنامەکە بۆتەهۆی هەزاران پرسیار. کەم گوێگری وامان هەیە کە نامەیان نەنووسیبێ و نەیانپرسیبێ تاپۆو بوومەلێڵ یانی چی؟ گوێگرانی واشمان هەبوو، کە بێ ئەوە تەنانەت پرسیارێکی وێژەیی بکەن یا دیارییەکمان بۆبنێرن، تەنها ئەم پرسیارەیان کردووە. ئێمە زۆر جار وەڵاممان داوەتەوە و ئێستە لەمە نەترسین ئەگەر دیسانەوە ئەم دوو وشەیە مانا بکەینەوە و پێوەندییان لەگەڵ

یەکا هەڵدەین، لە لایەکەوە ئێمە تاوانبار بکرێین بەمە کە باش سەردێری وتارەکانمان مانا نەکردۆتەوە و لە لایەکی ترەوە گوێگرەکانمان وەها بدرێنە قەڵەم کە گوایە باش گوێ بۆ وتارەکان ناگرن، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشا، جارێکی تر ئەڵێین: تاپۆ بە تارمایی و هەیکەلێ کەم دیار و نائاشکرا ئەگوترێ؛ وەك ئەمە کە ئەڵێن تاپۆی کەسێك لە تاریکی شەوا دیار بوو، واتە هەر ئەوەندە بوو کە ئەزانرا ئەم هەیکەلە ئادەمیزادە، بەڵام روون نەبوو کێیە و رواڵەتی چۆنە. ئەمە مانای تاپۆ. بوومەلێڵیش، تێکەڵە لە دوو وشەی بووم و لێڵ. بووم هەر ئەو وشەیە کە لە نێوان کوردی و فارسیا هاوبەشە و هەر دووك زمان بە وڵات و هەرێم و سەرزەوی ئەڵێن بووم. لە فارسیا ئەگوترێ: «بومی» یا «مەرزوبووم». بوومی واتە خەڵکی هەرێمێکی تایبەت. پێتی «ی»ی دوایی وشەی بووم، «یا»ی نسبەتە. مەرز و بوومیش واتە سنوور و وڵات. لە کوردیا ئەگوترێ بوومەلەرزە کە بە فارسی زەمین‌لەرزەی پێ ئەگوترێ. واتە لەرزینەوەی زەوی. هەڵبەت لە کوردیا بوولەرزەش ئەڵێن کە هەر بە مانای بوومەلەرزەیە.

دەچینە سەر وشەی لێڵ و لام وایە پێویست بە کوتن ناکا کە لێڵ بە مانای کەدیرە، واتە ناسافی و تەمگرتوویی. بەڵام رایتە و پێوەندی ئەم دوو وشەیە بە یەکەوە چییە؟ ئەمە شتێکە کە حاڵەتێکی تەجەرڕودی و ئینتزاعی هەیە. واتە مەفهوومێکە کە نووسەری بەرنامەکە لە بەرچاوی گرتووە و پێویست ناکا لەگەڵ لێکدانەوەی تاکە تاکەی گوێگرەکاندا یەك بگرێتەوە. نووسەری بەرنامەکە هەیکەلێکی تەمگرتووی نیوەدیاری لە تاریك و روونی بەیانیا راگرتووە و لە کارگای زێهنی خۆیا مەبەست و واتە و مەفهوومێکی داوە بەم هەیکەلە. رەنگە مەبەستی ئەمە بووبێ کە ئەم هەیکەلە موناسەبەت و لەیەکچوونی هەیە لەگەڵ وێژە و هونەری جادووکارانە و غەیرە سەریحی وێژەوانیا. هەر دووکیان لە وزووح و ئاشکرایی دوورن. هەردووکیان وێنەی خەیاڵ ئەدەن و بیری مرۆڤ ئەبزوێنن. ئاخۆ ئەم هەیکەلە نیوە دیار و دوورە لە دەسەڵاتی

هەرێمی پرشنگ و نوورە، کێیە و چییە کە لە ناو تەم و مژی بەربەیانێکی نیوەتاریکا وەستاوە؟ ئەمە هەیکەلی وێژەوان و شاعیرە؟ ئەم بوومەلێڵە جیهانی پڕلە ئیما و ئیشارە و ئیستعارەی شێعر و ئەدەبە؟

گوتم رەنگە نووسەری بەرنامەکە وەهای لێکدابێتەوە، ئێوەش بە ناوی گوێگری بەرنامەکەیفی خۆتانە ئەم لێکدانەوەیە وەربگرن، یا لە سەردێری بەرنامەکە بە گوێرەی بەراورد و لێکدانەوەی خۆتان شتێکی تر ساز بکەن.

لە مهابادەوە گوێگرێکی خۆشەویست کە ناوی خۆی بە تەواوی نەنووسیوە، نامەیەکی بۆ نووسیوین و پرسیاری کردووە: «ئاخۆ کاتی وێژەی ژنانە تەواو نەبووە و لە سەر نووسەر پێویست نییە لە سەردەمێکا کە مرۆڤایەتی کەوتۆتە بەر هێرشی هەزاران مەترسی لە نووکی خامەکەی وەك شمشێرێکی تیژ، نەك چەشنی هودهودی سولەیمان، کەڵك وەرگرێ؟» ئەم گوێگرە بەرێزمان کە لە ژێر نامەکەیا دوو پیتی «م.ع» بەرچاو ئەکەوێ و هیچی تر، لە ناو دوو پەرانتێزا نووسیویە:

«مەبەست لە هود هودی سولەیمان، مەزهەری دڵداری و حەزلێکارییە و ئەم باڵدارە وەك ئەڵێن نامەی سولەیمانی بردووە بۆ بەلقیس و ئەگەر نووسەریش بە خامە و نامە هەر کارەکەی هودهود بکا ئیتر نووسەر نییە، دەڵاڵە».

لە وەڵامی ئەم گوێگرەدا ئەبێ بڵێین کە ئێمەش لامان وایە دەوری ئەو جۆرە وێژەیە کە تەنیا هاڵەی حەزلێکاری و دڵداری بێ، بە سەر چووە. بەڵام لامان وایە ناونانی وێژەی دڵداریانەی رووت بە وێژەی ژنانە، نە جوانە و نە پڕبە پێستە. چونکە ئێمە ئەمڕۆلە ئێرانا ئافرەتی زۆر گەورەمان هەیە کە لەگەڵ ئەوەشا گیانی ناسکی ژنانە لە نووسراوەکانیاندا خۆی ئەنوێنێ، نووسراوەکانیان لانی کۆمەڵایەتییەکی هەرە بەهێزیان هەیە، وەك «فرووغی فەرروخزاد»ی خوالێخۆشبوو. جگەلەمەش کاتێ کە ئەڵێن ئەمڕۆ قەڵەمی نووسەر شمشێرە، مەبەستیان ئەمە نییە کە خامە ئەکرێ بیکەی بە چاوی

دوژمنا، دوژمنێ کە بێگومان بە کەرەسەی قورسی شەڕەوە دێتە مەیدان. مەبەست ئەمەیە کە ئەم شمشێرە ئەتوانێ سەری دوژمنێ کە بریتییە لە ناحەزی و دزێوی ناو کۆمەڵی ئینسانی پەڕێنێ و سپای بێداد و تاوان تێکبشکێنێ. ئاخۆ کاك «م.ع» لایان وا نیە کە بەشەری سەردەمی ئێمە لەم بارەشەوە زۆر ئازار و ئێشی پێگەیشتووە کە ئیتر ناتوانێ وەك پێشوو لە مانای وشەی بەرزی خۆشەویستی تێبگا، ناتوانێ کەسێکی پڕ بە دڵ خۆش بوێ؟! ئاخۆ ئەگەر ئادەمیزاد ئەتوانێ ئاسایی ترین و لەدڵنزیکترین خۆشەویستی کە بریتییە لە خۆشەویستی دوو کوڕو کچی لاو تێبگا، ڕوونتر بڵێین ئەتوانێ کەسێکی خۆش بوێ چۆن ئەتوانێ هەموو کەسی خۆش بوێ؟!

حەز لێکردن و دڵداری و خۆشەویستی نێوان دوو ئینسانی ژن و پیاو ئەگەر تێکەڵ نەبێ لەگەڵ نزمی، تاقیکارییەکە بۆ خۆشەویستییەکی گەورەتر بە ناوی خۆشەویستی بەشەرییەت.

کاك «م.ع» دڵنیا بێ ئەگەر نووسەر بتوانێ خۆشەویستی بەرەو مەرگ زیندوو کاتەوە، ئەو کارەی کردووە کە «عیسا» لەگەڵ «لازار»ی مردووی کرد. واتە کاری نووسەر ئەبێتە بووژاندنەوەی بەهار و گوڵ و سەوزایی و هیوا، نەك دەڵاڵی، وەك گوێگری بەڕێزمان نووسیویەتی و با برای خۆشەویستمان لەمەش دڵنیا بێ ئەگەر کەسێك ئەتوانێ مووسیقای دەنگی ئافرەتێك و لار و لەنجە و نیو نیگای چاوێکی کەژاڵی پێ جوان و خۆش بێ، بێگومان ناشتوانێ لە هەرێمێکی گەورەترا ئەویندار[ی] جوانی و مرۆڤایەتی بێ.

تا بەرنامەیەکی تر هەمووتان بە خوای گەورە ئەسپێرین. ئەم کاتە و هەموو کاتێکی ژیانتان خۆش.

ڕەزبەری ١٣٥٢

•

# «روودەکی» مامۆستای مەزنی شێعری فارسی

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ.

ئەبووعەبدوڵڵا جەعفەر کوڕی محەممەد کە نازناوی روودەکی بووە، یەکێکە لە شاعیرانی پایەبەرزی ئێران و بێگومان هەوەڵ کەسێکە کە شێعری فارسی پتەو کرد و توانی لە ناو وێژەدۆستانا پەرەی پێ بدا. روودەکی مامۆستای گەورەی شێعری فارسی لە ساڵەکانی ناوەڕاستی سەدەی سێدا لە ئاواییەك بە ناوی روودەك کە لە هەرێمی سەمەرقەندا هەڵکەوتبوو، لەدایك بوو. هەر بە ناوی ئەو ئاوایییەوە پێیان کوتووە:

روودەکی، واتە خەڵکی روودەك.

هەموو تەزکەرەنووسانی ئێرانی لەم بڕوایەدان کە هەر بە منالی وریا و زرەنگ بووە. عەوفی، نووسەری پەڕاوی «لباب الالباب» لە پەڕاوەیەکا ئەنووسێ: «کە روودەکی لە تەمەنی هەشت ساڵییا بە تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە و شێعری باشیشی هەڵبەستووە.» نووسەری «لباب الالباب» هەروەها ئەڵێ: «کە روودەکی خاوەنی دیمەنێکی جوان و دەنگێکی خۆش بووە و لای «ابوالعبك» کە مووسیقارێکی بەناوبانگی ئەو سەردەمە بووە، لێدانی چەنگ فێر بووە.»

رودکی چنگ برگرفت و نواخت

باده پیش آر کە سرود انداخت

ئەمیر نەسری سامانی، ئەمیری ئەدەبپەروەر و هونەرناس و نیشتمانخۆشەویست، کاتێ ناوبانگی روودەکی بە گوێ ئەکا، ئەنێرێ بە شوێنیا و ئەیباتە دەرباری خۆی و لە دەرباری ئەوا روودەکی بەرێز ئەگیرێ و ئەبێتە گەورەی شاعیرانی ئەمیر نەسر.

سەبارەت بەم مەبەستە کە روودەکی بە کوێری لەدایك بووە یا پاش ماوەیەك ژیان، کوێر بووە، بیر و بڕوای جۆربەجۆر لە ناو وێژەناساندا هەیە. هەندێك ئەڵێن کە روودەکی زگماك کوێر بووە و بڕێکی تریش لایان وایە کە پاش ماوەیەك ئەو شاعیرە گەورەیە، چاوی نابینا بووە. عەوفی لەو کەسانەیە کە لای وایە روودەکی کوێری زگماکی بووە و ئەڵێ: «روودەکی شاعیری دڵ رووناك، ئەوەندەی هەناوی رۆشن بوو چاوی تاریك بوو و هەرگیز چاوی بە هەڵاتنی مانگەشەو و پشکووتنی گوڵ نەکەوت، لە کاتێکا لە هەزار شاعیری چاو رووناك باشتر بە تانوپۆی جوانی سروشتا چووە.» نووسەری مێژووی سیستان، سەممانی و نیزامی و عەرووزی هیچکامیان نیشارەیەکیان بەم مەبەستە نەکردووە کە روودەکی کوێر بووە یام نە. هەڵبەت ئەمەی کە روودەکی چاوی بەسترابێ و نەیتوانیێ جیهانی رۆشن ببینێ لە رێز و هێژایی ئەو شاعیرە گەورەیە

کەم ناکاتەوە. چونکە ئێمە ئەمڕۆ کاتێ باسی هونەرمەندێکی رابردوو ئەکەین کارمان بە سەر ڕواڵەت و ئەندامیەوە نیە، کەلەپووری هونەرمەند بۆ گەلەکەی و بۆ ئەو کەسانە کە پاش مەرگی ئەو دێنە جیهانەوە، شوێنەوارە؛ کە لە توێی پەڕاوەکانیدا و لە ناو خولقاوەکانی مێشك و بیریا ئەبێ بۆ دۆزینەوەی بگەڕێین. شاعیرێکی ئێرانی ئەڵێ:

در سخن مخفی شدم مانند بو در برگ گل

هر که دارد میل دیدن در سخن بیند مرا

واتە لە ناو وتاری خۆما شاراوەمەوە، هەروەك بۆنی گوڵ لە ناو پەڕەی گوڵا. کەسێك کە ئەیەوێ من ببینێ لە ناو قسەکانما ئەمدۆزێتەوە.

ڕوودەکی لە دەرباری ئەمیر نەسرا جگە لە شاعیری، مونس و هاودەمی ئەمیریش بوو. بە پەنجەی سیحراوی کاتێ تەلی چەنگی ئەهێنا لەرین و هەزار ئاهەنگی خەیاڵاوی لێ‌هەڵەساند و بە دەنگی وەك خوڕەی ئاوی جۆبار، شەپۆلی ئەخستە سەر هەوای کپی زەوقی دانیشتووانی کۆڕی بەزم و ئاهەنگ، ئەمیر نەسر فەرمانی ئەدا کۆشی پڕ کەن لە زێڕ. ئەم مەبەستە شیاوی سەرنج‌دانە کە لە ئێراندا شاعیرانی دەربارەکان زۆر خزمەتی گەورەیان بە خەڵك کردووە و بە شێعری جوان، ناحەزی ڕق و تووڕەیی دەسەڵاتدارانیان لابردووە. لەو دەربارانەدا کە شاعیر و هونەرمەند و زانا زۆرتر هەبوون زەوقی ئەمیران نەرمتر و ئاگری تووڕەیان دامرکاوتر بووە. تەنانەت زۆر شاه و ئەمیری وا لە ئێرانا هەبووە کە خۆی شاعیر و وێژەوان و هونەرمەند بووە؛ بەڵگەی هەرە گەورە بۆ ئەمە کە شاعیران و زانایان کاریان کردۆتە سەر هەستی شایان و بەدەسەڵاتان، بنەماڵەی مەغوولە. ئەزانین کە ئەو بنەماڵەیە لە سەردەمی چەنگیزا چ کوشتارێکی بێ‌بەزەییانەیان لەگەڵ ئێران کرد. پاشان بەهۆی تەئسیری زانایان و شاعیرانی ئێرانییەوە چۆن بە واتەی سەعدی خووی پڵنگانەیان وەلا نا و پیاوی وەك «بایسونقور» و «خودابەندە» و «غازان خان»یان لێهەڵکەوت کە هەرکام لە بارێکەوە خزمەتیان کرد.

بنەماڵەی سامانی ڕەگەز ئێرانی بوون و یەکەم بنەماڵە بوون کە گەلی ئێران پاش دووسەد و پەنجا ساڵ دیلی، هیوای خۆی بەوانەوە بەستبوو و چاوەڕوان بوو لە ژێر ئاڵای ئەو بنەماڵەدا سەربەخۆیی دۆڕاوی بێتەوە دەست. لە سەردەمی ئەو بنەماڵەیەدا بوو کە شێعری فارسی بە چەشنێکی پتەو سەرەتای دامەزرا و هونەر و هەموو نیشانەیەکی تری شارستانیگەری تایبەتی ئێران بووژایەوە. شێوەی خوراسانی لەو سەردەمەدا لە وجوودی شاعیری وەك روودەکی بەهرەمەند بوو. هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەبی ئەڵێن کە هیچ کام لە شاعیرانی پێش ئەو و پاش ئەو بە ئەندازەی ئەو شێعری نەکوتووە. یەکێ لە شاعیرانی هاوسەدەی روودەکی ئەڵێ:

شعر او را برشمردم سیزده ره صدهزار

هم فزون آید اگر چونانکه باید بشمری

واتە شێعری ئەوم ژمارد، کردێ سێزدەجاری سەد هەزار و ئەگەر باشی بژمێری لەوەش زۆرتر ئەکا. سێزدەجار سەدهەزار ئەکا ملیۆنێك و سێسەد هەزار.

ئەگونجێ ئەم ئەندازەیە کەمێك لە بڕواکردن دوور بێ، بەڵام بەڵگەی ئەمەیە کە روودەکی بەرهەمی گوڵزاری زەوقی زۆر بووە و دەریای دەروونی پڕ بووە لە گەوهەری هێژای شێعر و وتاری ئاهەنگداری جوان.

وەك لە شێعرەکانی روودەکی دەرئەکەوێ تەمەنێکی درێژی هەبووە. تەمەنێکی درێژی بە بەهرە و بار کە لەوا خزمەتێکی زۆری بە وێژە و ئەدەبی ئێران کردووە. هەر ئەو ژمارەش کە ئەمڕۆ لە شێعرەکانی ماوەتەوە، ئەندازەی خزمەتی روودەکی دەرئەخا. خۆی سەبارەت بە پیری خۆی لە غەزەلێکا ئەڵێ:

مرا بسود و فروریخت هر چه دندان بود

نبود دندان، لا، بل، چراغ تابان بود

سپید سیم زده بود و دژ مرجان بود
ستارهٔ سحری بود و قطره باران بود
تو رودکی را ای ماهرو کنون بینی
بدان زمانه ندیدی که این چُنینان بود

بەم شیعرەدا دەرئەکەوێ کە روودەکی بە لاوەتی رواڵەتێکی جوانی هەبووە و ئەوەی وا عەوفی سەبارەت بەم باسە کوتوویە، راستە.

لەم بارەدا کە وتاری روودەکی لە گیانی ئەمیری سامانییا تەئسیری زۆر بووە، داستانێك ئەگێڕنەوە و ئەڵێن: ئەمیر ماوەیەکی زۆر لە بوخارا دوور بوو. سپاکەی هەموو بیری ژن و ماڵ و منالیان کەوتبووە سەر، بەڵام هیچکەس نەیئەوێرا بە لای ئەمیرەوە باسی گەڕانەوە بکا تاکوو ناچار پەنا ئەبەن بۆ روودەکی و ئەویش پارچە هەڵبەستێك لە تاریفی بوخارادا ئەڵێ و لە کاتێکا ئەمیر سەرخۆشە بۆی ئەخوێنێتەوە. پارچە شیعرەکە بەم شیعرە دەس پێئەکا:

بوی جوی مولیان آید همی
یاد یار مهربان آید همی
شاه سرو است و بخارا بوستان
سرو سوی بوستان آید همی
شاه ماهَست و بخارا آسمان
ماه سوی آسمان آید همی

ئەڵێن پاش خوێندنەوەی ئەم شیعرە، ئەمیری سامانی بە ئەندازەیەك هەوای بوخارای ئەکەوێتە سەر کە دەسبەجێ دەستوور ئەدا سپا بەرەو بوخارا بکەوێتە رێ.

لێرەدا بەرنامەکەمان دوایی هات. تا بەرنامەی داهاتوو خواتان لەگەڵ.

# داخوا «رووده‌کی» یه‌که‌م شاعیری فارسه ؟

سه‌لام له گوێگری به‌هه‌ست و هونه‌رپه‌روه‌ستی به‌رنامه‌ی تاپۆ.

گوێگرێکی به‌ڕێز پرسیاری کردووه که باشتر نییه له‌باتی ئه‌و هه‌موو جیاوازی بیر و بڕوایه که له نێوان مێژوونووسانی ڕۆژمدا په‌یدا بووه و هه‌ر کام سه‌باره‌ت به هه‌وه‌ڵ شاعیری ئێران شتێکیان نووسیوه و که‌سێکیان هه‌ڵداوه، راست و ڕه‌وان رووده‌کی به هه‌وه‌ڵ شاعیر دابنێین و خۆمان له‌م هه‌رایه رزگار که‌ین. ئه‌و گوێگره پاشان داوای کردووه که ئێمه بۆی روون که‌ینه‌وه که ئایا رووده‌کی هه‌ر له منداڵیه‌وه چاوی نه‌دیوه یا

پاشان چاوی بەستراوە. نووسەری بەرنامەکە بەم چەشنە وەڵامی ئەداتەوە و هاوکاریەکی ترمان پێشکەشی ئەکا.

راستە کە ئەمە هەڵەیە هەوەڵ کەسێك کە تەنیا شێعرێك یا تەنانەت نیوە شێعرێك هەڵبەستێ لە مێژووی وێژەدا بە هەوەڵ شاعیر بدرێتە قەڵەم، وەك بەهرامی گۆڕ کە ئەڵێن کوتوویەتی:

منم آن شیر دمان و منم آن پیل یلە       نام من بهرام گور و کنیتم بوجبلە

کە هەڵبەت کەمێك جێگای گومانیشە کە ئەم هەڵبەستە هی بەهرام بێت. یا وەك کوڕی یەعقووبی لەیس کە لە یاری منالانەدا کوتی: «غلطان غلطان همی رود تا لب گور».

ئەمانە و کەسی تری وەك ئەمانە ناتوانن هەوەڵ شاعیر بن. جگە لەمەش ئەگەر بچینەوە بناوانی کارەکە بۆمان دەرئەکەوێ کە هەوەڵ شاعیر، هەوەڵ ئادەمیزادێك بوو کە توانی وشە بە زمانا بهێنێ. ئەوەی کە کێ هەوەڵ شاعیر بوو و کام هەڵبەست یەکەم هەڵبەست بوو با بمێنێتەوە بۆ ئەو کەسانە کە مامۆستای ئەو کارەن و لە راستیا بێکارن! بەڵام ئەوەی کە فەرموویانە راست و رەوان روودەکی بە هەوەڵ شاعر دائەنێین، ئەمەش هەڵەیە. چون پێش ئەو ئەبوو شەهید و حەنزەلەمان بووە و شاعیری باشیش بوون. راستە کە حەنزەلە تەنیا دوو شێعری لە تەزکەرەکانا ماوەتەوە و دیوانی نیە، بەڵام هەر ئەو دوو شێعرە نیشانەی دەسەڵاتی ئەوە لە هەرێمی شاعیریدا، بە چەشنێ کە خەربەندەیەك بە خوێندنەوەی ئەو دوو شێعرە وا هان ئەدرێ کە تێئەکۆشێ و ناوەستێ تا ئەگا بە پلەی ئەمیری. ئەم دوو شێعرە کە بۆتان ئەخوێنینەوە تەنانەت ئەمڕۆش نوێ و ئەشەمزاون و ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی باشیان لێ دەرئەکەوێ. حەنزەلە ئەڵێ:

مهتری گر بەکام شیر در است       شو خطر کن ز کام شیر بجوی

یا بزرگی و عزّو نعمت و جاه       یا چو مردانت مرگ رویاروی

بەڵام سەبارەت بە روودەکی، ئەبوو عەبدوڵڵا جەعفەر کوڕی محەممەد کە نازناوی

روودەکی بووە یەکێکە لە شاعیرانی پایەبەرزی ئێران و بێگومان هەوەڵ کەسێکە کە شێعری فارسی پتەو کردووە و لەناو ویژەویستانا پەرەی پێداوە. روودەکی مامۆستای گەورەی شێعری فارسی لە ساڵەکانی ناوەڕاستی سەدەی سێ لە ئاوایێك بە ناوی «روودەك»ی سەمەرقەندا لەدایك بووە و بەم بۆنەشەوە پێی کوتراوە روودەکی. ئەو شاعیرە بە واتەی عەوفی، نووسەری پەڕاوی «لباب الالباب» ئەوەندە هۆشیار بووە کە لە تەمەنی هەشت ساڵیا تەواوی قورئانی لە بەر بووە و شێعری باشی کوتووە. هەر «عەوفی»یە کە ئەنووسێ دیمەنێکی جوان و دەنگێکی خۆشی هەبووە و لای «ابوالعبك» کە مووسیقارێکی ناسراوی ئەو سەردەمە بووە لێدانی بەربەت فێر بووە و ئاوازەی ناوبانگی بە هەموو وڵاتا بڵاو بۆتەوە و «ئەمیر نەسری سامانی» کە ئەمیری خوراسان بووە بردوویەتە لای خۆی. سەبارەت بەم باسە کە روودەکی بە کوێری لە دایك بووە یا پاش ماوەیەك بینایی لەدەس داوە، بڕوای جۆربەجۆر هەیە. «عەوفی» لای وایە کە هەر بە منالی و کاتی لەدایك بوون بە چاوی بەستراوەوە هاتۆتە دونیا، بەڵام سەمعانی و نیزامی عەرووزی و نووسەری مێژووی سیستان، هیچکام ئیشارەیەکیان بەم مەبەستە نەکردووە. لە روانگەی ئاوەزیشەوە سەلماندنی ئەمە کە روودەکی کوێری زگماك بووبێ کەمێك دژوارە. عەوفی لە پێش ئەوەدا کە بنووسێ روودەکی چاوی نەیدیوە، ئیشارەی بە دیمەنی جوانی ئەو شاعیرە کردووە و ئەمە کەمێك سەیر دێتە پێش چاو کە عەوفی بە تانوپۆی جوانی رواڵەتی شاعیرێدا چووبێ کە جوانترین ئەندامی دەم و چاو و روخساری ناقیس بووە. جگە لەمەش ئەو هەڵدان و پێهەڵکوتنەی تەبیعەت و جوانی ئافرەت و دیمەنە، کە لە شوێنەواری «روودەکی»دا هەیە، نابێ هی کەسێك بێ کە هەرگیز بە چاو ئەو جوانییانەی نەدیبێ. لە باسی پیری خۆیا ئەڵێ:

مرا بـــود و فـروریـخـت هـر چـه دندان بود
نـــەبود دنـــدان لا، بَـل چـــراغ تـابـان بـــود
سـپـیـد سـیــم زده بـود و دڕّو مــرجـان بـود
سـتـارۀ سـحـری بـود و قـطـره بـاران بـــود
تـو رودکـی را ای مـــاهــرو کـــنـون بـیـنـی
بدان زمـالـه لـدیـدی که ایـن چُـنـیـنـان بـود

کەسێك کە بەم مامۆستایی و ناسکییە باسی سەدەفی ددان و دوڕو مەرجان و ئەستێرەی بەیان و دلۆپەی باران بکا، ناکرێ جوانی تەبیعەتی بە چاو نەدیبێ.

روودەکی مووسیقارێکی باش بووە و دەنگێکی خۆشیشی هەبووە و چەنگی باش لێداوە. چەنگ کەرەسەیەکی مووسیقای تایەتی ئێرانییە و لەبەرئەمە کە خوار بووە و بە مزراب لێدراوە پێیان کوتووە چەنگ. ئێستەش لە برێ شوێنی کوردستان بە شتێك کە خوار بێ ئەڵێن چەنگە. لە شوێنەواری شاعیرانی سەردەمی روودەکی دەرئەکەوێ کە ئەو شاعیرە چەنگی باش لێداوە. شاعیرێك ئەڵێ:

رودکـی چـنـگ بـرگـرفـت و نـواخـتـبـاده پـیـش آر کـو ســرود انـداخـت

لەم شێعرە هەم چەنگلێدان و هەم دەنگخۆشبوونی روودەکی دەر ئەکەوێ. جگە لەم هونەرانە لە شاعیریشا، روودەکی لە سەردەمی خۆیا بێهاوتا بووە. عونسوری، شاعیری گەورەی دەرباری غەزنەوی ئەڵێ:

غـــزل رودکـــیوار نـــیـــکـــو بـــۆد غـــزلهـــای مـــن رودکـــیوار نـــیـــســـت

روودەکی زەوقێکی بەجۆشی هەبووە و دیوانەکەی یەکجار زۆر بووە و وا دەرئەکەوێ کە دیوانەکەی لە سەردەمی خۆیا بە دەستەوە بووە. یەکێ لە شاعیرانی تری شێوەی خوراسانی سەبارەت بە ژمارەی شێعرەکانی روودەکی لە پارچە شێعرێکا ئەڵێ:

شعر او را بر شمردم سیزده رەصد هزار

هم فزون آید اگر چونانکه باید بشمری

سێزدەجار سەد هەزاری ئەکا یەك ملیۆن و سێسەد هەزار. هەڵبەت ئەم ژمارەیە یەکجار زۆرە و لە بڕوا بە دوورە کە شاعیرێك بتوانێ ئەم هەموو شێعرە هەڵبەستێ ئەویش شێعری وەها ماموەستایانە.

ئەمرۆ دیوانەکەی لە سێ چوار هەزار شێعر، تێناپەڕێ و ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ ئەمە کە ناکرێ لە یەك ملیۆن و سێسەد هەزار شێعر، تەنیا سێ هەزار شێعر مابێتەوە. هەرچی بێ بەلای منەوە چەندایەتی شوێنەواری هونەرمەند زۆر گرینگ نییە، ئەوەی وا گرینگە چۆنییەتی شوێنەواریەتی.

تا بەرنامەی داهاتوو هەمووتان بە خوای گەورە ئەسپێرین.

# بەهاری دڵداری

ئەم پەخشانەی خوارەوە باسی بەهاری دڵداری و جیهانی ڕەنگاوی ئەکا، ئەو جیهانە کە لە هەرێمی دەستەڵاتیا هەرگیز شەو دانایە و گوڵی گەشی هەرگیز بە گەڵاریزانی پاییزیی ناژاکێ و سیس نابێ؛ سکاڵای ئەوینی لاوێك، سکاڵایەك کە چەشنی زایەڵەی دوورەدەستی دەنگی شمشاڵێکە لە بەرەبەیانییەکی زرنگاوەدا، یا چپەی پۆلی پەریانە لە کۆڕی جێگا کۆنەکانا.

چی بڵێم بەم دڵە کڵۆڵەم کە چەشنی کۆتری گیراو خۆی بە قەفەسی سینەمدا ئەدا... چۆن ئەو ڕازە کە سێ ساڵ وەك گەنجێکی هێژا لە کەلاوەی خاپوور و چۆڵی دڵما ڕامگرتووە، بە لاتەوە بیدرکێنم، ئاخۆ وشە و دەم و لێو مەحرەمی دڵن؟ ئایا ئەم هەوایە لە نێوان دەمی منەوە تا گوێی تۆ ئەوەندە ڕازدارە کە من وەك ماری سەرگەنج پاسەوانی ئەم نیازە بەتین و خۆشەویستییەی پێ بسپێرم. بریا و سەت بریا دڵ ئەبوو بە ڕشتێکی بێرەنگی بێسنوور، سەرێکی لە هەرێمی خونکاری شەوەوە دەستی پێ ئەکرد و

ئەو سەرەکەی لە سووری رۆژا ئەبرایەوە تا من بتوانم ئەو هەموو تاسەیە لە دڵما جێ بکەمەوە و هەرگیز ناچار نەبم بە دەربڕینی ئەوینم، هێمنی و مەندی گۆمیلکەی چاوە جوانەکانت بشڵەژێنم و خەوی خۆشی پرشنگی چاوت کە ئەڵێی ماسی زەرد و سووری دەریای ئارامە بشێوێنم.

جارێك ئەمە یە ئاواتم، جارێکی تریش ئەڵێم بریا دڵ لەمەش کە هەیە کەمتر ئەبوو تا گەرمتر وێنەی روخساری شکۆداری پاکت تاسەی هەرگیز نەشکاوی بیرەوەری لە باوەشی دڵ بنێ.

ئەمە شێیە، بەڵام باوەڕ کە با ئەو هەڵۆ بەرزە کە ئەوینی پیاوانەی منە، شوێن باوێ و دە تیشکی خۆرەتاو کەوێ. هەڵۆی بەرەو بەرزی تا ئەو جێگایە پەڕو باڵی بە تینی خۆرەتاو نەسووتێ و هەوری سپی وەك کفن و خەڵات لە دەورەی لەشیەوە ئەپێچرێن.

کوتم نا! با ئەو بێدەنگییە نەشکێنم، با هەرێمی سپی و بێگەردی خاموشی بە تیغی تیژی وشە هەڵنەبڕم، با بسووتێم، ئەڵێم دەردەدار و ئەویندارم، بەڵام تا کەی...؟ دەرد و دڵ داستانی شووشە و بەردە... تا کەی بە یەکەوە ئەسازێن...؟

جەرگی کونکونی خوێنئەڵێن بە چ زمانێك تێگەیێم کە چەشنی بلوێر بلوێرێتەوە...؟

پیاڵەیەك بوو لیوانی شەرابی خەم لە دەستم کەوتە سەر زەوی و بوو بە هەزار کوت... ئەمە ناڵە بوو، ناڵەی دەردەدارێك بوو کە ناچارە بناڵێنێ تا دەردی سووك کا....

بیووره خۆشەویستەکەم ! نەمتوانی خۆم بگرم، دڵم گوڵێك بوو پەنگی خواردەوە پەژارە و سەرریژی کرد، ئەمە هەوەڵ دڵۆپی ئەم سێڵاوە بوو کە لە دڵم هەڵقوڵی و بە گۆزنگەی لێوما هاتە خوار؛ بە خۆم نەبوو کە نووسیم، خۆشم ئەوێی!

لەمە شەرمەزار و پەشیمان نیم کە پریسکەی دڵم لای تۆ کردەوە، ئەترسم هیوایەکی نادیاری بێرەنگ کە رەنگ و واتەی ئەدا بە ژیانم وەك چرای شەوبێداریکی هەژار لە تاقچەی سینەما بکوژێتەوە؛ ئەترسم نەکا چەپکەگوڵی هەستی ناڵم کە بە خەیاتەی خاوی شێعر و خەیاڵم هۆنراوەتەوە بە دیاری وەرنەگری؛ سێ ساڵ، سێ ساڵ لێدانی بێ‌وچانی دڵ؛ شەوانی تا بەیانی لە بیرا بە سەر چوو، رۆژانی تا شەو بە هیواوە تێپەڕیو، برستی میان بڕی، وەك گەنجێکی کەم تەمەن شەرم و شکۆ دایگرتم و گوتم: خۆشم ئەوێی... بێدەنگ بوو. چۆن بڵێم کە ئەم بێدەنگییە کەم‌خایەنت چی بەسەر من هێنا؟

لایەکم بەهار بوو بە هەزار گوڵی ئاڵ و واڵاوە، بە هەزار مەلی دەنگخۆشی بە جیلوەوە، لە لایەکی ترم زستان زەمهەریر بوو بە سۆزی لەش ترسێنی، تین فڕێنی هەزار لوورەی با و کرێوەوە، ئەترسام زیاتر لەم بێدەنگییەدا ئازارم بدەی، خەریك بوو هاوار بکەم و بڵێم دەرگای گوڵزاری دەمت بکەوە تا هەناسەی زیندووکەرەوەی مەسیحایی بهاژێتە گیانم، بەڵام دەخیلت بم هیوای سێ ساڵەی دڵێکی گەنج بە بادا مەدە، تۆ کە گیانی نەرم و هێمنی دڵی ناسکت نەهات ئەم پەپوولە ئەویندارە کە بە هەزار هیواوە بەسەر پای گوڵی دڵتەوە نیشتوو بتارێنی؛ ئیستێ ئەی رەمزی هەستی وا بەهار و ئەوین و جوانییە. هەر وەك لە پاڕانەوەکەما گوتم ئەتوانی بمخەیە بەر سێڵاوی رەشی شەوگاری درۆ کرو ئەشتوانی دەستم بگری و بمبەیە مەڵبەندی بە گوڵ خەملیوی پرشنگ و شادی. ئەمەش بزانە کە ئەگەر وەڵامت هەرچی بێ، ئەگەر موژدەی بەختەوەری بێ یا شەقڵ‌بوونی هیوابڕاوی، پەرژێنت بە گوڵی ئەوینی من تێکناچێ، من هەر ئەو شەیدایەم کە بووم، شەیدایەکی بەختەوەر، ئەگەر بڵێی ئەرێ بە شەیدایەکی چارەرەش، ئەگەر بڵێی نا، لێم گەڕێ، بەڵام سوێندەت ئەدەم بەو چاوە جوانانەت لە ئاگری دوودڵییا مەمهێڵەوە.

# دیمەنی بەفر و زستان

سروشت لەم زستانەدا بە بەرگی سپی ئاوداوێنی بەفر خۆی رازاندۆتەوە بۆ هەر لایەك ئەڕوانی خێوەتی سپی هەڵدراوە. بەفر پیتە، بەهرەیە بۆ کانیاوی مووچە و مەزرای جووتیاران، داینکەری نیازی کشتوکاڵە و لە راستیا بەفر هۆی شینایی و شیناوەردە.

کلووی بەفر کاتێ لە سەر سەکۆو کورسی گەرم لە پشت پەنجەرەوە سەیری کەی، روانگە و دیمەنێکی جوان دەخوڵقێنێ، بەڵام کرێوەیەك کە سەر لە رێبوار ئەشێوێنێ و تەنانەت بەرێتی خۆشی نابینێ، ناتوانێ بۆ ئەو رێبوارە، رێ هەڵەکردووە شتێکی باش بێ و ئەو سەرمایە کە هەرگیز روو ناکاتە کەناری دەوڵەمەندان، بە لای ئەو منالە بێبەرگ و رەش و رووتانەوە کە لە ناو ماڵێکی سارد و سڕ و بێ تینا ژیان ئەبەنە سەر، ناتوانێ خۆش و خۆشەویست بێ.

باوکێکی هەژاری دێنشین لە هەموو جیهانا جگە لە کچۆڵەیەك شك نابا، کچۆڵەیەکی تازە پێگەیشتوو، هەموو ئاواتی ئەو باوکە پیرە ئەوەیە کە نازداری کچی بە شوو بدا و لەوەکانی خۆی لە باوەش گرێ و بڕوانێتە بزەی بێ تاوانانەی سەر لێوی سوور

و ناسکیان.

زستان هاتووەو کار و کاسپی لە ئاواییا خەوتووە؛ دێ لە ژێر پێنخەفی سپی بەفردا خەریکی خەوی زستانە.

هەرچی داهاتە لە کشتوکاڵ هاتۆتە دەست، ئیتر کاتی ئەوەیە باوکی پیریش لە داهاتی کەم و کورتی خێزانەکەی، ئەندامی شلك و جوالی نازدار کە بەرگەی سەرمای تووڕەو لەش تەزێنی زستان ناگرێ، پۆشتە کاتەوە. باوك ئەچێ بۆ شار و چاوی چاوەڕوان و جوانی نازدار لە ڕێگایە و هەزار ئاواتی ڕەنگاوڕەنگی کێژانە لە دڵیا شەپۆل ئەبەستێ.

سێ چوار ڕۆژێك بە بێ وچان
کلووکلوو بەفر ئەباری
هەموو وڵات ساماڵــا بوو بە یەگجاری
ئاسمانی ڕەش تاوێك
نەیئەترووکاند چاوێك
بەفر ئەباری... بەفر ئەباری
بستێك، ئەژنۆیەك، ناوقەدێك، باڵاپاوێك،
لەم لاو ئەم لای دێیەکەوە
پەسا پەسا ماڵ ئەڕووخا
هێلانەی هەژار ئەشووخا
نا! نا! ئیتر چ ناڵێم ماڵ
گۆڕی گشتی ژن و منداڵ
سێ چوار ڕۆژ بوو باوکی نازدار
چوو بوو بۆ شار

چوویوو جلی بۆ بسێنێ

کراسی جاو

سەڵتەی بەروپش بەلاشە

نازداری خۆی پێی داپۆشێ رووتی لاشە

ئێوارەیەك چەن تارمایی

تەرمێك لە کۆڵ

ئەیانشکاند بەفر و سەهۆڵ

ملیان ئەنا بۆ ئاوایی

تەرمی کێ بوو؟ تەرمی کێ بوو؟

تەرمی رەق بووی باوکی نازدار

هەی قوڕبە سەر خەڵکی هەژار

ماڵێك دارووخاو

دڵێك پڕزووخاو

ژنێکی فەرتووت

نازدارێکی رووت

بە میرات مابوو بۆ دایکی نازدار!

مەگری مەگری نازداری خۆم

مەگری بەسە.

هەر ئێمە نین

خەڵکی هەژار،

گش بێکەسە

مەگری! مەگری!

چاوەکانم بخەوی باشە.

فریشتەی خەو

بۆی دووری سەڵتەی بەلاشە.

زستان تەواو بوو، خێوەتی سپی بەفر پێچرایەوە، بەڵام ئەو زووخاوە کە زستان و سەرما لە دڵی دایکی نازدار و نازداری خستبوو هەرگیز بە هاتنی بەهار و سروەی بۆنخۆشی لای گوڵزار تیمار نەنەکرا.

زستان ئەبڕێتەوە، پاش سەرما و سۆڵی لەش ترسێن، بۆنی خۆشی گوڵزار ئەهاژێتە دەماری تەیمەتەوە، ئەوە ڕێ و شوێنی دابڕاو و دیاریکراوی ژیانی ئادەمیزادە.

گاهێ لە دنیا بەهارە و گاهێ لە دەروونیا زەمهەریرە، بەڵام ئەو دڵانە وا بە گەرمای خۆرەتاوی ئەوین و هەستی ئەوعەدۆستی داگەشاون، هەرگیز بە سەرمای زستان و بە گەڵاڕێزانی پاییز ناژاکێن، کام دڵ ئەوینداره ئەو دڵە ئەبێتە کوانووی دانەمرکاوی ئینسانیەت.

ئەوین یا هەستی ڕاسپێری ئینسانی، ئاخۆ لەم زستانەدا بێدەربەست لە هۆدەی گەرما سەر ئەنێتە سەر سەرین لە کاتێکدا ئەزانێ کە دراوسێکەیان تەنیا بە دووکەڵی هەناسە و برینی دڵ گەرمی ئەبێتەوە؟! لام وا نیە، چونکە هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە، بە سەر تەرمی ئینسانیەتا بگرین، خۆزگا هەموو دڵێك ڕووگەیەك ئەبوو و ئەکرا نیازی لێ بخوازی و پەنای بۆبەری.

لە کاتێکا مەبەست و واتەی بەرزی ئینسانی ئەکەوێتە ناو، خۆزگا گوڵی ئینسانیەت لە بەهاری ئەمساڵا لەم مەزرای دڵمانا چرۆی دەرئەکرد.

# خەڵکی شاری ئەوینم

هەوا تاریك بوو، هەوەڵ جار بوو کە من بە نوێژی نیوەڕۆ بیرم لەوە دەکردەوە، ئەگەر خۆرەتاو تینی نەمێنێ ئەم سەرزەوییە کە هەزاران ساڵە ئێمەی لە سەر پشتی خۆی سوار کردووە چی بەسەر دێ؟ وڵات یەکپارچە ئەبێتە سەهۆڵ، دار و بەرد و ئاو هەمووی ئەیەستێ و گەرمای ژیان سارد و سڕ دادەمرکێ.

نازانم لەو بیرە ئاڵۆزانەدا گەیشتبوومە کوێ کە بەژنێکی بەرز و کەڵەگەت بە کراسێکی زەردەوە بە لای منەوە دانیشت.

ئەمجا وا تاریك نەبوو، پڕشنگێ کە لە خۆرەتاوەوە ئەهات و ئەکەوتە سەر خارای کراسی ئەو کچە وا لە لام دانیشتبوو، لە سەر کراسەکەی ئەبوو بە هەزار ڕەنگی بە ورشە، تێ‌گەیاندم کە تاو و ساوێکی خۆش خێوەتی هەڵداوە....

چاوم لە جووتێ کەوشی ژنانە هەڵگەڕا بەرەو ژوور، وەك مارێکی ڕەش بەڵەك و تینوو کە بە دارێکی شلك هەڵگەڕێ و بیەوێ لە ناو تورت و تەڕی لکی هەرە بەرزی دارەکە ماندوویی بحەسێنێتەوە، نیگام کەوتە سەر داوێنێکی خاوێن و لەوێ گەیشتە بەر

پشتێنێکی کەم و شل و مل و لە سەر سینەی دو گۆی زێرین، دوو مەمکی قوت کە لە ژێر کراسە زەردەکەوە چرۆی دەرکردبوو وەستا! تاسەی گوشین دڵمی پڕکرد و پاشان نیگای ئەسرەوتووی برسیم راخوشی بۆ گەردنێکی بەرز کە چەنەیەکی خڕو پڕ سێبەری لێکردبوو، وەك سێبەری شەکەت لابەری دارەتوویەکی بەبەرگ و بەر.

ئاسکێك، ئاسکێکی ماندووی رەوەك و سڵ، هێندە بەرچاوە، کە لە گەرمای هاوین رائەکا بەرەو شنەیەکی چیای بژوێن و ئەگاتە پۆلە دودرکێك کە سێبەری رەوەزێك لە باوەشی گرتووە.

نیگای من ئەو ئاسکە بوو کە لە ژێر تووترکێك و مووی تازەهاتووی هەڵەگیراوی لاجانگی کچەکەدا ئارامی گرت؛ دیسانە ئەوا بیرم رۆیشت، بەڵام نەك بۆ دوور و دەر، وەك تیرێك کە کەوانە بکات بەرەو خۆم گەڕاوە و لە جەرگم هەڵچەقی؛ چوومە ناو خۆمەوە و بیرم کردەوە ئەگەر هەموو جیهان بە بەرگ و دارەوە، دەریا و چیا و جەنگەڵ و شار و ئاوایی و چۆڵ و دەشتەوە گیانیان هەبوایە چۆن ئەبوو؟ ئەم کاتە بەیان بزەی خۆی زیاتر ئەرازاندەوە، گوڵ گەشتر خۆی ئەنواند و کۆلکەزێرینە وەك ئەو بەرمووره رەنگاورەنگەی لینەهات کە بەسەر پێستی لووس و پێگەردی گەردنی ئەم کچەوە ئەدرەوشێتەوە. دوو چاوی گەش و رەش گرتیانمە بەر روانین، تا ئەم کاتە نەمدیبوو، روانینێك ئەوندە برستبەزێن و گەرم و تاسەشکێن، ئەتکوت تەمەنێکی درێژە من هەر لەم جێگایە دانیشتووم و ئەو نیگا بەتینە ئاژواوەتە دەماری لەشم؛ ئەتکوت بێ ئەو نیگایە من هیچم، سارد و سڕم، وەك زەوییەك هەرگیز هەتاوی لێ هەڵنەهاتبێ. سەیرە بەڕاستی سەیرە، یارییەك کە گاهێ بزەیەك یا نیونیگایەك یا لەنجەولارێك بە دڵی پیاوی ئەکا، هەر بەم زووە بێ ئەوە بتوانم هۆگری وەك بۆنی گوڵزارێك کە لە پێچگەی بای شەماڵەوە ئەپێچرێ و لە بەر لووتی رێبوار ئەکرێتەوە هەموو دڵمی تەنیوە، هۆگری ئەو شتە کەس ئەبێ باشە و هەبێ خۆشە.

نیگامان وەك دوو ماری عاشقە و ماشقە تێکهاڵاّ، دڵم بە لیدانی بێ‌وچان پەردەی شوورەیی و خۆراگرتنی دری، کوتم لەو ئاوایە غەریبم، بۆ غەریب؟ هیچ شتێ لە تەبیعەتی بێدەنگ و خامۆش ئاشناتر نییە، ئادەمیزاد نامۆیی ئەکەن، بەلاّم سروشت دڵئاوایە و بەخشندە، بێ پرتە و بۆڵە.

پێکەنی و ورشەی ددانی وردی کەوتە سەر لێوی سوور و کچانەی، بە شوێن زەردەکەیا کوتی: «تێتەگەیشتم چیت کوت؟ ئەوەندە ئەزانم کە تەنیا و غەریبی، ئەوەش ئەزانم کە لاوێکی جوانی.» ترسام. لەم چەشنە دووانە ترسام، بەلاّم نەك لە بەر ئەمە کەمێکی گاڵتە تێدا بوو، نا... لەبەر ئەمە هەستم کرد من لە بەرامبەر کچێکەوە دانیشتووم کە بە ساکاری و لەباری و بێدەربەستی وەك شانازیکردن بە پەیکەری ڤێنووس و من وەك دێرینەناسێکی تامەزرۆ کە لە کەلاوەی خاپووری شارە کۆنەکانا لە شوێن عەنتیکەی هونەرییا وێڵە، ناچارم لە بەرامبەر ئەو کچەدا دەست‌بەسینە بوەستم. لەو تاسان و سەرسوڕمانەدا بووم کە لە پڕ لە زمانم هاتەدەر:

«تۆ... تۆڤێنووسی... تۆ پەیکەرەی خوای ئەوین و جووانی...» بە سیلای چاو سەیری کردم و کوتی: «تۆ لە رادەبەدر شەرم ئەکەی وا دیارە کوردیش نازانی؛ لام وایە خەڵکی ئەم شارە دوورانەی کە ئەڵێن، سەریان لەبەر دووکەڵ بە تەمە.»

وتم: «نا، نا، خەڵکی هەرێمی دڵداری و دانیشتووی شاری ئەوینم.»

# روونائ

هەر دەبوو بێدەنگ بم، دەبوو نەنووسم، بەڵام لەو کاتەوە کە دڵم بە دڵی تۆوە پەیوەند کردووە، خۆپەرستی و غرووورم نەماوە، خۆت ئاگات لێیە کە تا ئێستە زۆرم هەوڵ داوە بۆ خۆمت راگرم، هەر کات قسەیەك هاتۆتە پێشەوە و سەرچاوەی روونی ئەوینمان لێڵ کردووە؛ لەگەڵ ئەوەشا من تاوانێکم لە پێکهێنانی ئەم نێوانناخۆشییەدا نەبووە دیسان هەر من دەستی ئاشتیم بۆ لات راداشتووە.

بە گیان و دڵ کڕیاری نازت بووم، گوێم نەداوەتە گرمەی ترسێنەری دێوی غروورێك کە لە دەروونمدا وەخەبەر هاتووە، لەبەر چی؟ چونکە خۆشم ویستووی، تۆش پاش ئەوەی هەستی ناسکی کچانەت دامرکاوە، داوای ئاشتی منت وەرگرتووە و بە پێکەنینێکت هەموو لای رەشبینی و ناهومێدییەکت لە دڵم راماڵیوە. هەموو کچێك خاوەنی هەستێکی ئەوتۆیە، ئەیەوێ بۆ دڵدارەکەی ناز بکا، بتۆرێ و چاوەڕوانە کە پیاو هەنگاوی هەوڵ بۆ ئاشتبوونەوە هەڵگرێ.

ئەم راستەقینەیە کە من باشی تێەگەم، ئەزانی کە هەمیشە هەر من پێشەنگی

ئاشتبوونەوە بووم.

چ پەیمانێکمان بەست؟ چەندمان زەمزەمەی بەهار و ئەوین و دڵداری بە گوێی یەکا چپاند؟ چەند سەعاتی بە شۆر و هەرگیز لە بیر نەچۆومان لە لای یەك بەسەر برد؟ لە بیرتە کە من نەترسام بە جارێ خۆم بسپێرمە دەس گەردلوولی ئەوین؟ چونکە تاڵترین تاقیکاریم لەم بارەوە هەبوو، بەڵام تۆی باش، تۆی خاوێن ناچارت کردم تەسلیم بم، دەروونی من ئامادە بوو، بۆ بانگهێشتی میوانی ئەوین، ئەمزانی کە هەستی من تەنیا لە دوورگەی بەرین و سەوزەڵانی دڵداریا تێەگا و پتەو ئەبێ؛ بەڵام ئەترسام ئەو دوورگەیە کە من لە دڵما سازم کردووە بەو هەموو مەلە جوانانەیەوە کە جریوەیان وەك مووسیقای بێوچانی ژیان دێتە گوێ لەپڕ ببێتە وشکاروێەکی چڕ. ئەترسام ئەو هەنگاوانە کە من بە ئاسەی هەرێمی ئەوینەوە هەڵیانئەگرم بمگەیەنێتە وڵاتی درۆو دەلەسە و فریوکاری. لە بیرت چۆتەوە ئەو رۆژە پاش ساڵێك کە بە چاو، بە روانین، بە هەناسەی سارد و گاهێ بە بزەی شەرمێونی لێو تێمگەیاندبووی کە گرفتاری تۆم؟ لە کۆڵانێکا تووشی یەك هاتین، ئێوارەیەکی بەهار بوو تۆ کتێبەکانت بە سەر سینگی پڕ لە رازی کچانەتەوە گرتبوو، شەکەتی چەند سات گوێگرتن بۆ دەرس‌کوتنەوەی مامۆستای خوێندگەکە کەمێك چاوی گەشی لێڵ کردبووی، دەتکوت گوڵاوێکی مەندە بە پەلکی شلك و تەڕی شۆڕەبی سێبەری لێ‌کراوە.

لەمێژ بوو ئەمویست پڕێسکەی دڵم لە لات بکەمەوە بەڵام نازانم چ سامێکی یەزدانیم لە چاوتدا بەدی ئەکرد؟ کە هەر لەگەڵ ئەمدیتی زمانم دەچووە بەست. بەڵام ئەو رۆژە شەپۆلی پەنگاو بەستووی هەستی من لەمپەری زمان و پەرژینی مژۆڵی رووخاند، کوتم: «رووناك!» راوەستای، بزەیەکی هیوابزوێن کەوتە سەر لێوت و رەنگت کە لە پێشا وەك پۆلووی ئاگر سوور بوو گۆڕا، وەك رۆژی سەرکەل پەڕی، پاش ئێستێکی کورت بووی بە ئاسکێکی سڵ و هەڵاتی. وەك دوێردێکی تیژ هەرێری هەوای

کوڵانت لەت کرد، کوڵان پڕبوو لە بۆنی خۆشی ئەوینت. من مامەوە بە دڵێکی لەدەست دەرچوو. گیانەکەم رەنگە لەبیرت نەمابێ چونکە ئەمڕۆ بۆم دەرکەوتووە ئەم ماوەیە هەر نەخشت گێڕاوە، رووبەندی دڵداریت بە سەر خۆتا کێشاوە و لە ژێرەوە گاڵتەت بە من کردووە.

لێت ئەپرسم، کاری ئەو باخەوانەت پێ چۆنە کە تۆوی گوڵ ئەچێنێ؟ شەو ئاوی لێ ئەنێ، بژاری ئەکا، لەشی نەرم و نیانی گوڵەکە لە دەسدرێژی درکوداڵ ئەپارێزێ تا غونچە ئەکا، ئەپشکوێ و بە دەم بەیانەوە پێئەکەنێ، پاشان باخەوان پێشێلی کا، بژاکێتێ و لە ریشەوە دەریبهێنێ، بیخاتە بەر سووڕەتاوی بێبەزەیی نیوەڕۆی هاوین؟ پێم بڵێ کاری ئەو باخەوانە بێ هەستە، دەروون زبرەت پێ چۆنە؟

کارم بە سەر وەڵامی تۆوە نییە، بەڵام تۆ خۆت وەك ئەو باخەوانە باخچەی دەروونی منت بە جوانترین گوڵی هەست و دڵداری رازاندەوە، ئەو گوڵانەت بە ئاوی هیوا پەروەردە کرد تا شەپۆلی بۆنی خۆشیان دەماخی لاویمی پڕ کرد. لەپڕ بێ ئەوە تەنانەت خۆشت بزانی بۆچ وات کرد گوڵەکانت خستە ژێر پێی بێبەزەیی تی؛ ناڵێم بۆچ وات کرد، لێت ناپاڕێمەوە کە ئەو بەهارە کە خۆت کردت خەڵاتم بۆچی لێم وەرئەگریەوە؟!

تەنیا ئەمەوێ جارێکی تریش بتبینمەوە، سۆنەی نیگام کە هۆگری زرێباری چاوتە، جارێکی تر لەم دەریا شین و مەندەدا مەلە بکا. ئەمەوێ بزانم دیسانەوە لەبەر چاوم هەر ئەو کەلە هەتاوگرەی بەربەیانی، یا بووی بە ئاسۆی زەردی رۆژپەڕ. زۆر سەیرە چۆن ئەبێ دڵێکی وەك دڵی من بێ تاوان لە پڕ لەوپەڕی بەختیارییەوە بێتە ئەم پەڕی چارەڕەشی؟ بەیانی کە چاوم کردەوە تۆم هەبوو، بزەی هەتاوم هەبوو، ژیان و هیوام هەبوو، کە شەو داهات نە تۆ مای، نە پڕشنگی خۆرەتاو و نە ژیان و هیوا. نازانم بیرەوەری ئەوینی مردوومان ئەوەندە بێ هێزە کە بتکێشێ بۆ جێژوانی چۆڵی خاپوورمان یا

نا، بەڵام ئەگەر هاتی چاوت بە من یا باشتر بڵێم تاپۆی من ئەکەوێ و ئەو تاپۆیە پێت ئەڵێ بۆچ وات کرد؟

ئەم نووسراوە کورت و ساکارە کە پێشکەشتان کرا تەنیا لە روالگەی دڵدارییەوە سەیری دەوروبەری خۆی ئەکا و ناتوانێ بۆ کۆمەڵ کەڵکێکی هەبێ بەتایبەت ئەمڕۆ کە شێوەی رۆمانتیك کۆن بووە و دەرکەوتووە کە ناڵە و هاواری ئەویندارانە هیچ دەردێکی کۆمەڵ دەوا ناکا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئێمە هێندە وشك و بێ‌هەست نین کە بە جارێ ئەوینمان پێ بێهوودە بێ، ئەوین لە نووسراوەی «رئالیستی» یا ئەبێ کەرەسەیەك بێ بۆ هاندان و پتەوکردن و لابردنی شەکەتی، نەك خۆی بێتە ناوەرۆکی مەبەست؛ واتە ئەوین بۆ ژیانی بەختەوەرانە لەگەڵ هەموو کەس، «نەك ئەوین بۆ ئەوین».

# «نووری» شاعیری خەم

سەلام لە گوێگری هەستیار و پەیڕەوی هونەرناسی بەرنامەی تاپۆ.

لە سەرەتای بەرنامەی تاپۆدا رامانگەیاند کە ئەم بەرنامە جگە لەمەی وەڵامی پرسیارە ویژەییەکانتان ئەداتەوە، ئامادەیە بۆ ئەوە شێعر و ئەسەرەکانیشتان لە بەرنامەکەدا بنووسێ و بە ناوی خۆتانەوە بڵاوی کاتەوە. لەم بەرنامەیەدا پارچە شێعرێکتان پێشکەش ئەکەین لە شوێنەوارەکانی کاک محەممەدی نووری. کاک محەممەدی نووری بەداخەوە کەم کارە و چەوتی ژیان ماوەی نادا زۆرتر بە هونەرەکەیەوە خەریک بێ؛ ئەگەر وانەبوایە ئێمە ئێستە بینەری دیوانێکی جوان و رازاوەی شێعری ئەبووین. کاک نووری هەرچی شێعری هەیە هەموویان هیوابڕاوانەن. ئەمەش ئەگونجێ هەر لە بەر ژیانی ناساز و نەهاتی بێ. وا دەرئەکەوێ کە هەرگیز تیشی هومێدێک لە دڵی کاک نووریا نەبووبێ، بەڵام نە من و نە گوێگرەکان ئەم دەلیلەمان قبووڵ نییە کە کاک نووری نەهاتی و چەوسانەوە و

کەسەری خۆی بکا بە بەهانەی بەستنی سەرچاوەی زەوقی و ئێمە پێبەش بکا لەو ناوە زوڵاڵە. با ئەمەش بڵێم کە ئەم چوار شێعرانە بە زاراوەی موکریانین و ئەگەر وشەیەك یا شێوە دوانێك و تەعبیرێکی موکریانیتان تێدا بەرچاو کەوت لاتان سەیر نەبێ.

کاك محەممەددی نووری بەر لەوە شێعرەکەی دەست پێبکا ئەڵێ: شێعرێکی «گۆران»ی ـ لە سەرمەرگی هیوادا ـ خوێندۆتەوە و نووسیویەتی: «هەموو کەس بۆ مردووی خۆی دەگری، بەڵام گریانی گۆران بۆ هیوا و بێکەس هەموو کەسێکی خاوەندڵ بانگ ئەکاتە سەر شیوەنگا. من لەو کۆڕە گەرمەشینەدا بە خوێندنەوەی ئەم هۆنراوەیەی مامۆستا گۆران بۆ چەند رۆژێك دڵم گەرم بوو. دەردی خۆم لە بیر چۆوە و سەرم دانەواند لە بەر دەرگای هونەر. هۆنەر فەرق ناکا کوردە، عەرەبە، یا تورك. کۆنە یا تازە، «حافز»ە یا «لامارتین»، رەشە یا سپی. هەرچی هەیە، هی هەر خەڵکێکە بە جوانی دەچرژێتە گیان و دەکشێتە ناو ژیان، هەم پێکەنینی جوانە و هەم گریانی شکۆدارە.» لێرەدا کاك نووری خۆی بە کەم داناوە و ئەنووسێ: «من نە نووسەرێکی زەبرم و نە شاعیرێکی زرنگ. تەنها ویستم بە زمانی بێزمانی کرنۆشێك بەرمە بەر بارەگای شێعر و شاعیر و بڵێم:

ئەمن چی بڵێم بە جوانی،
رێك و رەوان و روون بێ
وەك گۆرانی «گۆران»ی
هۆی ئارامی دەروون بێ
بزەی لێو و کزەی دڵ
ئینسانی بێ و یەزدانی
دەمی تیغ و پەڕی گوڵ،
سیحرێکی جاویدانی
«حافز» بە نیوەی شەوێ،

بە سروێکی ئاسمانی
«گۆران» بە چریکەی کەوێ
بە قاسپەیەك گۆرانی
فرشتەی پێتە دەرکێ
پەری پێتە هەڵپەڕکێ
زەوی بچێتە سەمایە
ئەمن چی بڵێم لە دوایە؟
هونەرمەند بە سەرسووڕماوی پەنا ئەباتە بەر ئیلهام و ئەپرسی:
ئەی هەوێنی دڵی هونەر
ئەی هۆی زاڵست و رووناکی
لە پێش دەرگات دادەنێم سەر
باوێژە زەینم بە چاکی
چیت پێشان دا، چیت خستە دڵ
وا جوان هاتە دەرێ لە کڵ
چیت لێ ستاند و چیت دایە
وا جوان هێناتە کایە؟
هونەر! ئەتۆ نیشانی پاك
نموونەی باش! رەوشتی چاك
بۆ کێ دەگری؟ بۆ کێ دەژی؟
دەبیە پۆلوو، دەبیە رەژی؟!
چۆن سووتاوی؟ چۆن چۆقیوی؟
جارێ شەمی، جارێ پیوی؟
هەڵدایستی بۆ دنیای روون
دادەمرێنی کوڵی دەروون
تۆ «فیردەوسی» و «ویکتۆر هۆگۆ»ی
تۆ لامارتین، یاخۆ «خواجۆ»ی
تۆ «گۆران»ی، ئەستێرەی کۆی

زەمان دەڕوا، کوا تۆ دەڕۆی؟
دنیای پڕ ئاوازەی تۆ
واتەی کۆن و تازەی تۆ
لە هەر کوێ خۆی بنوێنێ
خۆری و پرشنگ دەپژێنێ
هونەر بڵێ ئەتۆ لەکوێی
نە ئاوا بووی، نە لە دەم سوێی
نە نزیکی نە لێم دووری
تۆ بڵێسەی کۆگای نووری
برۆی، چاوی، برژانگی
لە رووی زەرد و رەشانگی
خوێنی لە نێو پێستی سوور
سپی پێستی وەك بلوور
گیانی لە نێو هەموانی
رەنگ و زمان نازانی
تۆ برووسکەی یەزدانی
ئەمما کوڕی ئینسانی
هونەر جێگات دیارە
گەنجی کونجی وێرانێك
ئاواڵ و هاوڕێ و یارە
شەمێك، شەوێك پەروانێك
لەو خێزانە بچکۆلە
لەو وێرانە، لەو چۆڵە
جیهانێك ئەخەیتە روو
پڕ بە تاسە و ئارەزوو

# شەوە

سەلامێکی خاوێن وەك شنەی شەماڵی دوورەشار پێشکەش بە گوێگری هۆگری هونەر.

لە بەرنامەی ئەمجارەماندا یەکێ لە جوانترین و بەنرخترین شوێنەوارەکانی شێعری نوێی کوردی بۆ ئێوە هەڵبژاردووەمانە کە لەگەڵ شیکردنەوەیەکا بۆتانی دەخوێنینەوە. ئەم پارچە شێعرە هی شاعیرێکی گەنجی کوردە و ناوی شێعرەکە «شەوە»یە.

ئادەمیزادێکی سەرلێشێواو و کڵۆڵ بهێنە بەرچاو لە شەوێکدا، شەوێکی کپ و کەڕو کڕ هەتا چاو بڕشتی هەبێ و بیر بڕستی، تاریکییە و بێدەنگی، وەها کە ئادەمیزاد ئەسیری شەوە و تەنانەت لە بوونی خۆشی ئەکەوێتە دوودڵییەوە. تەنانەت هەناسەکێشان و روانینی چاو و هەستکردنی سامی شەویش ناتوانن ئەو دڵنیاکەن کە هێشتا زیندووە. «هەبوو، نەبوو» وەها سنووریان تێکەڵ دەبێ کە لەیەك ناناسرێنەوە. لەم حاڵەدا کە نە «تەواو نەبوون»ە و لە «تەواو هەبوون»، دەنگێك لە دوورترین سووچی شەوەوە دێتە گوێ. ئادەمیزادی بەندی زیندانی شەوگار هەست دەکا کە زیندووە و بە واتەی شاعیر: «شەووری گەرمی هەبوون بە گیانیا ئەگەڕێ». دەنگەکە پەرەگر ئەبێ. بەرزتر و نزیکتر دێتە گوێ. ئادەمیزادی تاسەبار تەواوی هەستی خۆی لە گوێیدا کۆ ئەکاتەوە تا بزانێ ئەم دەنگە خۆشە کە مزگێنی ژیان و هەبوونی پێوەیە چییە؟ بەڵام دەنگەکە هێشتا دوورە. ناچار ئادەمیزادی بە سوێ و ئامەزرۆی دەنگ و بزووتن و ژیان بیرئەکاتەوە. جارێ بە دڵیا دێ ئەمە دەنگی «نووح»ە؛ جارێ لە بەر خۆیەوە ئەڵێ نە، ئەمە دەنگی نرکەی تەور بە دەستێکە کە خەریکی هەڵپەرتاوتن و بڕینی للەوپۆی دارسانە تا رێگایەك بەرەو شاری رووناکی بکاتەوە. جارێکیش ئەڵێ ئەمە دەنگی دەنووکی مەلی بەیانە کە پەرژینی سەختی شەو کون ئەکا تا دەرووبەك لە سەر پڕشنگی هەتاو بکاتەوە. دەنگ هەر دێ و نزیکتر ئەبێتەوە، تاکوو ئەبێتە شەقڕێکی تاڵ و مەرگهێن. لە پێشا ئادەمیزاد لە بێدەنگی و خامۆشی شەو ئەترسا، ئەمجا دەروونی پڕ ئەبێ لە سامی دەنگەکە و تێئەگا ئەو زمزمە ئەرمە کە لە دوورەوە وەك پەتەی سەرئاو وەها بوو و زایەڵەی ئەتگوت هەڵقوڵینی کانییە، کاتێ نزیك بۆوە، بوو بە دەنگێکی ترسێنەری مەرگاوی کە چەشنی شەو گەرووی ئادەمیزادی تەنیا و بە هەڵەچوو ئەگوشێ...

وە ئێستە گوێ بگرن بۆ شێعرەکە:

پەسا پەسا پەرەگر بوو شەوی کڕی لاسار

نەما شنەی شەوبا،

نەوی بوو چەسپی زەوی بوو لە سامی شەو پاسار!

بە سێحری تاریکی «هەبوو، نەبوو»یەك بوو

نەما نیشانەی بوون

نەما نیشانەی من

لەشم تووایە دەروونی شەوێکی بێ‌ڕۆچن!

پەسا پەسا پەرەگر بوو

بەرەو فەزای بێ‌بن!

بەرەو فەزای بێ‌بن!

بەچاو و گوێ پەلەقاژەی شعووری بوونم بوو

سەرنجی چاوی بە هەڵپەم،

شەوی سمی لە هەموو لاوە بۆ ترووسکایی!

بە لەز بوو گیانی بە سوێ

دڵی بە خورپە لە بن گوێ

وە گوێ بە وریایی

بە کوڵ ملاسی جریوەی ژیان

بەڵام هەیهات...

مەلوولی کردم شەو

مەلوولی کردم شەوگار

عەزایی دامێ شەوی بێ‌ڕەزا

بە گۆڕەوشار

کەچی لە دوورترین سووچی ئەم شەوا
ناکاو، بە نەرمە ئاهەنگێ
درنگ، درنگ، دەنگێ
وەکوو پێتەی سەرئاو
شەپۆلی خستە دەروون
لە گوێم تەنینی لە گوێن هەڵقوڵینی کانی بوو
تەنینەوەی وەکوو بۆنی گوڵاڵە، ئانی بوو
شنەی بلاوێنی، دنەی ئەدا بە خەیاڵ
هەرا هەرای نووحە
«نووح»ە گەمی ئەخولقێنێ،
کە دێوی زاڵمی شەو
هەواڵەکانی بە لافاوی رەش ئەخنکێنێ؟
بەیاخی کاوەیە ئاخۆ بە رەمزی فەتحی بەیانی
لە جەرگی شەو ئەچەقێ؟
مەلی بەیانە لە شەو زیزە بێ و چان و هەدا
دەنووکی سەختی لە پەرژینی قایمی شەو ئەدا؟
وە یا تەور بە دەسێکە لە دارسانی چڕی شەو
خەریکە تیەپەڕێ روو لە شاری رووناکی؟!

ئەهات... ئەهات... ئەهات...
ئەهات و شەو شەق ئەبوو
شەووری گەرمی هەبوون

بە گیانما نەگەڕا

جێ بە سامی شەو لەق نەبوو!

ئەمات... ئەمات... ئەمات...

ئەمات و گەورە نەبوو، گەورەتر نەبوو،

هەیهات!!

لە سامی شەو کڕبووم

لە سامی دەنگ پڕبووم

دڵم کولاوە بە زرمەی هەناسە تاسێتی!

ئەمات و گەورە نەبوو، گەورەتر نەبوو،

هەیهات!!

شەقۆنی تاڵی وەکوو مەرگی ناگەهانی بوو

تەنینەوەی وەکوو «ژمەری هەلاهەل» ئانی بوونی

هەرای دەروون ئاخن

پەسا پەسا پەرەگر بوو وەکوو شەوی لاسار

پەسا پەسا پشووبڕ بوو عەزابی گۆڕەوشار

وەرن، وەرن شەوە گرتوومی

بمگەنێ هاوار، هاوار!

# سێبەری نیگا

من بووم و دوو سێ گەز هەوای هۆدەکەم. ئەوەندە تەنیا بووم کە ئەتگوت ئادەمم
لە یەکەم رۆژی خوڵقانیا. بێدەنگی هێندە پڕو چڕ بوو کە دەنگی لێدانی دڵ و ئەبزی
دەستم ئەتکوت گرمەی هەورەتریشقە و رژانی ئاوهەڵدێرێکی گەورەیە لە
هەزاربەهەزاری شاخێکی سەختەوە. لە سەر هەودای نەدیاری بیرەوەری، چەرخ و خولم
ئەخوارد و بەرەوپاش ئەگەڕامەوە. ژیانی سی ساڵەم لە پەڕاوێک ئەچوو کە شنەیەکی
نەرم و نیان لاپەڕەکانی هەڵدا تەوە. لە منداڵیمەوە پێیا دەهاتمەوە. وەك فەقێیەك کە لە بەر

هەیوانی مزگەوت دەرسەکانی رابردووی دەور بکاتەوە.

ساڵیم زۆر تیژ تێپەڕی. جگە لە بزەی لێونێك كە هی رواڵەتێکی خەمبار بوو، چی ترم نەدەهاتە بەرچاو. بزەی دایکم بوو کە زوو بەجێی هێشتم و بە ناوی یادگار هەر ئەو بزەی بۆ دانام کە هەمیشە لێوی ئەڕازاندەوە، بەڵام هەمیشەش ئەو بزەیە بە رواڵەتێکی خەمبارەوە ئەنیشت. چەشنی قورینگێکی تەنیا کە چلەبڕی کردبێ و لە کەناری شەتاوێکی بە بەفر و سەهۆڵ گەمارۆدراو هەڵنیشتبێ. لەو ساتەوە فێر بووم کە بزانم کام بزە هی دڵخۆشییە و کام زەردە هی پەرۆشی و پەشێوی و هەر لەو کاتەوە خەم بوو بە هەوێنی بیرەوەریم. ئۆ چەندە تاڵە خەمنامەی ژیان خوێندنەوە، خوێندنەوەی پەڕاوێك کە ئەزانی هەمووی تراژێدییە و لە هیچ دێڕێك تووشی خۆشییەك نابی. بە با کردنی کای کۆن! لە هەموو کەلاوەیەکا بە شوێن گەنجا گەڕان؛ ئەمەیە تەقەلای من لە پێداچوونەوەی ئەوەی بە سەرم هاتووە و ئەو رۆژانەی کە بناغەی خانووبەرەی تەمەنی منیان دامەزراندووە.

دێتەوە بیرم لە هۆدەیەکا کە بەرەو رۆژ پەنجەرەکانی ئەکرانەوە دادەنیشتم. زەردەی خۆرەتاو تا نیوەی مافوورەی هۆدەکەمی بە پۆی زەرد ئەتەنی و شەبەقی ئەکەوتە سەر ئاوێنەیەك کە بە دیوارەوە هەڵواسرابوو. پۆل پۆل پەرەسێلکەی تیژباڵ بە قاژوقیژ بە بەر پەنجەرەی هۆدەکەمەوە تێپەڕین. قووقەی کەڵەشێرێك لە دەرەوە ئەهات و باڵۆرەی سەگێکی برسی بەرز ئەبۆوە. کارەکەرە پیرەکەمان تا گوێی لە لوورەی سەگ ئەبوو لە ژێر لێویەوە نزایەکی ئەکرد و خێرا پەنجەرەی هۆدەکەی ئەبەست و بە دەم کارەوە ئەیگوت: «پەنا بە خوا ئەمجارە نۆرەی کێیە؟»

ناوی پوورە خاتوون بوو. بە هەزاران داستانی دێو و جنۆکە و پەری ئەزانی. جنۆکەیەك کە ئەبوو بە پشیلە و شەوانە ئەچوو لە کۆڕی زەماوەندی جنۆکەکانا زوڕنای لێ ئەدا، «گەسکەکوڵە» و «شەولەبان» و ناوی تر. من لەگەڵ ئەوەشا کە زۆر لەو

داستانانه ئەترسام و کاتێ خەوتن سەرم ئەبردە ژێر لێفەکەمەوە، هەموو شەوێ گوڕووم ئەگرت و تا پوورەخاتوون داستانێکی بۆ نەگێڕابامەوە خەوم لێنەدەکەوت. هەر لە منالیەوە فێر بووم کە ئادەمیزاد ئەسیری چارەنووسە و هەر هەوڵێ بدا لە داوی چارەنووس رزگاری نابێ!

تەمەن لە شازدە و حەقدە تێپەڕی و من هەستم کرد لەگەڵ لاوانی ترا جیاوازم. شەرمن و کەمڕوو بووم؛ بەتایبەت کاتێ لەگەڵ کیژێکا رووبەڕوو ئەبووم، زمانم ئەبەسترا و قسەم بۆ نەدەهات. هەر وەك کاتی منالی، خۆم نوقمی خەیاڵ کرد. سەرم بردە ناو کتێبەوە. لەگەڵ جیهانی بێدەنگ و رەنگاورەنگی ئەوین و خەیاڵدا بووم بە هاودەمی شەو و رۆژ. هەر وەها بووم تا رۆژێك روانینی چاوێکی گەش و رەش دڵی لەرزاندم! نە... نە... تۆ نابێ پابەندی ئەوینی خاکی بی. ئادەمیزاد بێبەینەت و بەقان؛ چارەت ئەوەیە راکەی، هەر تا ئەتوانی خۆت دوور خەیەوە. ئەوین جوانە، بەڵام ئەوینی ناو هۆنراوە و پەڕاو؛ نەك هی ناو کووچە و شەقام... ئەم چاوە گەشانە داوێکە ئەتکا بە ئەسیرێکی دەستوپێ بەستراو. کاتێ خۆت و دڵت پێ سپارد جێتەهێڵێ.

هەموو ئەمانە هاتنە سەر لاپەڕەی بیرم؛ بەڵام سوودی نەبوو؛ ئەو دوو چاوە گەورە و گەورەتر بوونەوە. هەموو دەوروبەری منیان داگرت، وەك شەوێك کە بەسەرتا بکێشێ و بەرچاوت تاریك کا، یا وەك ئەمە لەپڕ رۆژ بگیرێ و نیوەڕۆت لێ ببێ بە نیوەشەو و نەتوانی هەنگاو هەڵبڕی. ئەم دوو چاوە گەشە، بە روانینی گەرم و ئەویندارانەیانەوە تەنانەت بۆوردەیەکیش وازیان لێم نەدەهێنا. بێوازی یەخەی گرتم. بیر و خەیاڵێکی تازە مێشکمی ئالۆز کرد، تا لەناکاو دیسانەوە لە کوڵانێکی تەسکا کەوتمە بەر سیحری ئەو دوو چاوە گەشە. ئەمزانی چ هێزێك پاڵی پێوە نام کە بۆ لای بکێشم و چ جادوویەکی زمانمی خستە کار. لەبەر خۆمەوە کوتم: «لام وا نەبوو ئیتر چاوم پێتبکەوێتەوە.» شەرمێکی کچانە روومەتی کرد بە دوو پۆلووی سووری ئاگر.

پێکەنینێکی نادیاری لە دوو لێوی سوور و دوو چاوی رەشیا دیاری دا. ئەو دوو گۆمە قووڵە بە شەپۆلی وردی یەك لەدوای یەك شڵەژان و بە نەرمی نەسیمێکی ئێوارانەی هاوین کوتی: «منیش لام وا نەبوو!»

ـ «لەو رۆژەوە من ئەوینم ناسی و ژیانم ناسی. ئەگەر تۆ نەبوایەی و ئەگەر تۆ بەم نیگا گەرمە نەتگرتبایەمە بەر سەرنج، من چ بووم جگە لە کرمێك لەناو لاپەڕەی کتێبی زانکۆی مافا؟ ئاخۆ، جێگایەتی بڵێم سپاس کە ژیانت پێ ناساندم!»

تا حەوتەی داهاتوو، خواتان لەگەڵ.

# شانۆگەری چۆن و کەی سەری هەڵداوە؟

سەلامێکی گەرم و گوڕ پێشکەش بە گوێگری هۆگری هەوای بزوێنی هونەر.

باسی ئەمڕۆمان تەرخان ئەکەین بۆ ئەم مەبەستە کە تیاتر یا شانۆگەری چۆن و لە کەیەوە لەناو کۆمەڵا پەیدا بووە و بە کوێ گەیشتووە و لە ناو کۆمەڵی کوردا ئەم هونەرە پێشینەی چیە و ئەمڕۆ لە چ پلەیەکدایە؟

شانۆگەری لەگەڵ نووسینی نومایشنامە جیاوازییەکیان لە باری زەمانەوە هەیە، واتە پێش ئەوە کە نووسین و خەت هەبێ شانۆگەری و نیشاندانی مەبەستێکی

کۆمەڵایەتی یا ئاینی بە چەشنێکی نزیك لە تیاتری ئەمڕۆ هەبووە و ئەم نیشاندانە ئەگەڕێتەوە بۆ هونەری جادووکارانە کە کوتمان دایکی هەموو هونەرێکی تری ئەمڕۆ بووە و هەر بەشێکی هونەر کە بیگری لە ناکامی پەرەگرتنی ئەو شێوە جادووکارانەی هونەری پێشوودا پەیدا بووە. تەنانەت پەیکەرە دروست کردن و ئارشیتێکتی و تیاتری ئەمڕۆ.

بێگومان ئادەمیزادی بەروو، پێش ئەوە زمانی بکەوێتە کار و بۆ هەموو شتێکی دەور و بەری ناوێك دابنێ و کۆمەڵ ئەو ناوە بگرێ و بە کاری بهێنێ، دەستی لە کارا بووە. جا بیری لێ بکەنەوە کە ئەو ئادەمیزادە کاتێ ویستبێتی بە خێڵەکەی حاڵی بکا کە لە بێشەیەکا شێر یا ماری دیوە و بە ئیشارە و زیل و بەمی دەنگ ئەو کارەی پێەکراێ چی کردووە؟ بێگومان شکڵی ئەو درندە یا ماری لە قوڕو بە وێنەیەکی سەرەتایی دروست کردووە. ئەمە پەیکەرە سازکردن. هەر ئەو ئادەمیزادە ناو غارەکەی خۆی بەش کردووە و هەر بەشەی کردۆتە جێگای تایبەتی شتێك. وەك شوێنی خەوتن، شوێنی هەمارکردنی خواردەمەنی و ئازۆخە و پێەویستی تر و ئارشیتێکتی هەر ئەم لەبەرچاوگرتنەی پێەویستەکانی جێگای حەسانەوە و یا کارکردنە کە جوانی و تەفەنونیشی تێکەڵ بووە. ئەمێنێتەوە تیاتر یا شانۆگەری کە ئەمڕۆوا دێتە بەرچاو کە گوایە تیاتر ناچارە نومایشنامەیەکی نووسراوی هەبێ و دەورگێڕەکان بکەونە شوێن پیەس و سووژەیەکی نووسراو. ئەپرسین تیاتر چیە؟ ئاخۆ تەنیا بۆ تەفەنون و سەرگەرم کردن پەیدا بووە و بەهرەیەکی کۆمەڵایەتی نیە و بە ناوی پێەویستیکی ژیان خۆی نەنواندووە؟ وەڵام ئەمەیە تیاتر یانی نواندنەوەی ئەو راستەقینە کۆمەڵایەتیانە کە ئامبازی ژیانی مرۆڤن بە چەشنێکی هونەرمەندانە واتە بە هێزی عاتیفە و بە هێزی جووڵە و قسە و حاڵەتەوە و بە کەڵك‌وەرگرتن لە وێنەسازی بۆ تەبیعەتێ کە داستانی رووداوە تیاتریەکەی تێدا هەڵکەوتووە. ئەم قەیدی دوایی، یانی کەڵك‌وەرگرتن لە وێنەسازی ـ دیکۆر ـ لە پێشدا پێەویست نەبووە، چونکە ئادەمیزاد خۆی لە تەبیعەتا ژیاوە و دیکۆری ئامادە و

سروشتی هەبووە.

تئاتر بۆ ئادەمیزادی بەروو، شتێکی خەریککەری تەفەننونی نەبووە، بەڵکوو بەشێکی پێویستی ژیانی ئەو بووە، کە وەها بوو بەهرەی کۆمەڵایەتی هەبووە. ئادەمیزاد ئەگەر ویستبێتی خۆی ساز بکا لەگەڵ دوژمنێکا شەڕبکا لە پێشا بۆ ئەو کارە تەمرینی کردووە. تاقمێ لە خێڵەکە بوون بە دوژمن و تاقمێکی تر ویستوویانە ئەو دوژمنانە کە بە رواڵەت کراون بە دوژمن بشکێنێ و لە ناویان بەرێ. ئەمە خۆی بۆتە مایەیەك بۆ شانۆگەری یێ ئەوە پیەسێك (نومایشنامە) لە کارا بێ.

لە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش لەدایکبوونی عیسادا، نومایشنامەی نووسراو لەناو یۆنانییەکانا پەیدا بوو. لە سەرەتاوە تراژێدی ئایینی بە چەشنی سروود، هەر وەك لە ئێرانی کۆنا سروودی ئاگر (نیایشی ئەهوورامەزدا) هەبوو، لە یۆنانی سەدەی شەشی پێش لەدایك بوونا دەستی پێکرد. بۆنموونە سروودێ کە بۆ رێزگرتنی خوای شەراب دیۆنیسووس لە جەژنە ئایینییەکانا لە لایەن تیپێکی تایبەتەوە ئەخوێنرایەوە. سروودی قوربانیکردنی ئاسك، یەکێکی ترە لەو سروودە تراژدیکە ئایینیانە. گەورەترین تراژێدینووسی ئایینی ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی بەر لە میلاد «ئێیس»ە کە ئاڵوگۆڕێکی لەو چەشنە نومایشنامە ئایینییانەدا پێکهێنا و دیالۆگی هێنا ناو سروودەکانەوە. ئاکتۆر actor واتە نەخشیاری شانۆ نەکەوتە دەمەتەقە و گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆکی تیپەکە و بەم چەشنە تراژێدی لە سروودێکی رووتەوە گۆڕا بە وتوویێژ و سروود، تێکەڵ.

ئاخۆ ئەم چەشنە شانۆگەرییە زۆر لە بەیتە کوردییەکان ناچێ کە هەندێکیان بە قسە و پەخشان بوو و بڕێکیان بە شێعر و هەڵبەست؟ بەیتخوان لە کاتی خوێندنەوەی پەخشانەکەدا هەوڵی ئەدا بیری گوێگر ئامادە بکا بۆ پەردەیەکی تر لە بەیتە نومایشنامەکە و ئەمجار دەستی ئەکرد بە خوێندنەوەی بەشە هەڵبەستەکە.

پاش تراژێدی ئاینی، درام یا دراما drama لە یۆنان پەیدا بوو. ئی‌سی خۆلۆس گەورەترین درام‌نووسی یۆنان بوو. ئی‌سی خۆلۆس لە ژمارەی سروودخوێنانی ساکاری نومایشنامەی کەم کردەوە، لە جیاتی ئەوە دیالۆگی درامی زۆر کرد و جموجۆڵ واتە نواندنی بە حەرەکەی باو کرد. پرۆمیووس ماگیدا بە نووسینی نومایشنامەی ئاگامێ م نون و سۆفۆکل یا سۆفۆکلیس بە نووسینی ئۆدیپ گەورەترین تەئسیریان کردە سەر درام‌نووسینی یۆنان. یوریپیدیس لە نومایشنامەنووسەکانی پێش خۆی زۆرتر، بە لای راستەقینەوە چوو. هیپولیتووس و میریا و ئەیوون چەن نومایشنامەی ئەو نومایشنامە بەرزەی یۆنانی کۆنن کە تەنانەت لە سەردەمی ئێمەشدا سەرلەج رائەکێشن. شتراوس مووسیقاری بەناوبانگ، نومایشنامەی ئەلکترای کردووە بە ئۆپێرا operra.

بەداخەوە لە ناو کوردا تا ئەم دوایانە نومایشنامە نەنووسراوە، بەڵام شانۆگەری هەبووە، زۆرتری یاریەکانی کوردستان کە بە گەل ئەکرێن، چەشنە نومایشنامەیەکن. یەکێك لەوانە «میرمیرێن»ە کە نومایشنامەیەکی کومێدیە و بۆرەخنەگرتن و قەشمەری کردن بە زۆردار ساز ئەکرێ. هۆی ئەمە کە بۆچ لە ناو کوردا نومایشنامە نەنووسراوە ئاشکرایە و لێدوانی ناوێ.

تا بەرنامەیەکی تر خواتان لەگەڵ.

# ڕاسپێری هونەر

سەلام لە گوێگری بەزەوق و چێشکە پاراوی بەرنامەی تاپۆ.

زۆرکەس لە خۆی ئەپرسێ کە ئایا هونەر وەنەی زانست، پێتەویستی ژیانی ئادەمیزادە، یام نە؛ ئایا هونەر لە کۆمەڵا چ نەخشێکی بەدەستە و ڕاسپێری چییە؟ ئاخۆ هونەر بۆ ئادەمیزاد لەو شتانەیە کە ئەگەر نەبێ زیان ئەگەیەنێ بە مرۆڤایەتی؟

لە زۆر کەسمان بیستووە کە بۆنموونە «هونەری شاعیری» بیایەخ ئەدەنە قەڵەم و تەنانەت تاقمێکیش هەن کە شێعر و شاعیری بە ڕاگر و گێخێتەر و خنکێتەری کۆمەڵ ئەزانن. ئەوانە بێ ئەوە بیر بکەنەوە کە هونەر و زانست دوو لقەدوانەی کۆششی مێشك و ئاوەزی ئادەمیزادن، لانی لایەنگری زانست ئەگرن و ئەڵێن زۆر خوو بە هونەر گرتن و زۆر پەرژانە سەر هونەر ڕێگای بەرەوپێش چوونی زانست ئەگرێ، لەکاتێکا ئەگەر مێژووی خەباتی ئادەمیزاد لە هەوەڵی پەیدابوونی کۆمەڵی کلانیەوە(clan) تا ئەمڕۆ بزانن هەرگیز بڕوایان وەها نابێ کە هەیە.

ئادەمیزاد جیاوازی هەرە گەورەی لەگەڵ گیانداری ترا ئەوەیە کە بەدیهێنەری هونەرە، بەشێکی کەموکورلە زانست تەنانەت لە ناو گیانداریشا هەیە، بەڵام هونەر تایبەتی ئادەمیزادە؛ لەو کاتەوە ئادەمیزاد دابەش بووە بە دەستە و تاقم و بەیەکەوە ژیاوە، واتە لەو رۆژگارەوە کە ژیانی خێزانی و بنەماڵەیی واتە کلان دامەزراوە، ئادەمیزاد هونەری ناسیوە و گرنگترین راسپێری خراوەتە ئەستۆی ئەو بەشەی مەعریفەتی ئینسانی. وشە و دەنگ و رەنگ و بزووتن، بە ریز ویژە و مووسیقا و وێنەگری و سەمایان پێکهێناوە، تەنانەت ئاین و ئوستوورەی «ماوراءالطبیعە» بەرهەمی پەنجەی یەزدانی و خوڵقێنەری هونەرن؛ هونەر هەمیشە لە درێژایی مێژووی ژیانی ئادەمیزادا چرایەك بووە بۆ رۆشن‌کردنەوەی بەرێی زانست. هەر کات ئادەمیزاد بە هۆی ئاوەزی کەموکورتیەوە دامایێ لە گەیشتنی بە ئاواتێك، پەنای بردۆتە بەر جیهانی پانوبەرین و بێ‌پەرژین و لەمپەری هونەر؛ ئەو جیهانە وا راستەقینەی وشك و زبری دەوروبەری ژیانی ئادەمیزاد ناتوانێ گەمارۆی بدا و تەنگی‌پێ‌هەڵچنێ؛ زانست ناچارە هەر لەو شتانە وەرگرێ کە لە دەوروپشتی هەن و خاوەنی مادە و جسمن، بەڵام هونەر لە دەریای بێ‌بنی عاتیفە و خەیاڵ سەرچاوە ئەگرێ؛ لە هونەرا هیچ بەرگرێك نییە کە پێش بە ئاواتی ئادەمیزاد بگرێ. لەو جیهانەدا هەڵفرین هەیە، خەوبینین هەیە، جوانی بێ‌خەوش و خاڵە. هونەر تا ئەو رادەیە کە ئاوات بڕوا ئەتوانێ هەڵفرێ، بێ‌ئەوە جیهانی راستەقینەش لەبیر بەرێتەوە. هونەر پردێکە لە واقعیەتەوە هەڵبەستراوە بۆ حەقیقەت. ماکسیم‌گۆرکی نووسەری بەرزی رووس ئەڵێ هیچ بەرهەم و داهاتێکی زەوقی ئادەمیزاد نییە کە بەهرەیەکی لە راستەقینە نەبێ. زیهنی ئادەمیزاد ناوێتەیەکە لە ئاوات و راستەقینە. «قالیچەی باڵدار»، «چەکمەی خۆش‌ئاژۆ»، «دراکوڤلان»(dracovlan)، «کڵاوی سەخری جن»، «هەڵفرین و تەنوورەی دێو»، «چەرخ‌وفەلەکی پیرەژن»، هەموو نوێنەری هەڵپەی بێ‌وچانی هونەرن بۆ دۆزینەوەی رێگای زاڵبوون بە سەر فەزا و ئاسمانا

و دەرچوون لە کێشەر و پێوەندی خاك، بەتایبەت «چەرخوفەلەکی پیرەژن» تەواو باری سەنعات و زانستی تیا بەهێزە؛ ئێستە وا باشە هەرکام لە سێ وشەی «چەرخ» و «فەلەك» و «پیرەژن» ورد بینەوە، تا دەرکەوێ کە ئیستعارە و ئیماژ و سەمبول‌سازی چ کارێکی کردووە.

چەرخ لە مێژە بە نیشانەی بزووتن و حەرەکە ئیستعارەیەکە بۆ زانستی مکانیکی و فیزیکی چەرخی چالاو کە بە کوردی پێی ئەڵێن کۆل‌وبیر، هەڵبەت کۆلی تەنیا بە کەرەسەی بووزووتەنیش ئەڵێن، چەرخی چالاو رەنگە یەکەم دەزگایەکی سنعاتی بووبێ کە بەشەر کردوویە بە خزمەتکاری خۆی، تەنانەت ئێستەش لە هونەری نەقاشیا لە سەبکی «ئەمپرسیۆنیسم»ەوە تا شێوە نوێیەکان «چەرخ» بە ئیستعارە و سەمبۆل دانراوە بۆ سەنعەت، کە وابوو «چەرخ» واتە و مەفهوومێکی ئیستعارەیی‌یە بۆ زانستی میکانیکی، «فەلەك» واتە ئاسمان ئەو فەزا بەرینەیە کە ئادەمیزادی سەرزەوی ئەلکێتێ بە ئەستێرە گەشەکانەوە و بیری هەستیارانەی بەشەر هان ئەدا بۆ پشکنین و سەردەرهێنان و زانستی کورتە و وزەی فرینی بیر و خەیاڵی زۆر و بەربڵاوە، بیر ئەکاتەوە کە چەند سەیر ئەبوو بیتوانیایە بە چەرخێك واتە کەرەسەیەکی میکانیکی بە سەر ئەم رێبازە بێ‌گرێ‌وگۆڵەی فەلەکەدا باڵ بگرێتەوە، چونکە هەروەك شاعیری ئێرانی ئەڵێ:

شنیدستم که هر کوکب جهانی است
جداگانه زمین و آسمانی است

بەڵام بزانین «پیرەژن» لەم کارەساتەدا نەخشی چییە؟ پیرەژن رەمزی ئادەمیزادێکی پڕ تاقیکاری و ساردوگەرم چێشتووە و ئەم ئادەمیزادە ئەشێ کە رێبواری سەفەرێکی پڕمەترسی بێ.

هۆیەکی تریش کە پیرەژن بۆ ئەم گەشتی فەزایە لەبەرچاو گیراوە کە پیرەژن لە

ئابووری کۆمەڵایەتیکهێنەری بەرهەم و داهاتێک نییە و نەگەڕێش لەناو بچێ و بێسەروشوێن بڕوا زیانێک لە کۆمەڵ ناکەوێ، هەر ئەو ئاواتەیە کە لە پێشا هونەر نوێنەری بوو ئێستە لەم چەرخەدا کە ئێمە تیا ئەژین لە چەشنی ئاواتێکی ئەفسانەیی دەرچووە و بووەتە کارێکی زانستی. ئەزا بە هەموو ڕەمز و ڕازێکیەوە کەوتۆتە بەر تیشکی زانست، بەڵێ هەر وەك لە هەوەڵەوە کوتمان زانست و هونەر دوو لقەدوانەی تێکۆشانی گیان و ئاوەزی ئادەمیزادن و نە وەك هونەر هەر تەنیا ڕێگای بەرەوپێش چوونی زانست ناگرێ، بەڵکوو ئەو ڕێگایە کە بە تەمومژ و تۆز و خۆڵ داپۆشراوە ڕوون ئەکاتەوە.

تا حەوتەی داهاتوو بە خوای گەورەتان ئەسپێرین.

# گەورە شێت

هەموو هاوینێك ئاوایییەکەی ئێمە چەند رۆژی سەرەتایی جمو جووڵێکی تێدەکەوت؛ هەر دووکەس کە ئەکەوتنە یەك، باس ئەبوو بە باسی «گەورە شێت». لە کانیژنان، لە سەر خرمانان، لە مزگەوت و حوجرەی فەقێیان، لە هەموو شوێنێك باسی گەورەشێتیان دەکرد. گەورەر ئافرەتێکی شێت و سەرگەردان بوو کەس نەیئەزانی سێ وەرزەی دیکە بۆ کوێ ئەچێ و چۆن ئەژی؛ تەنیا ئەوە ئاشکرا بوو کە ئەو یەکەم رۆژی هاوین لەگەڵ یەکەم گزنگی خۆر لە سەر ئاسۆ دەرئەکەوت، کەمێك لە بەرزایی سەر گۆڕستانی ئاوایی رائەوەستا و چاوی ماندوو و شڵەژاوی بە هەر چوار لای گۆڕستانەکەدا ئەگێڕا. بای بەیان شڕوڵی جل وبەرگەکەی رائەشەکاند، لەوکاتەدا لە خودای کوڵوڵی یۆنانی کۆن ئەچوو، پاشان وەك خەونێکی پڕ ماتەم ئەهات بۆ ناو جەرگی ئاوایی و لەگەڵ خۆیا هەزار ئەفسانە و راز و خەیاڵی لە دڵی دانیشتووانی دێدا ئەبووژاندەوە. ئەوانەی وا تەمەنیان زۆرتر بوو ئەیانگوت گەورەر تەمەنی لە سی تێپەڕێ،

بەڵام زۆر حەستەم بوو کەسێ رواڵەتی تێکشکاوی گەوەر بیننێ و بڕوا بەم قسەیە بکا، ئەتکوت بە نووکی گاسنی رۆژگار، چیمەنی سەرسەوزی تەوێڵ و گۆنای هەزار کووزی خوار و چەوتی تێکراوە، بەتایبەت نیگای بێگیان و بێدەربەستی کە نەتئەزانی تەوس و توانجی پتر تێدایە یا رق و تووڕەیی. هەرگیز نەبوو کە تۆ گەوەر بیبینی و تروسکەی بێتین و تیژ تیپەڕی زەردەخەندەیەك لە سەر لێوی نەبێ، بەڵام ئەو زەردەیە زوو هێلانەی وشك و چۆڵی لێوی بەجێ ئەهێشت و ئەبووەوە بە پەیکەرەی خەم و دەرد. هەموو مێژووی ژیانی ئادەمیزاد، هەموو سەرکەوت و تێشکانێك لە یەك کاتی کورتا ئەوەندە مەلی نیگای تۆ لە چاوتەوە هەڵفڕێ و بگاتە سەر وشکارۆی روخساری ئەو، وەك برووسکەی شەوێکی بە هەوری بەهار، رۆشن ئەبوو و ئەگوژاوە.

من هەمیشە بە تاسەوە بووم، وەك مەراقێکی وەدیئەهاتوو ئەمویست بتوانم قسەی لەگەڵ بکەم، چونکە زۆرم ئەفسانە و داستان سەبارەت بەم ئافرەتە بیستبوو، یەکێك ئەیکوت جنۆکە دەستیان لێ وەشاندووە، یەکی تر ئەیکوت حەزی لە گەنجێك کردووە و پێی نەگەیشتووە، لەبەر ئەمە شێت بووە، بەڵام هیچکام لەم داستانانە بۆ من جێگای بڕوا نەبوو. رۆژێك ئاواتم وەدیهات؛ کاتێ کە بەیانی زوو وەك هەمیشە ئەچووم تا لە بێدەنگی بەیانیا کەمێك لە کەناری رووباری بچووکی قەراخی ئاوایا دابنیشم و هەندێ بیر لە هەڵپەی بێوچانی ئادەمیزاد بکەمەوە، نەرمە ئاهەنگی ئاوی رووبار کە دەنگی ئەوپەڕی دیواری پۆڵاینی تەمەن بە گوێی مرۆڤا ئەچرپێنێ و سەری بەرزی چیا کە لەگەڵ چەن پەڵە هەوری سپی و ئەزۆکا راز و نیازیەتی و هەرگیز ئادەمیزاد نازانێ کە سروشت چی لەدڵایە و بەم بێدەنگییە کە لە هەموو هاوارێك، لە هەموو بانگەوازێك بەرزترە، ئەیەوێ چی بە ئادەمیزادی سەرلێشێواو بڵێ؟!

کێشێکی بەهێز کێشامی و لە پاڵ دەستیا دایمەزراندم، بێئەوە رووی وەربگێڕێ و بزانێ من کێم، کوتی:

ـ «تۆش لە تەنیایی وەڕەز بووی؟»

هیچ دەنگم نەکرد. درێژەی دا:

ـ «بەڵێ ئادەمیزاد زۆربەیان تەنیان، لەگەڵ ئەوەشا کە بە رواڵەت هەزار هەڤاڵ و خزم و کەس‌وکاریان هەیە.»

لام سەیر بوو کە ئافرەتێکی شێت ئەم قسانە بکا. بە ئەسپایی و بە چەشنێ کە نەیسڵەمێنمەوە پرسیم:

ـ «تۆش تەنیای؟»

بە ئەوسەوە روانی بۆم و دیتم کە لە نزیکەوە ئەکرێ جاری جوانییەکی ئەماو لە زەوی پڕ لە خاڵ و خەوشی دەم‌وچاویا بەدی کەی.

کوتی:

ـ «ئەوساڵەش هەر ئەم وەرزە بوو کە ئەو رۆیشت و من تەنیا کەوتمەوە.»

بەدوودڵییەوە پرسیم:

ـ«ئەو کێ بوو؟»

دیار بوو بیرەوەری تاڵی هاتۆتە خورۆش و سەرریژ ئەکا. کەمێك چاوی بە دەوروپشتیا گێڕا و کاتێ دڵنیا بوو کەسێ بە دەوروپشتمانەوە نییە، کوتی:

ـ «کوڕیەکەم، کوڕیەی نازار و خۆشەویستم!»

دەنگی ئەتکوت لەژێر چاڵێکی بێ‌بنەوە دێتەدەر؛ کپ و خەماوی بوو. لەسەر قسەکەی رۆیشت:

ـ «باوکم زۆر دەوڵەمەند بوو؛ زیاتر لە دیوەخانی ئاغا بوو؛ بەهارێکی سەوزی خەیاڵاوی کە یەکەم بەهاری گەنجی من بوو، فەقێ مارف هاتە ئاواییەکەمان و هێندەی پێ‌نەچوو کە من و ئەو دڵمان دا بە یەك. هاوین هات و گەرمای ئەوینی ئێمەش لەگەڵ گەرمای هەوا هەر هات و زۆرتر بوو؛ بەڵام باوکم ئامادە نەبوو من بدا بە فەقێیەك کە بە

واتەی ئەو نەیدەزانی کوری کێیە و لە کوێوە هاتووە. لایەکم ئەوین بوو کە بانگی ئەکردم بۆبەهەشتی خەیالاوی هەمیشە بەهار، ئەو لای ترم باوکم بوو کە لە بەر چاوم ببوو بە رواڵەتێکی دزێو و هەرەشەی لێەکردم کە هەنگاو نەنێم بۆلای ئەو گوڵزار و بەهارە کە ناوی ئەوین بوو. کوتم کە من گەنج بووم، گەنجێکی تازەساڵ و نەمدەزانی لەم ناوەدا چی بکەم.

با سەرت نەهێنمە ئێش؛ من پاش دوو ساڵ بووم بە دایکی کورێك کە لەگەڵ فەقێ مارفا ئەتکوت سێورێکن و کراون بە دوو کوتەوە، بەڵام فەقێ مارف هەر ئەومندە مێردی من بوو؛ پاشان رۆیشت و منی تەنیا بەجێهێشت. کاتێ کۆرپەکەم ببوو بە هەشت ساڵە، لەپڕ نەخۆش کەوت؛ من پارەم نەبوو کە بیبەمە لای دوکتۆر، باوکیشم لێم بە رقدا کەوتبوو و ماوەی ئەو دە ساڵە قسەی لەگەڵ نەکردبووم، تەنانەت ئەو رۆژەش کە چوومە لای داوام کرد پارەیەکم بداتێ، بە توانجەوە کوتی ئەم کورە باوکی هەیە، بۆ داوا لە فەقێ مارف ناکەی پارەی دوکتۆر و دەرمانی بۆبدا؟ پاڕانەوە و گریانی من دڵی وەك بەردی باوکمی نەرم نەکرد، کاتێ گەڕامەوە، گۆشەجەرگم، سۆمای چاوم لە جێگاکەیا....»

وا دیار بوو نایەوێ لەمە زیاتر قسە بکا، چونکە بێدەنگ بوو و چاوی بڕیە گۆڕستانی ئەوبەری. رووبارەکە تاوی بە سەر کشابوو و لە پێکەنینی توانجاوی ئافرەتێکی کورمردوو ئەچوو.

تا حەوتەی داهاتوو خواتان لەگەڵ.

١٣٥٢/٩/٢٤

# ڕەخنەیەکی ئەدیبانە

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرەستی بەرنامەی تاپۆ، هیواداریـن کامەران و بەختیار بن و پێوەندی خۆتان لەگەڵ ئێمەدا بەهێزتر کەن و هەر وەك لە بەرنامە پێشووەکاندا کوتوومانە، شەکەتیمان بە ڕەزامەندی ئێوەی بەڕێز لەم کارە کۆمەڵایەتییە کە بە ئەستۆمانەوەیە لائەچێ و پاداشی خۆمان وەرئەگرین.

گوێگرێکی بەڕێز لە سنەوە پرسیاری کردووە، بۆچ ئێمە ئەم بەرنامەیە چەشنێك لێ‌ناکەین کە وەك ماڵی گشتی یا پارك و باغی نەتەوایەتی، هەموو کەس بتوانێ بچێتە

ناویەوە و بڕوای هەرچی هەیە سەبارەت بە هونەر دەربڕێ؟

کاك مرادی بەختیاری کە وەك خۆی نووسیویەتی سالّی شەشی ناوەندییە و بەم چەشنە درێژەی بە باسەکەی داوە: «ئایا ئێوە لاتان وا نییە کە بڕوای هونەری وەك بڕوای زانستی نییە کە ناچار هەموو وەك یەك بن؟ ئایا لاتان وا نییە کە هونەر پێوەندی بە عاتیفە و چێشکەوە هەیە و قەتعیەتی بەشی زانست لە هونەرا نییە؟ کە وەهایە ئەبێ ئەمەش بزانن کە بڕوای تاکێك با زۆریش مامۆستا و لێزان بێ، ناتوانێ بۆ هەموو کەس ببێتە جێگای چاو لێکردن و سەرمەشق. هونەر هەزار ڕێگای لێ ئەبێتەوە کە گشتیان ئەگەنە ئاکام. لە زانستا شوێنی زانایەکی پێشوو کەوتن و بەکەڵك هێنانی ئاقیکاری زانستی ئەو، تەقلید نییە. ئێستە کەس ناڵێ نابێ شوێنی ئەو کەسە کەوم کە لە پێشا کەشفی کرد زەوی خڕە، یا مانگ بە دەوریا ئەسووڕێ یا هەمو جەغزێك خاوەنی ٣٦٠ دەرەجەیە، بەڵام لە هونەرا تەقلید و شوێنگرتن بێ ئەوەی هونەرمەند خۆی چێشکەیەکی تایبەت لە کار بێنێ و ڕێگایەکی سەربەخۆ بدۆزێتەوە، شتێکی ناپەسندە.

ئەڵێن سەعدی غەزەلی باو کردووە. ئەمە خۆی هونەرێکە، بەڵام حافزیش هونەرمەندە چونکە نەیویستووە ڕاستەوڕاست پێ لە جێگای پێی سەعدی بنێ، لەگەڵ ئەوەشا غەزەلی کوتووە و تام و بۆنێکی چێشکە و لێکدانەوەی تایبەتی خۆی ئاوێتە کردووە. زۆر شاعیری وامان هەبووە و هەیە کە نوسخە بەدەڵی شاعیرێکی گەورەن و ڕەنگە لە تەقلیدکردنی شاعیرە گەورەکەشا زۆر هونەریان نواندبێ، بەڵام هەرگیز نەبوون بە شاعیرێکی ناسراو و ئەگەر کەسێك بیەوێ تاریفی شاعیرێکی ئەوتۆ بکا هەر ئەوەندە ئەڵێ کە بەڕاستی جوان توانیویەتی شوێنی فلان شاعیری گەورە بکەوێ. لە ڕاستیا هونەرمەندی ئەوتۆ، شەخسیەتێکی جەنبی و هەڵپەسێراوی هەیە. خۆی نییە بەڵکوو دەنگدەرەوەی شەخسیەتی کەسێکی ترە؛ جا ئەمەش ئاشکرایە تا نوسخەی ئەسڵی هەبێ، کەس مەیلی گوێگرتن و خوێندنەوەی نوسخەی بەدەڵی ناکا. کە وا بوو ماوە

بدەن کە چێشکە پاراوەکان و زەوقی لاوانی گوێگر بکەونە هەوڵ. با خۆیان ڕێگایەك لە هونەرا بدۆزنەوە. من لام وایە ئەم بەرنامەیە دەسەلاتێکی ئەوتۆی لەسەر هونەرمەندانی لاو هەیە کە ئەیانگرێتە ژێردەست. هەر وەك ئەگونجێ ئەو سێبەرە کە لە سەر سەریانی ئەکا لە گەرمای هاوین بیانپارێزێ، ئەگونجێ بەری ڕۆژی گەرمیشیان لە چلەی زستانا لێ بگرێ.»

کاك مراد پاشان نووسیویەتی: «باشتر ئەوەیە کە نووسەری بەرنامەکە تەنیا ڕێگا پێشان بدا و ئەو شتانە کە ئەیزانێ و پاش هەوڵێکی زۆر بە دەستی هێناوە لە بەرنامەکەدا بۆ گوێگران ڕوون کاتەوە، ئیتر کاری بە سەر ئەمەوە نەبێ کە کامە ڕێگا باشە و کامیان هەڵەیە. بە واتەی خۆی تەرازوویەك هەڵنەگری کە بەرد و وەزنەکانی و سووك و قورس کردنی تای تەرازووەکە هەر خۆی بیزانێ و کەسی تر. بۆ نموونە کاتێ باسی شێوەیەکی هونەری ئەکا، بڵێ کە چۆن پەیدا بوو و هۆی پەیدابوونی چ بوو، گەورەیانی ئەو شێوەیە کێ بوون، تایبەتیەکانی شێوەکە چین، کەی دوایی هات و لەبەر چی، نەك پێشداوەری بکا و لە هێزی زانستی هونەری خۆی کەڵك وەرگرێ بۆ ئەوە شێوەیەك بکوتێ و لە بەر چاوی خەڵکی بخا و شێوەیەکی تر کە خۆی لەبەر هەر ویستێك کە هەیەتی پەسەندی کردووە بەرز کاتەوە و ماوەی بیر کردنەوە و هەڵسەنگاندن لە گوێگر ببڕێ و وزەی وەکارکەوتنی چێشکە و لێکدانەوەی نەداتێ. ڕەنگە کەمێك دوور لە ئەدەب بێ، بەڵام یارییەك هەیە لە کوردەواری کە باشە لێرەدا باسی بکەم. یارییەکە بەم چەشنەیە: چەن کەس دائەبن و چەن کەسی تر بە سەریانا باز ئەدەن. ئەو کەسە وا ناتوانێ باز بدات تەنیا دەس ئەنێتە سەر پشتی هەواڵی دابوو و ئەڵێ: «بە گوێی مامۆستام.»

ئاخۆ باشە لاوەکانمان هەموو بڵێن بە گوێی مامۆستا سوارە؟ من ئەو نووسەرەم زۆر پێ هونەرمەندە، بەڵام لەگەڵ ئەو کارەشیا موافق نیم کە ئەیەوێ چێشکەی ئیستاندارد و یەك چەشن ساز بکا.

من خۆم رەنگە بزانم ئەم موشکلەیە چۆن پەیدا بووە. لام وایە نووسەری بەرنامەکە وا بیر ئەکاتەوە ئەتوانێ هەرچی وا خۆی خوێنـدوویەتی و کردوویەتی و دیویەتی و بە هەموویانەوە بە واتەی فارسی دیدی هونەری و لێکدانەوەی زانسـتی و فەرهەنگی ئەویان پێکهێناوە لە چەند بەرنامەی کەم ماوەدا، ئەویش لە پشـت میکرۆفۆنی رادیۆوە کە تەنیا یەکجار وزەی گوێگرتن ئەدا بە بیسـتیار، فێری گوێگرانی خۆی بکـا. مـن خـۆم خوێنـدکارم و لە ماوەی خوێندنمدا زۆر مامۆسـتای وەهام دیوە کە ئـەوانـەی خـۆی ئەیانزانێ و بە بەدیهیـاتی ئەوەڵییەیان دائەنێ، لای وایە کە خوێنـدکارەکەشی ئەبێ بێگومان بیانزانێ و لەسەر ئەم بڕوا هەڵەیە دەرس ئەڵێتەوە. بۆ نموونە، ئەڵێ فڵانە شاعیرە پێڕەوی فڵانە شاعیری تر بووە و بێ ئەوە هیچی لێ زیاد بکا تێنەپەڕێ، لە کاتـێکا بۆ خوێنـدکار، هەر وەك شاعیری دوایی نەناسـراوە، شـاعیری پێشـووش کە پێڕەوی لێوە کراوە، نەناسراوە و لە راسـتیا دژواری و موشکلە نەبێتە دوان. مـامۆسـتا سـوارەش ئەڵێ ئەزانین کە شـێوەی دادائیسـمی ئورووپا شـێوەیەکی پاشەرۆك و بێ ناوەرۆکە و هـەر شێوەیەکی تریش کە باری کۆمەڵایەتی تێدا بەهێز نەبێ هەر وەهایە.

کەس نییە و رەنگە من هـەوەڵ کـەس بم کە وێراومە بەم برا نووسـەرەمان بڵێم مامۆسـتا دادائیسم کامەیە؟ باری کۆمەڵایەتی بەچی ئەڵێی؟ ئاخۆ لات وایە بۆ تاقمێ خوێندەواری زانای وەك خۆت قسە ئەکەی یا بۆ من و هـاوتـای من؟! ئەگەر بۆ خـۆت و وەك خۆتە ئەمە ئیتر کوتنی ناوێ. مەگەر بڵێی سـەرتاشی بێکارم، سـەری هـەواڵانی سـەرتاشی ترم ئەتاشـم! ئەگەر بۆ ئێمەشە تکایە بەپێی زانسـتمان بدوێ و بەرەبەرە بچۆ پێشەوە. بەرنامەکانت کورتە، مەبەستەکانت دژوارن و گوێگرەکانت هەموویان شـارەزا نین. بیوورن کە ماوەتانم گرت و هـەرچی لە دڵما بوو کوتم. ئەوە بزانن کە مەبەسـت باشتربوونە نەك رەخنەگرتن.»

لێرەدا نامە جوان و رێك و پێکەکەی کاك مراد تەواو ئەبێ و ئێمە چونکە پێمان

حەیف بوو هەموو نامەکەتان بۆ لەخوێندنەوە ماومان لەماوە وەڵامی بدەینەوە، بەڵام گوێگرانی خۆشەویست ئەوە بزانن کە ئێمە هەرگیز خۆمان بێ‌نیاز نازانین لە ڕێنومایێتان و هەرگیز بە ڕەخنەتان دڵـمەند نابین و هەمیشە ئامادەی بیستن و کەڵك وەرگرتنی ڕێ‌بەدی‌کاریتانین. تا بەرنامەی داهاتوو کە وەڵامی ئەم گوێگرە بەڕێزە ئەدەینەوە خواتان لەگەڵ. شەوتان خۆش.

# وه‌لامی «ره‌خنه‌یه‌كی ئه‌دیبانه»

ژن :

سه‌لامێكی گه‌رم و گوڕ پێشكه‌ش به‌ گوێگری به‌ڕێزی به‌رنامه‌ی تاپۆ.

له‌ به‌رنامه‌كانی پێشوودا نامه‌ی كاك «مرادی به‌ختیاری»مان بۆ خوێندنه‌وه‌ و به‌ڵێنمان دا له‌ به‌رنامه‌كانی داهاتوودا وه‌ڵامی بده‌ینه‌وه‌، به‌ڵام باشتره‌ كورته‌ و كاكڵێك له‌ نامه‌ی ئه‌و گوێگره‌ خوێنده‌واره‌ به‌ڕێزه‌مان دووپاته‌ كه‌ینه‌وه‌ تا باسه‌كه‌مان له‌ یه‌ك نه‌پچڕێ و هه‌ر وه‌ڵامێك له‌ به‌رامبه‌ر پرسیارێكا بێ و هه‌ر ره‌خنه‌یه‌ك كه‌ ئه‌و برا به‌نرخه‌مان له‌ نووسه‌ری به‌رنامه‌كه‌ی گرتووه‌ له‌ جێگای خۆیا وه‌ڵام بدرێته‌وه‌.

كاك مرادی به‌ختیاری نووسیویه‌تی كه‌ بۆچ به‌رنامه‌كه‌ چه‌شنێك لێتاكه‌ن كه‌ هه‌ركه‌س خاوه‌نی چێشكه‌یه‌كی هونه‌رییه‌، بتوانێ له‌و به‌رنامه‌یه‌دا خۆی بنوێنێ؟

بۆ وه‌ڵامی ئه‌م وته‌یه‌ ئه‌ڵێین ئێمه‌ له‌مێژه‌ له‌م به‌رنامه‌یه‌دا رامانگه‌یاندووه‌ كه‌ به‌رنامه‌كه‌مان ده‌رگایه‌كی ئاواڵه‌یه‌ بۆ هه‌موو ئه‌و كه‌سانه‌ كه‌ به‌ به‌رگ و بارێكی هونه‌رییه‌وه‌

دێن. من ڕەنگە لە هەموو بەرنامەیەکا جارێکم ئەم مەبەستە ڕاگەیاندبێ کە تاك هەر چەندە شارەزا بێ ـ کە من بێگومان نیم ـ ناوەزێ بە هەموو لایەك ڕاناگا و هەر چەندە هونەرمەند بێ ـ کە من دیسانەوە نیم ـ ناتوانێ مەکۆی هەموو هونەرێك بێ، تەنانەت تاك لە یەك بەشی هونەریشا ناتوانێ پێروڕای لەسەداسەد دروست بێ.

ئێمەش هەروەك کاك مراد نووسیویەتی لامان وایە بڕوای هونەری و لێکدانەوەی عاتیفی هەموو کەس لە یەك جیاوازی هەیە، بەڵام من ناچارم لە ڕاگەیاندنی ئەو شتانە کە بە لای منەوە باش و ڕاستن و هەروەهاش ناچارم بێبەزەییی هەموو دەوروپشتی ئەو شتانە کە لە هونەرا بەلامەوە دواکەوتوو و دزێون ڕوون بکەمەوە، بێگومان هەرکەسێ بۆخۆی ڕێگا و شوێنێکی هەڵبژاردووە کە پاش هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە پێی گەیشتووە و ئەو بیر و بڕوایە کە هەیەتی ئەیکاتە تەرازووی هەڵسەنگاندن و دیاریکردنی بەرجەوەند و نرخی شێوەیەکی هونەری. ئێمە هەزار جارمان کوتووە و دیسانەوە ئەیڵێمەوە کە ئەو هونەرە بێدەربەستانە کە جەنبەی دینامیکی و لالی بزووتن و ژیان و بەرەوپێش بردنی قافڵەی کۆمەڵیان تێدا نییە، بەلامانەوە بێنرخ و بەتاڵن، لامان وایە هونەرێ کە تەنیا فۆرم و قالبێکی مینیاتۆرییە و هیچی تر و چەشنی دەمۆڵی دەنگزلی بێناوەرۆك مێشکی کۆمەڵ دێنێتە ئێش، دژی هونەری ڕاستەقینەن. ئەگەر بێئینسافی نەکەن ئێمە لە سەرەتای پەیدابوونی هونەرەوە پێداهاتووین و بە چەشنێکی گشتی ئەم باسەمان شیکردۆتەوە کە هونەر چۆن پەیدا بووە و بەڵگەی بەنرخمان لە مێژووی کۆمەڵایەتی بەرەی ئادەمیزاد بەدەستەوە داوە و هەروەهاش قسەی مامۆستایانی هونەر و کۆمەڵناسیمان کردۆتە شاهیدی میال. هەڵبەت لەپێش هەموو شتێکا تایبەتییەکانی شێوەیەکی وێژەییمان هەڵداوە و تا ئەو جێگایە لە وزەی دەسکورتی زانست و ماوەماندا بووبێ هەوڵمان داوە هۆی گەشانەوە و پەرەگرتن و کزبوون و لەناوچوونی شێوەکە لەباری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە دیاری

کەین. وەك ئەزانی، ئەگەر دیسانەوە بە تەوازوع و خۆبەکەمزانییەوە نەفەرمووی نازانم، هونەر و هەموو کاروبارێکی تری کۆمەڵایەتی وەك لیزگەی زنجیر بە یەکەوە بەستراون و هەموویان تەئسیری موتەقابیل و کاری دوولایەنیان لە سەر یەك هەیە.

هەڵبەت من بە پێچەوانەی «برتراندراسل» لام وا نیە ئەگەر لووتی «کلئۆپاترا» کەمێك کورتتر بوایە، جیهان ئەمڕۆ بە قۆناخێکی ترا تێئەپەڕی، چونکە نەخش و تەئسیری تاك هەروەك «پلێخانۆف» بە کەم ئەزانم لەسەر ناچاری مێژوویی و لەسەر کاری کۆمەڵایەتی؛ بەڵام ئەمەی کە ئەمڕۆ ئێمە قسەی لێئەکەین هونەرە و هونەر کاری تاکی نیە. راستە کە تاك ئەیخولقێنێ، بەڵام کارێکی گشتی و کۆمەڵییە. ئەمەش تایبەتی بێکەم و زیادی کاری کۆمەڵایەتییە کە کار ئەکاتە سەر کۆمەڵ و لە کۆمەڵەوە کاری ئەکرێتە سەر. بەم چەشنە دەرئەکەوێ ماشەرەبەنی وەها ئاڵۆز کە هەر سەرەی بە شوێنێکەوە بەستراوە، دۆزینەوەی جەمسەری کارێکی دژوارە و من کە خۆم لەگەڵ ئەو پشێوە و ئاڵۆزییە وا خەریك ئەکەم، هەڵبەت هەروەك یەکێك لە ئێوە مافی ئەومم هەیە کە شێوەیەکم بە لاوە پێباش بێ.

کاکی من بێگومان تۆ ئەوەت بەگوێ گەیشتووە کە ئەڵێن نووسەر پێویست نییە بتوانێ ئاکام لە نووسراوەکەی خۆی وەربگرێ، ئەو راسپێری هەر ئەمەیە کە باش و خراپ روون بکاتەوە. بە لای منەوە نووسەر و هەموو هونەرمەندێکی تر لەپێش هەموو شتێکا ئادەمیزادێکە کە هەموو تایبەتییەکی ئەندامانی تری کۆمەڵی تێدایە و هەر روونکردنەوە و دەرخستنی باش و خراپ خۆی چەشنە ئاکاموەرگرتنێکە. ئەوەی کە ئەڵێن ئاکام وەرنەگرێ مەبەست ئەمەیە کە نووسراوەکەی نەکاتە مەیدانی شیمار و رمبەرمب، دەنا ئەوەی کە «داستایوسکی» ئەنووسێ پەیکەرەی سی ساڵ چەوسانەوە لە بەرامبەر دەرەبەگی بەرچاو بە چلچرا روونەوە راوەستابوو، مەبەستی کابرای فەلایە؛ خۆی لە توانێ هاندەرانەترین ئاکام بێ. دیارە کە داستایوسکی لایەنی فەلای چەوساوەی گرتووە و بە سیحری وشە هەژاری و زۆرلێکراوی ئەوی لە بەرامبەر

دەربەگی تێروتەسەل و زۆردار دەربڕیوە.

ئادەمیزاد ئەویش کەسێك کە کاری هونەری ئەکا، چ نووسین بێ، چ شیعر، چ نەقاشی، چ پەیکەرسازی و ئەو کەسانە کە رەخنەگر و هەڵسەنگێنەری شوێنەواری هونەرین، وەك هەموو کەسێکی تر خاوەنی هەستی خۆش‌ویستن و ناخۆش‌ویستنن و ناتوانن کەنار بن لە کێشەری ویست و ئاواتیان. جگە لەمانە تکایە «کاك مراد» ئادەمیزادێکی لایەن‌نەگرم نیشان بدا و بەواتەی کوردی سەرم بشکێنێ.

بەڵام ئەوەی کە من لە هونەرا خەریکی دروست‌کردنی چێشکەی ئیستاندارد و یەك‌چەشنم. برای خۆشەویست وای دائەنێن کە بڕوای من لە هونەرا بڕوایەکی باش بێ، جا لەو حاڵەدا لاوەکانمان زیانێك نابینین لە شوێن‌گرتنی بڕوای من و ئەگەر دروست نەبێ لە سەر ئێوەو هەڤاڵانی تری وەك ئێوەیە کە هەڵەکانم راست بکەنەوە تا گوێگرەکان تووشی هەڵە نەبن. ئەمانە لە کاتێکدا ئەگونجێ کە من کارەکەم کاری هونەری رووت بێ. من لەم بەرنامەیەدا زیاتری کارم لەسەر نەقد و هەڵسەنگاندن ساغ بوەتەوە و ئەگەر لاوێك بڕوای منی بە لاوە دروست بێ، ئەمە ئیتر دروست‌کردنی چەشکەی ئیستاندارد نییە. خۆتان ئەزانن کە من ئامادەم بۆ بیستن و وەرگرتنی ئینتقاد و بەئاوات ئەخوازم گوێگرانی بەڕێز هەموویان چەشنی ئێوە گوێ بگرن بۆ بەرنامەکە و ئەگەر تووشی هەڵەیەك هاتن کە بێگومان بیری ورد و ناوەزی بەکار و چەشکەی پاراوتان زۆر لە بەرنامەکەدا تووش دێ، بۆمی بنووسن و منەتبارم کەن. ئەوا ئێوە و ئەوەش بەرنامەکە، دەیجا فەرموون بەخێر هاتن.

تا حەوتەی داهاتوو بەخواتان ئەسپێرم. شەوتان باش.

# یەکەم و دووهەم قۆناغی ئەسری کوردی

سەلامێکی گەرموگوڕو پڕبەدڵ پێشکەش بە گوێگری هۆگری هونەر و بیستیاری هەستیاری بەرنامەی تاپۆ.

بڕێ لە گوێگرە بەڕێزەکان پرسیاریان کردووە کە بۆچ لە بەشی وێژەیی ئێران و کوردەواری و بەگشتی لە وێژەی ڕۆژهەڵاتا هەر باسی شێعر هەیە و لە بەرنامەکەتاندا ناوێك لە ئەسر نابەن. ئەو گوێگرە بەڕێزانە پێیان خۆش بووە بزانن کە ئەسر لە کوردەواریدا چ بارێکی هەبووە و هەیە.

بەڵێ ئەمە ڕاستە کە لە شەرقا زیاتر باوی شێعر و وتەی ڕێك و ئاهەنگدار بووە تا ئەسر و ئەم باسە چەن هۆی هەیە کە ئێمە لامان وایە لە بەرنامە پێشووەکاندا باسمان کردبێ، بەڵام وەڵامی پرسیارەکە:

پەخشان یا ئەسر لە ئەدەبی کوردیدا لکێکی ساوایە، لەبەر ئەمە سەردەمانی پێشوو باری تایبەتی ژیانی کورد نیازێکی زۆری پێی نەبووە.

ئەزانین کە ژیانی کورد بە دوو قۆناخی ئابووریدا تێپەڕیوە: یەکیان ئابووری خێڵاتی و عێلاتی کە بە ئاژەڵداری و بەخێوکردنی ماڵاتەوە بەستراوە، دووهەمیان ئابووری فیۆدالی یا دەرەبەگی نیشتەجێ کە لە سەر زەویوزار دامەزراوە و هیچکام لەو دوو ژیانە ئابووریانە نیازیان بە ئەسر نەبووە، چونکە نە واقعەنووسین نە شیکردنەوەی بە وردی ژیان بە چەشنی ئەسر پێویست نەبووە و لەگەڵ گیانی ئابووریەکە نەهاتۆتەوە، تا کاتێ کە شارنشینی و لانیکەم ئابووری سەوداگەری و بازرگانی لە شار پەرە ئەگرێ. بە پێی ئەو پەرەگرتنە گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردیش پەیدا ئەبن و نیاز بە نووسینی ئەسر لە ئەدەبی کوردیا خۆی ئەنوێنێ.

ئەم نیازە و هەروەهاش پەیدابوونی ئەسر بە ناوی لکێکی تایبەت لە وێژەی کوردیا لە بەرامبەر مێژینەی شیعرەوە ساوا و کەمتەمەنە، لەم تەمەنە کورتەی پەخشانی کوردیشا دوو بەشی جیاواز بەر چاو ئەکەوێ: بەشی هەوەڵ زیاتر تەرخانی ڕاگەیاندنی مەبەستی ڕامیاریە و هێشتا تاشراو و ڕێکوپێك و لێكولووس نەکراوە. ئەسرێکی پڕلە زەنازەنا و ڕەبەرەبە کە زیاتر لە نوتق و خەتابەیەکی ساکار ئەچێ کە جگە لە ڕواڵەتی دەرەوە مانایەکی جوانی لە ناوەڕۆکیا نەشاردۆتەوە؛ بە جۆرێکی تر بڵێم هێشتا ئەسر ڕاسپێری تایبەتی وێژەیی دەس نەکەوتووە و لەگەڵ خەتابە و وتاری هاندەرانەی دروشمداری ڕامیاری جیاوازی نیە، نووسەری لەو کاتەدا شارەزایی و پسپۆری گەرەك نیە، هەرکەس خاوەنی ـ هەرچەند کەم و کەمقووڵایی و بێ تێبینی ـ دەس ئەداتە پێنووس و ڕووپەڕەی ڕۆژنامەیەك ڕەش ئەکاتەوە. گاهێ نووسەر ماوە بە خۆی کە مەبەستی تەواو شەخسی وەك سکاڵالە دەس خزمێکی خۆی یا گلە لە کابرایەکی ئاپۆرەی نەناسراو لە ڕۆژنامەدا بنووسێ. ئەسری ئەوکاتە پڕە لە مەبەستی ئەفسانەیی و مێتافیزیکی کە مەزهەب و ڕەوشتی کۆنی ئەفسانەیی ئەخاتە ڕوو، وەك خەودیتن و ئاوات خواستن، ئەڵێی هەموو کەس لە دەروونیا دەریایەکە کە سەرڕێژ ئەکا و پەلەیەتی لە نووکی پلووسکی پێنووسەوە بیرێژێتە سەر کاغەز.

دوایی ئەم بەشە کەمێك باشترە، ئەگەرچی هێشتا ئەسرنووسین هەروەك منالێك کە خەریکی پێگرتنە، هەڵدەستێ و دەکەوێتەوە، بەڵام فێربوونی زمانی بێگانە و کرانەوەی روانگەی هەراوی وێژەی بێگانە بەتایبەت رۆژاوا ماوە ئەدا کە وەرگێڕانەوەی شوێنەوارە لاوەییەکان باو بێ، وەرگێڕاوەکان ناوەرۆکێکی پتەو و بەکەڵکیان هەیە، بەڵام لەبەر نەبوونی دەسەڵاتی وەرگێڕەکان، وشە هێشتا ناقوڵا و نەسازاوە؛ باشە ئەمە بڵێم کە لەوکاتەدا مەیدانی نووسراو هەر سەر لاپەڕەی گۆڤارەکانە و داستانێ لە زمانی بێگانەوە ئەبێ تەرجەمە بکرێ کە لە لاپەڕەی تەنگ و تەسکی گۆڤارا بگونجێ، بەم چەشنە زیاتری تەرجەمەکان داستانی کورت و نۆوێلن. ئەسری تەحقیقی لەبارەی هۆز و رەگەزی کوردەوە و هەروەهاش وەرگێڕانەوەی شوێنەواری کوردناس و ئۆریانتالیستەکانیش بەرهەمی ئەو کاتەیە. کارم بەسەر ئەمەوە نییە کە زۆر جار بڕوای سەیر و شیاوی پێکەنین لەم نووسراوانە دەرئەکەوێ، یەکێك ساسانی بە کورد ئەداتە قەڵەم و کەسێکی تر کەیانی بە کورد ئەزانێ و سێهەمی پارتەکان ئەباتەوە سەر رەگەزی مادی؛ بێ ئەوە شارەزای دێرینەناسی و عیلمی تاریخ بن، ئەبینین کە تەنانەت لە مەبەستی تەحقیقیشا هەستی بە لەز و خورۆشانی گەلی کار ئەکا.

لە بەرنامەیەکی ترا لەسەر ئەم مەبەستە ئەڕۆین و ئەگەینە قۆناخی سێهەم کە لە راستیا قۆناخی دوایی و ئەمڕۆیی ئەسری کوردییە.

تا حەوتەی داهاتوو خواتان لەگەڵ.

# دوایین قۆناغی ئەسری کوردی

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرستی بەرنامەی تاپۆ.

لە بەرنامەی پێشوودا باسی ئەسری کوردیمان کرد و قۆناغی هەوەڵ و دووهەمی ئەسری کوردیمان هەڵدا و بەڵێنمان دا کە ئەمجار باسی ئەسری ویژەیی بکەین کە دوایین قۆناغی پەخشانی کوردییە.

لە سەرەتای مەرحەلەی سێهەما، ئەسری کوردی ئەکەوێتە سەر بارێکی تر و خۆی لە دەس هەراهەرای بێسوود و بێکاکڵ رزگار ئەکات. ئەو نووسەرانە کە خەشی دڵیان رشتووە و جانتایان هیچی تێدا نەماوە، ماڵاوایی لەگەڵ پێنووس ئەکەن و روو ئەکەنە هەرنمێکی تر. نووسەرێتی ئەبێتە بەهرەیەك کە هی هەموو کەس نییە. هەروەك شاعیری، نووسەرێتی ویژەیی لە نووسەرێتی تەحقیقی جیا ئەبێتەوە، واتە لێکۆڵینەوەی زانستی ئەدرێتە زانایان و ویژەی رووت ئەگەڕێتەوە بۆ لای هونەرمەندان و عاتفەداران، دیسانەوە هەر چەن شێعر ـ لێرەدا ئەسر و شێعر ـ واتە پەخشان و وتاری

ئاهەنگدار و هەڵبەست لەیەك نزیك ئەبنەوە، هەردووك ڕاسپێریداری شیکردنەوەی بەر و پشتی ژیانی کۆمەڵایەتین؛ هەرکام بە ڕواڵەتی تایبەتییانەوە، بەڵام هێشتا پەخشان ڕێگای ڕیئالیسمی بە تەواوی نەدۆزیوەتەوە.

ئەمە سەرەتای قۆناخی سێهەمە و لە ئەنجامی ئەم قۆناخەدا دیسانەوە گۆڕانێکی بەرموباشی دێتە پێش.

نووسەرانی کوردی ئێرانی هەوڵ ئەدەن ڕێبازێك کە نووسەری کوردی عێراقی پیاسەی بەسەرا کردووە، بێگرێ‌وگۆڵتر کەن و ناوەرۆکێك کە لە عێراقا پێکهاتووە پتەوتر و بەهێزتر کەن و نەك هەر لە باری ناوەرۆکەوە، بەڵکو لە ڕوانگەی دیوی دەرەوە واتە لەباری قالب و «فۆرم»یشەوە بیرازێننەوە؛ هەروەك شێعری نوێ لە عێراقا بە ماموستا گۆران دەس پێئەکا و لە ئێران بەرز ئەکرێتەوە و شوێن ئەگیرێ، هەروەهاش پەخشانی کوردی لە ئێران گاهێ شانلەشانی شوێنەوارە بەرزە ڕیئالیستەکانی جیهان ئەدا، هەڵبەت لەبیرمان نەچێ کە وزە و ئیمکان و بۆلوان بۆ نووسەر زۆر شەرتە. بەداخەوە گاهێ لە ئێرانیش پەخشان کەمێ ئەکەوێتە ناو تەموومژی سووررێئالیسم و سەمبولیسمەوە و لە هەرێمی فام و تێگەیشتنی خەڵکی ئاسایی دوور ئەکەوێتەوە. هەرچی بێ ئەمە ڕەخنەیەکە لە سەر نووسین، لەگەڵ ئەوەشا ئەزانین سەمبولیسم پێتەویستێکی کۆمەڵایەتییە و ئەمڕۆ لانی کەم ناکرێ نەبێ؛ ئەم خۆشاردنەوەی «بووکی مانا»یە لەناو تارای وشە و لەتوێی «حەریری تەعبیر»دا بۆ شێعریش هەر هەیە. ڕەنگە هەندێ بپرسن کە ئاخۆ ئەگەر پەخشانێك زۆر ساکار و بێگرێ‌وگۆڵ نووسرابێ، یا پارچە شێعرێك کە ئیماژ و ئیستعارەی تێدا نەبێ جیاوازی چییە لەگەڵ وتاری ئاسایی و ڕۆژانە؟

من لام وایە کە ڕاستەقینەی دەرەوە هەر وەك هەن پاش ئەوە لە دەروون و هەستی هونەرمەندا جێگر بوون دەرئەخرێنەوە. عاتفە ڕەنگی تایبەتی خۆی لە ڕاستەقینە و ڕووداوی ناو کۆمەڵ ئەدا. پێوەندێکی زەریف و نادیاری لەنێوان ڕووداوەکانا دروست

ئەكا. دوێنێ و ئەمڕۆ و بەیانی بە یەکەوە ئەلکێنێ و ناکامیان بە چەشنی هونەرەکەی جیا چ نووسینی ئەسری، چ شێعری و چ بەشەکانی تری هونەری پێ دەرئەخا و ئەزانین کە بۆ ئەم دەرخستە ورد و عاستەمە زمان و وشە و لێکدانەوەیەکی وردیش پێویستە کە ناچارە بەرزتر بێ لە ڕیزی ئاسایی، بەڵام داپۆشراوی و تەعقید و ئیماژ و ئیستمارەی دوور لە دەسکەوتی دەسکورتی خەڵکی گەرەك و کۆڵان نابێ ئەوەندە زۆر بێ کە بە تەواوی هونەرەکە بکاتە شتێکی مینیاتۆری و ڕواڵەت جوان، بەڵام بێ‌کەڵك و سوودی کۆمەڵایەتی.

ئێستە تکایە گوێ بگرن بۆ پارچە پەخشانێك کە لە سەرەتای نۆوێلێك وەرگیراوە و شوێنەواری نووسەرێکی نەناسراوی ئێرانییە.

هەتاوی ڕۆژپەڕی پاییز ئەڵێی بزەی نابەدڵی ماڵئاوایییە. خوایە ئەمڕۆ چەن زوو تێپەڕی؛ دیسانەوە شەو، دیسانەوە یاوی گەرمی ئەم مناڵە بێگوناهە. عەزیز لە بەربەرۆچکی مزگەوت هەستا، خۆی تەکاند و کەمێ چاوی گێڕا کە خواحافیزی بکا و بەرەو ماڵ بێتەوە. کەسی نەدی، پێکەنینێك وەك بزەی نابەدڵی هەتاوی ڕۆژپەڕی پاییز کەوتە سەر لێوی... «وا دیارە من لە مێژە سەرم بەرداوەتەوە و خەریکی بیرکردنەوەم، هەموو ڕۆیشتوون و من بە تەنیا ماومەتەوە.» هاتەوە بیری کە هەمیشە تەنیا بووە، کەس نییە هەواڵی تێشکاو بێ. ڕاستی هەژار بۆ مردن باشە؟! سەری هەڵێنا لەسەر ئاسۆ چاوی بە داری وشکی چاك کەوت، بایەکی نەرم پەڕۆی شینی دارەکەی ئەشەکاندەوە. ئەو پەڕۆیە خۆی دوێنێ لە دارەکەی هاڵاندبوو، ئەیزانی هیچ ناکا، بەڵام باش بوو بۆڵەی لە خێزانی ئەبڕی.

ــ «تۆ هیچ ناکەی، نابزووێیەوە. هیوا لەشی وەك پزلوو ئەگرێ، تۆش هەر دەستەونەژنۆ دانیشتووی. ئاخر نووشتەیەك، شەخس و پیرێك.»

ــ «کچێ ئافرەت ئەخۆش چی داوە بە سەر نووشتە و دۆعاوە؟! هیوا سەرمای

بووە، هەموو گیانی رووتە، ئەبێ بیبەینە لای دوکتور.»

کاتێ پیرەکەی بەم جێگایە گەیشت پێکەنین گرتی: «کام دوکتور؟ بە کام دراو؟!» هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا، وەك بیەوێ لەدەس ئەم پیرە ئاڵۆزانە راکا، هەنگاوی هەڵبڕی بەرەو ماڵ.

ـ «هێوا چۆنە، ئافرەت؟»

زۆر بۆوەڵامەکەی ماتڵ نەبوو. لە بەیانییەوە چوبووە دەرەوە کە پارەیەك پەیدا کا، بەڵام هیچی بۆنەکرابوو. چووە سەر سەری هێوا. لێفەیەکی شڕی بەسەرا درابوو، هەڵیداوە. ئارەق زەنگۆڵ زەنگۆڵ لەسەر گۆنای گەرمی هەڵنیشتبوو، هەناسەی باشتر ئەهات و ئەچوو.

خێزانی پرسی:

ـ «کارێکت بۆ کرا؟»

عەزیز سەری بەرداوە و بە ئەسپایی گوتی:

ـ «نە، ئەمرۆ گزیری ئاغا هاتە دەرکی مزگەوت و دەنگی دام بۆ بێگار، بەیانی جۆماڵە.»

خێزانی بە ناڵینەوە گوتی:

ـ «خوا هەڵینەگرێ»

عەزیز وەك کەسێك لەبەرخۆیەوە قسە بکا گوتی:

«ئەمە راسپێری سەرشانی خۆمانە!»

تا حەوتەی داهاتوو بە خواتان ئەسپێرین، شەوتان باش.

# وەڵامی گوێگرێکی خۆشەویست

سەلام لە گوێگری بەڕێز و هونەرپارێزی بەرنامەی تاپۆ.

کاك ڕەحیمی بەهرامزادە لە بۆکانەوە نامەیەکی بۆ نووسیوین و پاش ئەوە کە نزای بۆ سەرکەوتنمان کردووە لە خزمەتی گەلا، چەن ڕەخنەیەکی لێ گرتووین و ئێمە لەم بەرنامەیەدا وەڵامی ئەدەینەوە. کاك ڕەحیم وا دیارە گەنجێکی بەشۆر و هونەرناسە و دەمێکەوێ بەرنامەی تاپۆی چەن حەوتە بەر لە ئێستەی گوێ لێ بووە کە لەودا کوتبوومان نابێ ماوە بدرێ ئەو شتە نزمانە کە ئەمڕۆ بە ناوی گۆرانی کوردی لەناو خەڵکا باوە پەرە بگرێ. لە نامەکەیا نووسیویە کە ئێوە خۆتان زۆر کاری وا ئەکەن کە خەیانەتە بە هونەری کوردی. کاك ڕەحیم مەبەستی ئێمەی کاربەدەستی رادیۆی کوردی بووە و نووسیویە کاتێ کە شێعرێکی کوردی ئەخوێندرێتەوە، پێتەویستی چییە کە لە ناوی هونەرمەندێکی کە کورد نییە لە مووسیقای ئەوان لەگەڵ شێعرە کوردییەکەدا کەڵك وەربگیرێ. ئەمە ڕەخنەی یەکەمیەتی. ڕەخنەی دووهەمی ئەمەیە کە بۆچ ئێمە هەر باسی

هونەرمەندانی رابوردوو ئەکەین و لانی هونەرمەندانی گەنج و ئەمڕۆییمان بەرداوە. ئەو گوێگرە هوشیارەمان نووسیویەتی کە بەڵێ باسی خزمەت و تێکۆشانی رابوردووان بەکەڵکە، بەڵام ئەبێ بۆ گەنجەکانیش کە تامەزرۆی هونەرن هەنگاوێك بنرێ و رێنوێنی بکرێن و هان بدرێن. رەخنەی سێهەمی ئەمەیە کە بۆچی بەستە فارسی و تورکییەکان وەرئەگێڕنەوە بە کوردی؟ ئەمانە ئەبنە مایەی لەناوچوونی رەسەنی ئاهەنگی کوردی. دانەری ئاهەنگ کە لە خەڵکی کورد دوورە و لەناویاندا نەژیاوە و ئاگای لە چلۆنیەتی ئاهەنگە بەرووەکان نییە، کاتێ کە پێی ئەکوترێ ئاهەنگێکی کوردی بۆ بڵاوبوونەوە لەسەر رادیۆ دابنێ، ناچار پەنا ئەبا بۆ ئەو ئاهەنگانە کە یا تورکین، یا فارسی و خۆی لە دانانی ئاهەنگێکی تازە رزگار ئەکا. پاشان ئەو ئاهەنگە کە بێگومان پڕ بە پێستی چێشکە و هەستی کورد نییە، شێعرێکی بێ تام و بۆنی کوردی ئەخرێتە سەر کە تەنانەت شێعرەکەش پێناسی کوردی نیە. جا بیری لێ بکەنەوە کە لەم ناوەدا تەنیا وشەی ئاهەنگەکە کوردییە، نە گیانی شێعرەکان، نە هەناوی ئاهەنگەکە کوردی نین. کاك رەحیم پاشان پرسیار ئەکا ئاخۆ ئەم کارەی ئێوە باشترە لە کاری گۆرانیبێژێکی کەمزان کە وشەی نزمی دوور لە خوو و رەوشتی جوانی بەسەر زمانا دێ و بە واتەی نووسەری تاپۆ ئەڵێ: «دایکی حەوت کوڕی پێت دەکەم حاشا»؟!

برای گەنج و هێژامان کاك رەحیمی بەهرامزادە!

ئێمە هەرگیز نەمانکوتووە کە کارمان بێکەموکووڕی و کەمایەتییە. رەنگە زۆر کەمایەتی وا لە کارمانا هەبێ کە گوێگرەکان وەك خۆمان شارەزای نەبن؛ بەهیواین وردەوردە بەسەر ئەو کەمایەتییانەدا زاڵ بین، بەڵام ئەوە کە ئێوە نووسیوتانە باسی هونەرمەندە گەنجەکانیش بکەین، لامان وایە کە ئێمە لە ناساندنی ئەو برا بەهەست و هونەرمەندانەدا، چ مووسیقار، چ شاعیر، چ نووسەر و یا دەنگخۆش کۆتاییمان نەکردووە، مەگەر لە هەبوونی ئەوان ئاگامان نەبووبێ، کە ئەویش تاوانی ئێمە نییە. رەنگە

ئەوە کەمتەرخەمی ئێوە بێ کە ئاگاتان لە بوونی شاعیرێکی گەنج یا هەر هونەرمەندێکی تر هەبێ و بە ئێمەی نەناسێنن. ئێمە لە هەموو بەرنامەیەکدا دووپاتەی ئەکەینەوە کە بە دەستێك چەپڵە لێنادرێ. ئێمە و ئێوە بە یەکەوە ئەتوانین راسپێریمان بە باشی بە رێوە بەرین، چونکە ئێمە ناتوانین و لە وزەماندا نییە هەموو هونەرمەندێك لە هەموو شوێنێك بناسین، کە وەها بوو هەموو گوێگرێك لە سەریەتی کە هونەرمەندانی شار و ئاوایی خۆی بە ئێمە بناسێنێ، شوێنەوار و کاریان بۆ ئێمە بنووسن و بنێرن و ئێمەش راسپێریمانە کە ئەگەر شوێنەوارەکانیان کەڵکی بڵاوکردنەوەی هەبێ بە ناوی خۆیانەوە بڵاویان کەینەوە و کارێك بکەین کە لە هەموو شوێنێك بیناسن، بەڵام یەك شت هەیە کە نابێ لە یاد بکرێ و ئەویش ئەمەیە کە ئێمە کۆڕی نووسەرانمان هەیە و هەر نووسراوێك چ هی نووسەرانی خۆمان بێ و چ لە لایەن گوێگرەکانەوە بێت ئەو کۆڕە بە وردی ئەیخوێنێتەوە و بڕوای لەسەر ئەدا، تەنانەت ئەتوانێ ئەگەر لەنگ و لۆرییەك لە نووسراوەکەدا هەبێ دەستی تێبەرێ و چەوتییەکان راست کاتەوە.

ئێمە زۆرمان پێخۆشە کە پەیوەندێکی پتەومان لەگەڵ ئێوە هەبێ، گەشەی کاری ئێمە بەمەوە بەستراوە کە ئێوە لە کارمان رازی بن؛ هەڵبەت ئەمە کە ئێوە لە سەداسەد رازی بن، نە بۆ ئێمە باشە و نە بۆ ئێوەش ئەلوێ، چونکە لەو حاڵەدا ئیتر ئێمە خۆمان بە راسپێریدار نازانین بۆ بەرەوپێش چوون و باشترکردنی بەرنامەکانمان و ئێوەش هەوڵ نادەن بۆ دۆزینەوەی هەڵەکانی ئێمە و رێنوێنیکردنمان.

با ئەمەش لە دوایی ئەم باسەدا بڵێم کە ئەم بەرنامانە گشتیان بۆ ئێوەن و هی ئێوەن و باشتر بوو کە لە کاتی رەخنەگرتنا ئەمەتان لەبەرچاو بێ کە بەشێك لە بەرزکردنەوەی بەرنامەکە هی ئێوەیە.

کاك حەسەنی رەسوڵی خوێندکاری زانکۆی وێژەی زانسگەی تاران پرسیاری کردووە ئایا بە لای ئێوەوە هونەرمەند هەر بە شاعیر و نووسەر ئەکوترێ؟ ئەگەر لاتان وا

نیە بۆچ باسی گۆرانیبێژێك، نەقاشێك یا مووسیقارێکی کورد ناکەن؟

وەڵامی کاك حەسەن ئەمەیە کە نەخێر هونەرمەند بە لای ئێمەوە هەر تەنیا بە شاعیر و نووسەر ناکوترێ مووسیقار و نەقاش و دەنگخۆشیش هونەرمەندن، بەڵام شاعیر و نووسەر لە ناو کوردا زۆرترن لە مووسیقار و نەقاش و هونەری دەنگخۆشیش لەو چەشنە هونەرانە نیە کە بەرنامەی لەسەر بنووسرێ: هەر ئەوەندە کە دەنگیان لە رادیۆوە بڵاو ئەکرێتەوە خۆی چەشنێك ناساندنە. ئەگەر نەقاش یا مووسیقارێکی کورد هەبێ و بە ئێمەی بناسێنن، زۆر سپاستان ئەکەین.

لێرەدا بەرنامەکەمان دوایی هات؛ تا حەوتەی داهاتوو خواتان لەگەڵ.

۱۳٥۳/۱۰/۱

# جیاوازی نێوان شێوە وێژەییەکانی فارسی

سەلام لە گوێگری بەڕێزی بەرنامەی تاپۆ.

لە لێکۆڵینەوەی وێژەی ئێرانا گەیشتینە ئەم ئاکامە کە جیاوازییەکی بنەڕەتی وا کە لە نێوان شێوە وێژەییەکانی ئورووپادا هەیە لە ناو سەبك و شێوەکانی فارسیدا نییە، واتە شێوەی کلاسیك و ڕۆمانتیك و ڕیئالیك لە بناغەوە جیاوازن و هەرکام ڕاگەیێنەری مەبەستێکی تایبەت و فەلسەفەییێکی سەربەخۆن. لەکاتێکدا لەنێوان سەبکی «خوراسانی» و «عێراقی» و «هیندی» ئێرانا جیاوازی بەم ئاشکراییە بەرچاو ناکەوێ، تەنیا جیاوازییەکی ئەوتۆ کە ئەبێتە هۆی ناسینەوەی شێوەیەك و هەڵاواردنی لە شێوەکانی تر جیاوازی ڕواڵەتییە، واتە دیوی دەرەوەی وتار. ئەم پرسیارە دێتە پێش کە بۆچ وەهایە و چۆنە لە ماوەی کورتی کەمتر لە چوارسەد ساڵا چەن شێوەی تەواو جیاواز کە جیاوازییان لە ناوەرۆك و کاکڵدا بەیەکەوە هەیە، لە ئورووپا پەیدا ئەبن و لە ئێران لە ماوەیەکی هەزارساڵیا واتە لە هەوەڵی پەیدابوونی شێوەی «خوراسانی»یەوە تا دوایی

شێوەی «هیندی» جیاوازیەکی ئەوتۆ ناکەویتە ناو شێوە شیعریەکانەوە؟!

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەبێ بڵێین ئابووری فیئۆدالی گۆڕا بە ئابووری بازرگانی و بە شوێن ئەم گۆڕانەدا شێوەی کلاسیك کە بەرهەمی ئابووری فیئۆدالی و ئاریستۆکراسی بوو، بوو بە شێوەی رۆمانتیك کە نیازی کۆمەڵی سەوداگەری ئورووپا بوو. ئێمە زۆرجار کوتوومانە کە هونەر و زانیاری و خوو و رەوشت و هەموو ئەو شتانە رووکاری ژیانن و لە سەر بناغە و پایەی ئابووری دامەزراون، ئەگەر بناغە برووخێ بێگومان رووکاریش خۆی پێناگیرێ و ناچارە بەرەو نەمان و فەوتان بڕوا. شێوەی رۆمانتیك وردەوردە گۆڕا بە شێوەی ریئالیسم، چونکە ئابووریەکی نوێتر هاتبوو. لانی کەم لەگەڵ وڵاتانی ئورووپا هەر لەسەر ئابووری بازرگانی مانەوە، بەڵام پێشکەوتی سنعەت و تێکنیك و پەیدابوونی چەن تاقیکاری لە ئابووری گشتیا و دەرکەوتنی پێدادی، شێوەی ئابووری بێدەربەستی تاکی بۆرووناکبیران و خاوەن پێتووسانی ئورووپایی روون کردەوە کە هەرێمێکی بۆوێنتر و ئینسانیتر هەیە لە تاك‌پەرستی و بڕوا بە کۆلێکتیف(collective)، چ لە ئابووریا و چ لە هونەرا پەرەی گرت.

مەبەست ئەمەیە کە لە ئورووپا بناغە گۆڕا و بە گۆڕانی بناغەی ئابووری رووکاریش کە هونەر بەشێکیەتی گۆڕا، بەڵام لە ئێرانا بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ ئابووری فیئۆدالی مایەوە، گاهێك بێ‌هێز بوو، بەڵام لەناو نەچوو و توانی هەڵداتەوە، هەروەك لە «چین»یشا وەها بوو و ئابووری دەرەبەگی زیاتر لە دوو هەزار ساڵ بە حەوسەلە و گیان‌سەختیەوە خۆی راگرت، بەڵام ئەمەش خۆی پرسیارێکە و شیاوی وەڵامێکی ترە کە بۆچی لە ئورووپا ئابووری گۆڕا و لە ئێرانا نەگۆڕا. ئەزانین کە هەموو گۆڕانێك لە بەرەنگاری «تێز» و «ئانتی‌تێز» دێتە بەرهەم و هیچ مەبەستێك لەم هەرێمە تێناپەڕێ و ئەم دەسەڵاتی تێز و ئانتی‌تێزە بەسەر هەموو مەبەستێکا رەوایە و لێرەدا پێویستە بزانین چ هۆیەك یارمەتی مانەوەی تێزەکە ئەدا کە ئانتی‌تێز ناتوانێ بە سەریا

زاڵ بێ و «سەنتێر» بێنێتە روو؟ بە چەشنێکی تر چ بارێکی تایبەت دێتە فریای فیئۆدالیسم کە ماوە نادا لە ژێر هێرشی بازرگانیا لەناو بچێ؟

شاڵاوی هۆزە بیابانگەڕە کۆچەرەکان بۆ سەر «بانوو» واتە فەلاتی ئێران، هۆی هەرە گرنگی دواکەوتنی ئابووری ئێرانە. ئەو هێرشانە وڵاتیان شڵەژاند و باری بەرەوپێشکەوتنی ئابووریان تێکدا و ئەوەك تەنیا بوونە هۆی راوەستانی بەلەزی پێشکەوت، بەڵکوو بەرەو پاشیش ئابووریان گێڕاوە.

ئەزانین پاش پەیدابوونی ئایینی ئیسلام جگە لە دوو سێ خانەدانی وەك «ئالی‌زیار» و «ئالی‌بوویە» و «سامانی» هەر ئەمیر و سوڵتانێك کە هات و لە ئێرانا فەرمانڕەوایی کرد تا دامەزرانی «سەفەویە» رەگەز ئێرانی و راهاتووی ژیانی کۆمەڵی ئێران و هۆگری خوو و رەوشتی ئێمە نەبوو، زیاتریان لەو هۆزانە بوون کە بۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات لەوپەڕی «ماوراءالنهر» و لە «تورکستان»ەوە هاتبوون و بە چەمن شەڕو پشێوە دروستکردن توانیان هەرکام حکوومەتێك پێکبهێنن وەك «سەلجووقی» و «غەزنەوی» و «ئاق‌قۆینلوو»؛ هیچکام لەو حکوومەتانە جگە لەوە کە ئێرانی نەبوون ئەوەندەش دەسەڵاتیان پەرەدار نەبوو کە تەواوی ئێران بگرێتەوە و ماوەی حکوومەتی بنەماڵەشیان زۆر نەبوو. هێرشی مەغوولەکان کە گەورەترین بەڵای پێشکەوتنی ئێران بوو لەوەی کە بووش ئابووری زیاتر وەدواخست. ئەو ئەمیر و دەسەڵاتدارانە خۆیان لە پێشا بە مەڕداری و شوانی ئەژیان و ئابوورییەکەیان دواکەوتوو بوو. ئەزانین کە لە سەردەمی ئەشکانیش «اقطاع» و «فیئۆدالیسم» ـ کە خاوەنی ئابوورییەکی پێشکەوتووترە لە ئابووری ئاژەڵداری ـ لە ئێرانا دامەزرابوو، تەنانەت لەدوایی سەردەمی ساسانیا بەرەو بۆرژوازی بازرگانیش چووبوو.

سنعەتکار لە شارەکان پەیدا بوون و بەپێی کتێبە داستانییە ئێرانییەکان بازرگان لە کۆمەڵا رێزێکی زۆری هەبوو؛ رێگای تیجارەتی هاوریشم کە ئوروپای بە

هیندوچین و شەرقی ئێستاوە پێوەند ئەدا بە ئێرانا تێپەڕی؛ لەبەر ئەمە ئابووری ئێران کاتێ بە هۆی فەرمانڕەوایی ئەو هۆزە ماڵاتدار و کۆچەرانەوە ڕەنگی ئابووری شوانی گرت لە ڕاستییا دواکەوتی بەسەرا هات. شارنشینی وەك لە ئوورووپا هەبوو پاش تێکڕووخانی «چاچ» و «سەمەرقەند» و «قەرغانە» و «هەرات» و «ئۆزرگەنج» و «خوجەند» لە ئێرانا پەیدا نەبوو؛ ئەمە هۆیەکی هەرە گەورە بوو کە لە ئاکامیا ئەشرافە فێئۆدالەکان وەك لە ئوورووپا جێ‌گرتوو و بەدەسەڵات بوون، لە ئێرانا نەیانتوانی تەئسیریان لە حکوومەتا هەبێ. هێرش و شەڕو کوشتار هێمنی نەهێشت کە ئەزانین هێمنی بۆ پێشکەوتی ئابووری گەلێك پێویستە.

تا حەوتەی داهاتوو بە خواتان ئەسپێرین. هیوامان بەختەوەری ئێوەیە.

# «گۆران» و «هەژار» کامیان بەرزترن ؟

سەلام لە گوێگری بەهەست و هونەرپەرەستی بەرنامەی تاپۆ.

کەمێك بە بۆنەی کارەکەمەوە و برێکیش لەبەر ئەمە کە مەڤاڵ و ئاشنا و رۆشنای هونەردۆستم زۆرە، دوچاری هەندێ کۆڕی وا ئەبم کە تیا دائەمێنم و گاهێ پرسیاری وەهام لێئەکرێ کە وەڵامەکەی نازانم، یا وا ئەبێ کە لە نێوان شیکردنەوە و لێدوانی مەبەستێکی هونەریا مەبەستی وا دێتە پێشەوە کە لە پێشا بیرم لێنەکردبۆوە. ئەم کۆڕ و ئەنجومەنە بچووك و دۆستانەیە بۆمن جێگای شەوی شێعر و کۆڕی وێژەیی و هەڵسەنگاندنی هونەری ئەگرێتەوە و لام وایە ئەو بڕوایانە کە لەو دانیشتنە گەرم و برایانەدا دەرئەبڕێ، کەڵکی ئەوەی هەبێ کە ئێوەش گوێتان لێ‌بێ و لێی ئاگادار بن. هەڵبەت ئەگەر بڕوایەکی ترتان هەبێ و بەڵگەی باشتان بۆ بڕواکەتان لە دەستدا بێ، ئێمە بڕواکەی ئێوەش بەناوی خۆتانەوە بڵاو ئەکەینەوە. بەم چەشنە رایەڵکەیەکی لەیەك‌گەیشتن و هەڵسەنگاندن لەنێوان ئێمە و ئێوەدا بەدی دێ کە زۆر جێگای کەڵکە و

ئەگونجێ زۆر شت لەم ئاڵوگۆڕی برِوایەدا روون بێتەوە.

شەوێك لە کۆڕێکی بچووکی دۆستانەدا ئەم باسە ویژەییە لە گۆڕێ بوو کە «پلەوپایەی دەسەڵات و سامانی شاعیری «گۆران» و «هەژار» کامیان بەرزتر و زۆرترە؟» بۆ روونبوونەوەی باسەکە لە پێشا باس لەوە کرا کە شاعیر ئەبێ چ ئیمتیازێکی هەبێ بۆ ئەوە بچێتە ریزی شاعیری باشەوە و هەموو پێکهاتین کە شاعیر ئەبێ جگە لە دەسەڵاتێکی مەعنەوی کە «هەوێنی شاعیرانەی دەروونی» ئەتوانین پێ بڵێین، واتە جگە لەوە کە ئەبێ زەوق و لێهاتوویی سروشتی هەبێ بۆ شێعرکوتن، ئەبێ چەند شتی تریشی هەبێ کە برێتین لە شارەزایی بە مێژووی هونەری وڵاتەکەی خۆی و وڵاتانی تری جیهان، بۆ ئەوە کە بتوانێ لە سەرچاوەی هونەری گەلانی تر خۆی تێراو کا. وا باشترە کە زمانێکی زیندووی بێگانە بزانێ، چونکە بەو زمانانە کتێبی زۆر سەبارەت بە هونەر و ویژە نووسراوە کە ئەگونجێ وەرنەگێڕرابێتەوە بۆ زمانەکەی خۆی. تەنانەت ئەگەر شاعیر وەرگێڕراوی دیوانێکی شێعریشی لەبەردەست بێ، ناتوانێ بەهرە لە هەموو ئەو جوانیانە کە لە ئەسڵی کتێبەکەدا هەن وەربگرێ، چونکە هەر زمانێك شتی وەها تایبەتی تێدایە کە بە وەرگێڕاندن لەناو ئەچن. کە وەها بوو شاعیر ئەبێ هەم زەوقی شاعیرانەی هەبێ، هەم لە ویژەی جیهان ئاگادار بێ. هەواڵێك پرسیاری کرد سەبارەت بەم راستەقینە ئەڵێن چی کە بەیتبێژ لەگەڵ ئەوەشا شوێنەواری زۆر گەورەی خوڵقاندووە جگە لە زمانی گەلەکەی خۆی زمانێکی تری نەزانیوە. وەڵام ئەمە بوو لەو کاتەدا ئەکرا شاعیری کورد خۆی بێنیاز بزانێ لە زانیاری و ویژەی گەلانی تر، چونکە ژیانی کورد ساکار بوو. ئابوورییەکی ساکار و کۆمەڵێکی ساکار، بەڵام ئەمڕۆ لەو ساکارییە، نە لە ئابووریدا و نە لە کۆمەڵ و ویستی کۆمەڵایەتیدا نیشانەیەك نەماوە. ژیانی کورد پێچوقەمچی پەیدا کردووە و چارەنووسی تێکەڵ بووە لەگەڵ چارەنووسی جیهان. ئابوورییەکەی گۆڕاوە. شارنشینی و بازرگانی و سنعەت پەرەی سەندووە و شاعیری

کورد ناتوانێ خۆی بپارێزێ لەو هەموو گۆڕانە و ناچارە بۆ ئەمڕۆ و کۆمەڵی ئەمڕۆ شیعر بڵێ.

«هەژار» و «گۆران» هەردووکیان فارسی و عەرەبی و تورکی و کوردی ئەزانن و هەردووکیان زمانێکی ئوروپایی تا رادەیەك کە بتوانن نووسراوی ئەو زمانە بە بێ یارمەتی وەرگێڕ بخوێننەوە شارەزان کە وەها یە لەم بارەوە بەرامبەر دێنەوە، بەڵام ئەگونجێ کە «هەژار» بەسەر زاراوە جۆربەجۆرەکانی کوردییا شارەزاتر بێ، چونکە «کرمانجی ژوور» کە لە ئێران پێی ئەکوترێ «بادینی»، باش ئەزانێ و لە شێعرەکانیا کە بە زاراوەی کرمانجی خواروون، وشەی کرمانجی ژووروو زۆر ئەهێنێ، وەك «بیرکم»، «هەیڤ»، «شەپاڵ»، «چەلەنگ» و زۆر وشەی تر؛ تەنانەت «هەژار» لە شێوەکانی زاراوەی کرمانجی خواروو کە لە ئێران «سۆرانی» پێ ئەڵێن چەشنی «سنەیی»، «موکریانی»، «هەولێری»، بەتایبەت شێوەی «دەشتی دزەیی» و «سلێمانەیی» کەڵك وەرئەگرێ و بەلایەوە زاراو و شێوەکانی کوردی بەیەکەوە جیاوازیان نیە و شاعیری کورد ئەتوانێ لە وشەی هەموویان کەڵك وەربگرێ، ئەم کارە لە شوێنەوارەکانی مامۆستا «گۆران»دا بەرچاو ناکەوێ. جا یا لەبەر کەمدەسەڵاتی بەسەر شێوەکانی کوردییا، یا لەبەر ئەمە کە پێی باش نەبووە لە شێعری سۆرانییا وشەی کرمانجی ژووروو بەکار بێنێ.

کۆڕەکەی ئێمە لەدوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بەم ئاکامە گەیشت کە لە ناو کوردا شاعیرێك کە لە ناسکی زەوق و جوانی تەعبیرا بگاتە «گۆران» زۆر کەمە، بەتایبەت لە پێهەڵگوتن و پەسندی جوانی تەبیعەتا، لەباسی ئەوین و جوانی ئافرەتا کەس ناگا بە «گۆران». هەڵبەت ئەوە کە ئەڵێین لەم رێبازەدا گۆران رێبواری تاقانە و چالاکە، مەبەستمان ئەمە نیە کە لە رێبازەکانی ترا دواکەوتووە. شێعری بەرزی «جیلوەی شانۆ» یا «تاقەستارە» یا «دەروێش عەبدوڵڵا» یا «بۆ هاوڕێم بێکەس» لەو شێعرە بێوێنانەن کە بە راستی سامانی وێژەی کوردی دەوڵەمەندتر کردووە و گوڵزاری

زەوقی شیعرناسانی بەهاراوی کردووە. کێ ئەتوانێ لە چەند دێڕی کورتا باسێکی ڕەوانناسی وەها باریك کە لە پارچە شیعری «تاقەستارە»دا هاتۆتە گۆڕێ بەیان بکا؟

ئەمە سەبارەت بە «گۆران»؛ هەژاریش لە هەرێمی شیعری حەماسیدا بێوێنەیە.

لە ڕۆشنایی ئەم ڕاستەقینانەدا کە باسمان کرد بەم ئاکامە گەیشتین کە «گۆران» شاعیرێکی «لیریك»ە[1] و «هەژار» «ئێپیك»ە[2] و هەرکام لە هەرێمی خۆیانا دەسەڵاتدارن؛ بەڵام کاتێ «هەژار» لا ئەدا بۆ شێوەی «غەنایی»، یا «گۆران» ڕوو ئەکاتە مەڵبەندی «حەماسی»، کەمێك لە بەرزییەکەیان کەم ئەبێتەوە. ڕەنگە «گۆران» لە شیعری حەماسییا کەمدەسەڵاتتر بێ تا «هەژار» لە شیعری غەنائییدا.

شتێکی تریش ئەبێ بکوترێ، ئەویش ئەمەیە کە «هەژار» لە «شێوەی نوێ»دا تەواو کەمدەسەڵاتی خۆی نیشان ئەدا و «گۆران» لەم شێوەدا لەپێش ترە تا شێوەی عەرووزی، بەڵام لە شێوەی عەرووزیشا شیعری گەورەی خوڵقاندووە.

بەهیوای ئەوە کە بڕوای خۆتانمان بە بەڵگەوە بۆ بنووسن. تا حەوتووی داهاتوو خواتان لەگەڵ.

١٣٥٢/١٠/١٥

---

١ - لیریك = غەنایی

٢ - ئێپیك = حەماسی

# تراژیدی سەیدەوان

کۆمەڵ لەسەر ڕێگای ڕاستە و هەرچی لە ناو کۆمەڵەوە هەستێ و باسی خواس و ویستی کۆمەڵ بکا، جوانە؛ چونکە ئەوەی وا بە هەڵە دەچێ تاکە و کۆمەڵ کەم وا هەیە ڕێگای چەوت بگرێتە بەر.

کۆمەڵ بە لای منەوە بەم کەمایەتییە ناڵێن کە سوودێکیان هەیە جیا لە سوودی گشتی و هونەرێکیان هەیە بەپێچەوانەی هونەری کۆمەڵ.

چینی پێکهێتەر، واتە ئەو کەسانە کە زۆربەن و هەمیشە ڕوویان لە ژیانی مرۆڤایەتی و بەرزکردنەوەی پلە و پایەی ژیانی ئینسانییە، بە لێکدانەوەی من کۆمەڵ بەوان ئەکوترێ؛ ئەوانن کە خەمیان وەك تەموومژی سەر چیا وایە و شادییان چەشنی پێکەنینی هەوەڵ زەردەی خۆرەتاوە؛ ئەوانن کە هونەریان نێسك سووك و لەدڵ نزیك و خوێن شیرینە؛ هونەرێك کە بە خشڵی خۆماڵی ڕازاوەتەوە و ڕەنگ و بۆن و تامی بێگانەی پێوە نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا لە هەموو شوێنێك چ لە ناوخۆ و چ لە دەرەوە هەر جوانە،

چونکە مانای بەرزی جوانی ئەو جوانییە یە کە پێوەندی بە هەرێمی بەرپانی جوانەوە هەیە و لەگەڵ باسی خاوەنیی یەك مانان؛ لە هەموو لایەك و بە لای هەموو کەسەوە بەرزە.

ژیانی خێڵاتی هێندێ خوو و رەوشتی تایبەتی خۆی هەیە، کە یەکیان دڵاوایی و بەخشین و ماڵی دنیا بە لاوە کەمبوونە، چونکە لەو چەشنە ژیانەدا ئاسان بژیوی و کەم بەرێچوون هەیە و باری ژیانەکە چەشنێکە کە ئادەمیزاد بەرامبەر بە پاشەکەوت‌کردن و بیر لە بەیانی ژیانکردنەوە بێ‌دەربەست دەبێ. لەبەر ئەوەیە کە کورد سەربەرزی و ئازایەتی و میوانگری زۆرە و بەیتی «سەیدەوان» داستانی ئەم چەشنە ژیانە ئەگێڕێتەوە.

بەداخەوەم کە وێژەی ئێمە لە ناو گەلانی جیهاندا بڵاو نەبۆتەوە، دەنا خوا عالم کە بەیتی «سەیدەوان» زۆر لە «هاملێت»ی «شکسپیر» بەرزترە. شکسپیر لای وایە «هەبوون» یا «نەبوون»، مەبەست یەکێ لەو دوانەن؛ بەیتبێژی «سەیدەوان» ئەڵێ:

«دیلان یا ماتەم.» کامیان مەبەستی ژیانە؟!

قارەمانی شکسپیر «هاملێت»ی باوك‌کوژراوە؛ دایکی خەیانەتکار و مامی پیاوکوژ بوونە هۆی پەژارەی «هاملێت»؛ بەڵام لە بەیتی «سەیدەوان»دا باوکێك سێ کوری گەنجی ئەمرن، کە یەکێك بە دەسی باوکەکە ئەکوژرێ.

خەمی «هاملێت» بە ئەندازەی پەژارەی «عەبدولعەزیز»ی رۆڵەکوژراو گران نیە.

جا با بچینەوە سەر داستانی «سەیدەوان».

«رەبی خودایە ئەتو هەوری رەحمەتێ بێنی لە لای قیبلەی موبارەك.
لە داوێنی فەرەنگیان. لەسەر قەبری پیر خدری هەڵبرێژی.
کێ دیویەتی لە سەر سێ کوڕان‌ڕا بووك بچنەوە ماڵی بابیان بە کیژی؟»

«عەبدولعەزیز»ی داستی، سێ کوڕی ئەبێ بە ناوی «سەیدەوان» و «نێچیروان» و «مەلکەوان». سێ کوڕی گەنج کە کاتی ژنهێنانیانە و سێ بووکیان بە رۆژێك بۆ دێنن. عەشیرەتی داستی هەموو لە شایی و زەماوەندا بەشدارن، «مەلکەوان» شەوی هەوەڵ

«پەردووگیر» ئەبێ و ئەمرێ و خەفەتێکی گەورە ئەخاتە سەر دڵی باوکی، بەڵام «عەبدولعەزیز» کوردە، سەرۆکی خێڵی «داسنی»یانە، چۆن رووی هەیە بە عەشیرەتەکەی بڵێ:

«دەستی دیلان بەردەن و بڵاوەی کەن!»

راستە کە کورمردن پشتشکێن و برستبڕە، بەڵام ئەی سەرۆکی چی؟ ئەی پیاوەتی و میوانخۆشەویستی چی لێ بکا؟ «عەبدولعەزیز» دەنگ ناکا و هەڵپەرکێ و زەماوەند هەر دەمێنێ. تا شەوی دووهەم دەشتەوانان هەواڵی دەدەنێ کە «نێچیروان» لە رەوەز، رەوەزی تووش و چڕە هەڵدێراوە و مردووە. دیسانەوە باوکی کۆسکەوتوو بریندی ئەکولێتەوە و خەم بە هەموو گرانییەکەوە ئەکەوێتە سەر دڵی و بیر ئەکاتەوە دوو کوری جوانەمەرگ بوون، ئەم زەماوەندە شوومە، ئەم بەهارە بێ فەڕە، بێفەڕو دزێوە، چی بکا؟

ئایا لەگەڵ ئەوەشا کە تەرمی دوو کوری لە بەر دەستییەتی، زەماوەند هەر بمێنێ؟ ئەگەر بە داسنیان بڵێ: من زەماوەند ناگێڕم و ئێوە هەڵپەرکێ بوەستێنن، چی پێ ئەڵێن؟!

ئاخۆ نالێن: «عەبدولعەزیز، پیرە، خەرفاوە و پیاوێکی ناخرشەڕە؟»

ئەمانە ژێردەستی خۆی؛ بێ جیاوازی کوڕە داسنی کوری ئەون و هەموو ئەورۆ لە شادی ئەوا بەشدارن. میوانن، گەڕی هەڵپەرکێ گەرمە، کیژ و کوری داسنی خەریکی «رۆینە» و «سوێچکەیی» و «چۆپی» و «سێجارە»ن. ئاخۆ بچێتە ناویان و بە پرمەی گریانەوە بڵێ: «ئەی کوڕو کیژی داسنی دیلانەکەتان بەردەن، لەباتی شایی، شین بگێڕن، «مەلکەوان» و «نێچیروان» مردن و ئێوە بۆ دوو زاوای ئەماو شایی ئەکەن!؟»

بەڵام نا، عەبدولعەزیز کوردە، ئەوانەش میوانن. رەوا نییە زەماوەندەکەیان بشێوێ. ئەی دڵی پەژارەداری چی لێ بکا؟ ئەم هەموو خەم و دەردە بۆ کوێ بەرێ؟

وا باشە لە ئاوایی دەرکەوێ، پەنا بەرێتە بەر داوێنی چیا، خەفەتی بدا بە دەم

شەماڵی سەرشێتی شیو و دۆڵا. با لە هەرای هەڵپەرکێ رزگار بێ، ئاگری بەجۆشی دەروون ئەیبا، ئەیبا تا ئەو جێگایەوا ڕێبازی مەڕو بزنە کێوییە. لەژێر بەردێکا ئارام ئەگرێ، بەڵام دڵی وەك ئاوی سەر ئاگری بەتین ئەجۆشێ و هەڵەچێ. فرمێسکی گەرمی بە سەر گۆنای پڕ چینیا دێتە خوارەوە!

دەوروبەری بەهارە، بەڵام چ بەهارێك، بەهارێکی رەش و ناحەز، ناحەزتر لە هەموو زستانێك.

چاوی تیژی وەك هەڵۆی پیری چیا ئەڕوانێتە ئەوبەری دۆڵەکە! بەهانەی لە ماڵ دەرکەوتن و کۆڕی زەماوەند جێهێشتنی ئەمەیە، کە دەچێ گۆشتی راوێك بێنێتەوە. لێرەدایە کە تراژێدی دەگاتە ئەوپەڕی خۆی، دەستێکی بەهێز لەکاردایە بۆ پەروەراندنی دڵتەزێنترین بەسەرهات.

دەوروبەر بەهارە، گیا شینە، لاسکی ناسکی گوڵی کێوی بە دەم بای نەرمونیانەوە ئەلەرێتەوە. دڵی باوکێك پڕە لە مەینەت، پەردووی زاوای دوو کوڕی گەنج بەتاڵە، دوو بووك چاوەڕوانە، داسنی لە شایی و خۆشیا نوقم بوون. «عەبدولعەزیز» گاهێ بە دڵیا دێ: ـ «دوانم مردن، دەیەدوانم ماوە! ژیان شاییە یا شینە؟!»

دەنگی گۆرانیبێژ و دەهۆڵ و زوڕنای ناو دێ کە زۆر دوور لە دەرەوە دێتە بەر گوێ، ئەو جارانە وا شەماڵ ئەیهێنێ، ئەڵێ: «ژیان شاییە!» دوان مردن، هەموو دەمرن، چونکە لە هەوەڵەوە نەبوون، هاتن و پاشان رۆیشتن، کە وەهایە ژیان قۆناخێکی کەمخایەن و کورتە لە نێوان دوو نەبوونی درێژ و بێبەستێنا. هەرا و بگرتنێکە لە بەینی دوو بێدەنگی و هەداداندا، کە وەهایە ژیان شاییە و بزنەمانی بێدەنگی ماوە زۆرە، بەڵام دۆڵی کپ و خامۆش کە ئەڵێی گریانێکی بەکوڵی پیاوانەی لە گەروودا بەستراوەتەوە، ئەڵێ: «نا، نا، ژیان ماتەمە، ژیان کۆسکەوتنە، ژیان لە گۆکەوتنی دوو لێوی پڕ بزەیە!»

با، لەوبەری دۆڵەکەوە یاری بە مووی زەردی ریشی بزنەکێوییەك ئەکا و لێکی ئەدا و ئەیهۆنێتەوە و «عەبدولعەزیز» بە چاوێکەوە کە فرمێسکی مەینەتی تێزاوە،

ئەڕوانێتە ئەو مووە زەردانە کە ئەڵێی پرچی «گوڵەبەڕۆژە» یا قژی «گەنمەکابە»یە و با ئەیشەکێنێ. وا ئەزانێ بە ڕاستی مووی ڕیشی بزنە کێوییە. تەقەی تفەنگ هەڵئەستێ، وەك پڕمەی گریانێکی بەکوڵ ئەچێ، نا ئەڵێی قاقای پڕلە تەوسی ئینسانە بە ژیان! شتێکی زیندوو لەپشت بەردێکەوە ئەکەوێتە خوارەوە، وا دیارە پێکراوە. «عەبدولعەزیز» ئەگاتە سەری، ئەبینێ «سەیدەوان»ە، مووی زەرد و خوێنی سوور و دەموچاوی سپی لە سەر گیای سەوز تێکەڵ بوون؛ هەناسە لە سینگی چیادا قەتیس ماوە، کەو لە قاسپە کەوتووە، ڕۆژ خۆی لە ژێر هەورێکی چڵکنا شاردۆتەوە!

«عەبدولعەزیز» چی بۆ ماوەتەوە؟! دانیشێ، چونکە ئەژنۆی هێزی نییە؟ لە پێلمەنگی ئەترسێ و ناشتوانێ بگری، چونکە پەشۆکاوە، هەموو دنیا لەبەر چاوی دەبێتە یەك پرسیار: ژیان شینە یا شایییە؟! خەم لەوە گەورەترە کە لە دڵی پیر و ناسکی «عەبدولعەزیز»دا جێگای ببێتەوە. ئەپاڕێتەوە، لەبەر خوا ئەپاڕێتەوە:

«ڕەبی خودایە بای ڕەحمەتێ بێنی لە لای قیبلەی موبارەك
لە داوێنی فەڕەنگیان. بیدەی لە خەمی «عەبدولعەزیز»ی و
لە بەحری خوێنیەی تێپەڕێنی!»

چەند خەمێکی گەورەیە، خەمی «عەبدولعەزیز»ی داستێ کە دوو کوڕی ئەمرن و یەکێکی بە دەستی خۆی ئەکوژێ؛ لەکاتێکا بەهارە و کاتی بووژانەوە و ژیانە. بەیتێژ چ تراژیدیەکی بەرزی پێکهێناوە، گیانی ئەمری شاد بێ.

# نومایشنامەی سەیدەوان

[دەنگی دەهۆڵ و زورنا، لەدوورەوە، لە مەتندا]

وێژەر:

دەواری ڕەش وەك خاڵی سەر گۆنای کیژێکی جوان لە داوێنی دەشتی سەوزی بەگوڵ خەملیو بۆتە نەخش. بەهار ئەڵێی گیانی ئەوینە ئەهەژێتە ناو هەناوی سروشت. زەردەی خۆرەتاو کراسی خارای کردۆتەبەر چیا بەرزەکان. ڕووباری کەف چەرێن وەك

کەحلاتی تازەگیراو حیلەی دێ و بەرەو نشێو پەل ئەکوتێ. لکی بەرزی هەموو دارێك بە تیشکی خۆر، زەردەی تێراوە و ئەڵێی دار هەموو لەشی بۆتە چاو و ئەڕوانێتە ئەو مەلە ئەویندارانە کە بە جریوەی خۆیان بەستەی بەهار و ژیان بە گوێی گوڵاوی مەندی چاو بە خەوا ئەخوێنن. دەهۆڵکوت و زوڕناژەن لە مەیدانێکا کە بە دەواری رەش دەورە دراوە، خەریکی لێدانی ئاهەنگی «سەحەری»ن. خەوی خۆشی پاش شەکەتی، وەك دڵدارێ کە تازە هاتبێتە جێژوان و بە پەرژینی دەستەملان و داوی لێو لە سەر لێودانان رێگای سڵی و راکردنی لە دڵبەر تەنیبێ، ماوەی نەدەدا دوو پێڵووی چاوی گەنجان دەس لە یەك بەردەن، بەڵام دەنگی نرکەی دەهۆڵ و زوڕنا بە ئاهەنگی دڵبزوێنی «سەحەری» وەك شەپۆلی بۆنی گوڵاڵە خۆی ئەکرد بە دەلاقەی گوێی لاواندا و لەگەڵ خۆیا چەپکێ هەستی سووری دڵدارانەی ئەخستە سەر سینەی دڵ. هەر چاو بوو وەك پەنجەرەی بەرەو خۆر ئەکرایەوە و هەر لاوی تاسەباری هەڵپەرکێ بوو رائەپەڕی و رووی ئەکردە گۆڕەپانی جێگای هەڵپەرکێ و زەماوەند. پاش ماوەیەك دەوار چۆڵ ببوون و مەیدان لەبەر حەشیمەت جمەی دەهات. میر عەزیزی سەرۆکی عێلی داسنی لە خێوەتی سپی خۆیدا کە ئەتگوت تاکە چڵی سپی ناو ریشی رەشە، دانیشتووە. چەن ریش سپی و کەیخودای داسنی لە لای دانیشتوون و چەند نۆکەر دەس لەسەر دەسکی خەنجەر چەشنی پەیکەرەی بەردین، بێدەنگ وەستاون. عەزیزی داسنی روو ئەکاتە ریش سپی و مەزنەپیاوەکان و ئەڵێ:

ـ «ئەمڕۆ ئەڵێی رۆژ بۆیە هەڵاتووە تا لە شادی منا هاوبەش بێ. حەفتا بەهارم بەرێ کردووە، بەڵام بەهاری ئەمساڵ پێش ئەوەی سەری «سپانی» برازێنێتەوە و چیای مەغلۆوبێ بخەملێنێ، لە دڵی منا خێوەتی هەڵداوە. لە دارایی و سامانی جیهان سێ کوڕم هەیە کە ئەمڕۆ زەماوەنی هەرسیانیانە. ئەمە بۆ باوکێکی پیر، نیشانی ئاخربەخێرییە. کوڕە جەحێڵی داسنی هەر وەك لە رۆژانی سەختی شەڕو کوشتارا شان بە شانم

وەستاون لە شایەکەشما بە هاوبەشی پڕ بە دڵیان، دڵمیان گەشاندۆتەوە. هەزار و هەزار بار شوکر خوای مەزن؛ من گەنجی خۆم لەم سێ کوڕەدا بەدی ئەکەم. نێچیروانم کوڕی شەڕو گۆوەند و مەیدانە، مەلکەوانم گەورەی خێڵ و سەپان و شوانە، سەیدەوانم خانی خانان، قسە لە پێشی دەرك و دیوانە.»

[مووسیقای کورت . ورتەورت و پچەی چەند کەسێك]

میر عەزیز [بە حەسرەتەوە]: ـ «نە؛ لە کاری گەورەی خێڵی داسنی ناچن. لێم دەکەن بە پەرۆی شین و بە سەر شانما نەیدوورن. بەیانی لەناو هەموو دەوارێکا لە دیوانان، لە گەرەك و کۆڵانان ئەیکەن بە بەند و بالۆرە و ئەڵێن عەزیز زەماوەندی تێکدا. دڵی گەنجانی داسنی شکان. نە. دەنگ ناکەم. با لە دڵی منا کونەبووی مەرگ بخوێنێ. با لەگەڵ هەر پێیەك کە کوڕی هەڵپەڕکێ بە سەر زەویا ئەدا، بەندێك لە دڵی من پسێ و با خرمانەی خەم لە دەوری سەرم بهاڵێ، بەڵام نەڵێن عەزیز میوانی لە ماڵی خۆی دەرکرد. با نەڵێن جیاوازی دانا لە نێوان کوڕی خۆی و کوڕی عەشیرەتەکەیا. خوایە بریا شوانێك بوایەم و بمتوانیایە پەژارەی مەرگی «مەلکەوان»م لە گەرووی شین‌گێڕی شمشاڵەوە بڕژاندبایەتە ناو دۆڵی چیای سیپان تا ئاگرێکی وەهای تێبەربوایە کە هەتا هەتایە نە چڵەگیایەکی لێ شین بوایە و نە ئاسك و مەڕەکێوی بە هیوای بەفراوی ژێر بەفری چەند ساڵە لێی بیوایەن بە میوان؛ نە قەت جارێکی تر شەنگەبێری و شۆڕەسواری خێڵاتی کوردەواری بیکەن بە جێژوان. بەڵام من مەزنی عێلی داسنیم. شین گێڕانم شوورەییە و دەستی هەڵپەڕکێ‌بەردانم لێ‌ناوەشێتەوە. خودایە سەبرێکم دەوێ و بە ئەندازەی دڵۆپی زریای وان و زێ‌یە بادینان، بە قەدرایی گەڵای داری جەنگەڵی سەردەشت و مەریوان.»

ویژەر:

میر عەزیزە کۆرەی داسنی سێ‌بووکی بە رۆژێك بۆ سێ کوڕی گەنجی هێناوە.

سەرۆکی پیری هێلی داسنی لە هەموو تیرە و خێڵەکانی عەشیرەتەکەی خۆی گیراوەتەوە و کۆڕی زەماوەند و هەڵپەڕکێ گەرمە. خۆشخوان و بەیت بێژ، لاوك و حەیران ئەڵێن. لەم کاتەدا سەیدەوان دێتە ژوورەوە و بە چاو باوکی تێئەگەیەنێ کە کاری پێیەتی. سەیدەوان هەواڵێکی پێیە کە ئەترسێ ئەگەر بۆ باوکی بگێڕێتەوە، داری پیر و بە سێبەری هێلی داسنی، واتە میرعەزیز بە گەردەلوولی ژاراوی هەواڵەکە لە پێ بکەوێ و ریشەی وشك بێ. دڵی باوك لە پەنجەرەی تەمگرتووی چاوی سەیدانەوە لەڕوانێ و هەورێکی رەش بەدی ئەکا. لەبەر خۆیەوە ئەڵێ: «چی بووە سەیدەوان؟!»

زۆر جار هەیە ئادەمیزاد پێی خۆشە بزانێ و ناوێرێ بزانێ. ئەیەوێ دەستی بەو پووشە بێهێزەوە بەلد بێ کە پێی ئەکوترێ هیوا. ئیتر بیر ناکاتەوە، دەریا دەمی شەپۆلی کردۆتەوە بۆ هەڵلووشینی! میر عەزیزی داسنیش ئەیزانی کە کۆسپێکی گەورە یا کۆستێکی کەوتوو ئەم هەموو خەم و تەمەی بارانلۆتە سەر چیمەنی تێراوی تازە شین بووی روخساری سەیدەوان. لە بەر ئەمە تەنیا توانی دیـــانەوە هەر ئەمە دووپاتە بکاتەوە: «چی بووە سەیدەوان؟!»

سەیدەوان و میر عەزیز لە رەشماڵ و خێوەت و دەوار دوور کەوتبوونەوە. دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە لەگەڵ هەرای کوڕە داسنی و هوهەوی سواری تەقڵەباز تێکەڵ ئەبوو. لەبەردەم ئەم باوك و کوڕەش جار جار جوڕەیەك ئەیجریواند و کۆرکۆرەیەك دەرئەپەڕی. ئەتکوت گیانێکی پاکە و پەلەیەتی بۆ گەیشتن بە بەهەشت. چاوی پرسیاری میرعەزیز وەك هەناسەی گەرمی دەشتی گەرمێن؛ لێوی وەك سوورەگوڵی سەیدەوانی شەقارشەقار ئەکرد. بەڵام ئەو دوو لێوە، ئەو دەمە کە هەمیشە هەواڵی هاتنەوەی قاز و قورینگیان دابوو بە میر عەزیز و مژدەی بەهار و ژیانیان هێنابوو، چۆن ئەیانتوانی بە باوکێکی بە هیوا بڵێن ماڵی دڵت کە لە سەر سێ کۆڵەکە راوەستابوو بە ترازانی کۆڵەیەکیان خەریکی رووخانە؟!

سەیدەوان لەپڕ بە سۆزە دەستی کرد بە زەمزەمەی ئاهەنگی «گوڵە جوان» و گەیشتە سەر ئەو بەندە ـ «وەرە ئەمن و تۆ دەستان تێکەڵ کەین/ چونکە مردن داعبایەکی زەرەندەیە/ نە لە کەسمان خۆش دەبێ و نەلە کەسمان دەبوورێ».

سەیدەوان بێدەنگ بوو. دەنگی دەهۆڵ و هەرای ڕەشماڵ و جریوەی مەلی بەهار برا. بۆ کورتەیەك سرووشت مرد، ژیان کاس بوو. میرعەزیز پرسی: «کامەیان؟!»

سەیدەوان گوتی: «مەلکەوان!»

[مووسیقا]

وێژەر:

مەلکەوان پەردەگیر بوو، بەڵام ئەمە دوایین خەمی عەزیزی داستانی نییە. لە بەرنامەیەکی ترا لەسەر ئەم تراژێدیە دراماتیکە ئەڕۆین. خواتان لەگەڵ.

# درێژەی نومایشنامەی سەیدەوان

سەلام لە گوێگری بەڕێز. بێگومان ماوەکەوتنی نێوان دوو یا چەند بەشی داستانێك بە یەك حەوتوو، ئەتوانێ زیانێکی زۆر، بە هێزایی نووسراوەکە لە لایەکەوە و لەلایەکی تریشەوە بە تێگەیشتن و پێخۆشبوونی گوێگر یا خوێنەرەوە بگەیەنێ. من لە ڕیزی ئەو کەسانە نیم کە ئەڵێن وا باشە بۆ ئەوە داستانێك تەئسیری هەبێ، بەتایەت ئەگەر نووسراوەیەك بێ بۆ رادیۆ و تەلەویزیۆن، لە جێگایەکی حەستەم و گرنگا ببڕێتەوە تا گوێگر چاوەڕوانی بەشی دووەمی بکا، چونکە لام وایە نووسراو ئەبێ گیرایی و

کێشەری ئەوەندە هەبێ کە خوێنەرەوە یا گوێگر نەتوانێ دەستی لێ هەڵگرێ و گوێی لێ کلا کات. نەك لەبەر ئەمە کە بزانێ پایانەکەی بە کوێ ئەگا. کەسێ کە لەبەر ئانتریگ و رووداو گوێ لە داستان ئەگرێ و چەشنی نووسینەکەی لا گرنگ نییە، لەباری هەستی هونەرییەوە چەشنی منالێکە کە گوێ لە ئەفسانە و جنۆکە و دێو و پەری ئەگرێ.

پاش ئەم سەرەتایە، لە بەرنامەی پێشوودا کوتمان کە میرعەزیز سەرۆکی هێلی داسنی لە رۆژێکدا سێ کچی بۆ سێ کورەکەی هێنا و تەواوی عەشیرەتی داسنی بانگ کرد بۆ زەماوەند؛ بەڵام چارەنووس شتێکی تری لە ناوچاوانی میرعەزیزی پیر نووسیبوو. ئەبوو لێوی لە جیاتی زەردەی پێکەنین لەرزەی گریان لێی بێتە میوان. مەلکەوان پەردەگیر بوو.

میرعەزیز:

ـ «بەهارە، بەهارە، بەهارێکی سەر بە زستانە

لە لایەکەوە مەیتی مەلکەوان هێزی ئەژنۆ و سۆمای چاوانم لەبەر دەستانە

لەلایەکی دیکەوە سەمایە، هەڵپەرکێیە، جلیت و تەقڵە و دیلانە!

بروانە هەوری دە عاسمانێ، لە من وایە چاوی عەزیزی داسنییە و پڕ لە گریانە

بەڵام ئەگەر بڵێم هۆ خێڵی داسنی دەستی دیلانێ بەردەن

سۆزانییان دە خەمێ گرن

دەڵێن عەزیزە کۆرە پیرێکی ئاخرشەڕە، میوانی دەردەکا لە دەرك و دیوانێ

خودایە ئەگەر عومری نووحم هەبێ

لەگەڵ سەبری ئەیووب، لەگەڵ دەوڵەتی جومجومەسوڵتانێ

قەتم سوکنایی ناگاتە ئەو دڵەی قەڵەندەری بابانوێرانێ.

بەهارە، بەهارە، چەند بەهارێکی لە من شین دەنوێنی.

تۆ خودا گەلی داسنیان کێ دیویەتی لە دەورەتی زەماناندا

لەسەر مەیتی شۆرەسواری رەنج بەخەسار،
لەباتی قورعان و کەلامی،
خۆشخوان و گۆرانیبێژ، ئایشەگوڵ و هەوای سوێسکەیی بخوێنێ؟»
ویژەر:

پیری دڵشکاوی کورمردوو لەگەڵ هەستی خورۆشانی خۆیا شەریەتی؛ هەناوی گڕگرتوو هانی ئەدا بچێتە ناو کۆڕی هەڵپەرکێوە بڵێ: «بەسیەتی! ئێوە لەسەر لەشی ساردەوەبووی لاوێکی رەنجەڕۆ هەڵەپەڕن. بەڵێ! مەلکەوان مرد و دیلان دوایی هات؛ بەڵام هێزێکی تریش لە دەروونیا هەیە بەرەڵگاری وەستاوە و بە تانەوە پێی ئەڵێ: نا پیرەپیاو! تۆ کورێکت مردووە، دوو کوڕی ترت ماون، تۆ کاتێ بووی بە گەورەی داسنیان، لەسەرت نووسرا هەموو لاوانی خێڵەکەت بێ جیاوازی بە کوڕی خۆت بزانی. نە، میر عەزیز! بۆ کارێکی تێپەڕیو شوورەیی مەهێنە سەر خۆت. بە تەنیا باری گرانی ئەو ماتەمە هەڵگرە و لێیان گەڕێ با لاوان لە خۆشی و شادیا نوقم بن.» میرعەزیز کوردە و ئیتر نایەوێ بڵێم سەر بۆ کامە هێزی دەروون دائەنوێنێ. بەڵام زەماوەند هەر وا گەرمە، تەنیا دڵی باوکی پیر و کورێکی تازەی ژێر لووتکەیەکی بەفرین لە سەری سیانێ ئەزانن چ کۆستێکی گەورە کەوتووە.

عەزیزی داسنی ناچارە هەروەك جاران بەدەم میوانەکانیەوە پێبکەنێ. سەر لە خێوەتی پیاوماقووڵان بدا و بچێتە ناو رەشماڵی گەنجانەوە. تەنانەت ناچارە گەڕێك لەگەڵ گەنجەکانا هەڵپەڕێ و شانازی بدا بەو گەنجانە کە پاشان بۆ دەزگیرانەکانی خۆیان بگێڕنەوە بڵێن ئێمە لەگەڵ گەورەی داسنیان لە کۆڕی هەڵپەرکێدا دەستمان گرتووە. تراژێدی لێرەدایە، دڵێکی برینداار ناچارە بە دەستی خاوەنەکەی خوێ بکاتە سەر برینیا. ناچارە، چونکە گەورەی خێڵەکەیەتی. چونکە کوردە و میوانی هەیە؛ بەڵام ئاخۆ هەر بەمە دوایی دێ، یا تەبیعەت نەیەوێ گەورەترین تاقیکاری لەسەر عەزیزی داسنی بکا

بۆ ئەوەی بزانێ ئەم قەڵاڵە پۆڵا دارژراوە کەی تێکەشکێ و کام بەڵا دەستی ئەگاتە ئەو لووتکە بەرزە، کە ناوی توانای ئادەمیزادە؟! [مووسیقای کۆتا] [دەنگی شەو]

میرەەزیز [حاڵەتی دۆعا و پاڕانەوە]:

ـ «ئەی شەو! ئەی قەڵای مێردان! هەمیشە لە لام خۆشەویست بووی. لەکاتێکەوە بە گەنجی دەوارەودەوار لەژێر باڵی رەشتا ئەگەڕام و کێشکی خێڵاتم ئەکێشا، لەوکاتەوە کە تۆ یارمەتیت ئەدام و گرانی خەوت ئەخستە سەر پێڵووی چاوی خاو و خێزانی یارەکەم و من تاریکایی تۆم ئەکرد بە جێژوان. خودایە گەنجی چەند خۆشە و مردنی گەنجان چەند تاڵە؛ بەڵام ئەی شەو! ئێستە من پڕبەدڵ لێت ئەترسم؛ لە ناوچاوانی گرژ و مۆنت لە تاریکی و تەنیاییت ئەترسم. خەو لە چاوم تۆراوە. چاوەڕوانم ئەستێرەی بەیان لەسەر هەوار هەڵێ و دەروازەی بەیانی بکرێتەوە. چەند دوور و درێژ و بێ سنووری ئەی شەوی رەش!»

[دەنگی چەند کەسێك، تێکەڵوپێکەڵ و ورتەورتی ئەسپایی]

شوان:

«داخی گرانم، میرم! کاتێ ئێمە گەیشتین هەناسەی دوایی بوو!»

[مووسیقای توند و بەتەوژم ـ زەربەیی ـ]

میرەەزیز:

«کامەیان؟! نێچیروان یا سەیدەوان؟!» [بە سەرسووڕمانەوە دەیڵێت و دەنگی دەلەرزێ]

شوان:

«نێچیروان گەورەم! لە رەوەزێکی بەرز کەوتۆتە خوارەوە!»

میرەەزیز:

«بیبەن لە پەنا گۆڕی مەلکەوان بینێژن؛ هەواڵ بدەن بە سەیدەوان. منیش هەر

ئێستا نەتانگرمەوە. بەڵام نابێ کەس بەم باسە بزانێ!»

ویژەر:

کوڵەکەیەکی تریش رووخا. ئەستێرەیەکی تریش راخوشی و تواییەوە. بەسەرهات چی لە گیانی عەزیزی داسنی دەوێ؛ لە زەماوەندەوە تا مردن، لە هیواوە تا هومێدبڕان، لە بەهارەوە تا زستان؛ رێگایەکی دوورە، بەڵام تەبیعەت ئەیەوێ لە یەك چاوترووکاندنا میرعەزیزی داسنی بەم هەموو رێگایەدا رابکێشێ؛ چۆن ئەبێ؟!

با بمێنینەوە بۆ بەرنامەیەکی تر. خواتان لەگەڵ.